

# لێکدانەوەو ساغکردنەوەی بەشێک لە دیوانی موخلیس

## - باغی لاوان - بەراوردو لێکۆلینەوە

د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان

هەولێر ٢٠١٠




- **ناوی کتێب:** لێکدانەوەو ساغکردنەوەی بەشێك لە دیوانی موخلیس
- **نووسین:** د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان
- **دەرهێنانی هونەری:** حسێن سەنعان مەتیخان
- **بەرگ:** نەجمەدین بیری
- **چاپی:** یەکەم
- **تیراژ:** (٥٠٠) دانە
- **ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان (٢٤٣٧) لە ساڵی ٢٠١٠**
- **چاپخانەی:** سپیرێز / دهوك

# لێکدانەوەو ساغکردنەوەی
# بەشێك لە دیوانی موخلیس

**- باغی لاوان - بەراوردو لێکۆڵینەوە**

**د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان**

# ناڤەرۆك

# بەناوی خودای دڵسۆز و میهرەبان

# پێشەکی

ماوەیەکی زۆرە بەندی داوی شیعرەکانی (موخلیس)م و هەر لەو ڕۆژەی کە چێژم لە شیعر وەرگرتووە زایەڵەی شیعری (شەنگەبێری) و مولەمەعی (قوببەی سینە) دڵ و دەروونیان پێکاوم. هەر جارێ فەقێیەك یاخود مەلایەك ئەم شیعرانە و شیعرەکانی دیکەی دەگوتەوە، هێندەی دیکە ڕیشەیان لەناخمدا دەچەسپاو لەگەڵ بوونم دەبوونە یەك. بەڵام ئەم چێژە هەر سەرەتایی بوو و بیری ئەوەم نەدەکردەوە کە بیان نووسمەوە بۆ ڕۆژێکی پێویست.

هەر کە لە ساڵی ١٩٧٧ بە مامۆستایی نەقل کرامە گوندی دووسەرەی فەتاح، لەم گوندەدا زیاتر ئاشنایەتیم لەگەڵ (مەلا حەیدەر قارەمان) کە مامۆستای قوتابخانەکە و خەڵکی گوندەکە بوو بەتین بوو. جاروبار هەندێ چوارینەی (موخلیس)ی بۆ دەخوێندمەوە و ئیدی زیاتر خولیای شیعرەکانی بووم .

لەساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ (حەوێزی جوکل ئاغای قۆڕیتان) یەکترمان ناسی و زانیم کەوا دەستی هۆنینەوەی شیعری هەیە و خۆی دانی پێدانا کە شیعرەکانی موخلیس زۆر کاریان تێی کردووە. بۆیە چەند شیعری موخلیسی لابوو هەموویانم نووسیەوە و بوونە هەوێنی ئەم کارەم.

لەساڵی ١٩٨٧ کە لەخوێندنی باڵا وەرگیرام، دوای کۆتایی هێنانی کۆرسەکان، بڕیارم دا کە نامەکەم لەسەر شیعرەکانی موخلیس بێت، بۆ ئەم مەبەستەش زیاتر هەوڵی بەدەستهێنانی شیعرەکانی موخلیسم دا و توانیم پەیوەندی بکەم بە مامۆستا (محمد)ی کوڕی شاعیر و ئەویش بە سوپاسەوە سێ دەفتەری شیعری دامێ کە یەکێکیان بەخەتی (ئەحمەد ڕەشوانی) بوو کە لە ساڵی ١٩٦٦ نووسیبوویەوە، دوانەکەی دیکەش بەخەتی

(مەلا خالید دووسەرەیی) بوون، هەورەها دوو دەستنووسی دیکەشم بە دەستکەوت یەکێکیان بە خەتی (مەلا مەولوودی کەندالە قەلی) و ئەوی دی بەخەتی (محمد)ی کوڕی شاعیر بوو.

هەموو ئەو شیعرانەم نیشانی بەڕێز (د.محمد نوری عارف)دا کە ڕابەری نامەکەم بوو، ئەویش بەخۆشحاڵیەوە ڕەزامەندی کرد کە نامەکەم لەسەر لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی بەشێك لە دیوانی موخلیس (باغی لاوان) بێت.

هەرچەندە من نەمتوانی هەموو شیعرەکانی موخلیس بەدەست بێنم، بەلام هەر نەدەکرا لەسەر هەموو شیعرەکان بنووسرێ، چونکە لەوانە بوو نامەکە لە (١٠٠٠) لاپەڕە ڕەت بێت.

ئەم لێکۆڵینەوەیەی کەلەبەر دەستتانە بریتییە لە پێشەکی و سێ بەش و لیستی سەرچاوەکان.

**بەشی یەکەم:** بریتییە لەم سەرەبابەتانەی خوارەوە: ژیانی شاعیر، نازناوی شاعیر، بەرهەمەکانی، پلەوپایەی شیعری موخلیس، وێنە شیعرییە تازەکانی موخلیس ، موخلیس و شێوەزاری هەولێر، شانازیکردنی موخلیس بەشیعرەکانی.

**بەشی دووەم:** ئەم بەشە بەراوردکارییە و برتییە لە بەراوردکردنی موخلیس لەگەڵ شاعیرەکانی پێش سەردەمی خۆی، ئەمەش دەبێتە سێ لقی سەرەکی:

١- موخلیس و شاعیرە فارسەکان (خەیام، سەعدی، حافز).

٢- موخلیس و شاعیرە عەرەبەکان (رابیعەی عەدەوییە، ئیمامی شافیعی، حەللاج، شبلی، ئیبن عەرەبی).

٣- بەرامبەریکردنی (موازنە) موخلیس لەگەڵ شاعیرە کوردەکان: (بابا تاهیر، نالی، سالم، کوردی، حاجی، شێخ ڕەزا، مەحوی، ئەدەب، وەفایی، حەمدی، کەمالی، تاهیر بەگی جاف، بێخود، قانیع، حەزین).

**بەشی سێیەم:** بریتییە لە لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی هەندێ لەشیعرەکانی موخلیس بەم جۆرەی خوارەوە دابەشبووە:

١- شیعری ئایینی.

٢- شیعری سۆفیانە.

٣- شیعری دڵداری.

٤- شیعری وەسف: کوردستان، بەهاری دەشتی قەراج.

٥- شیعری نیشتیمانی.

٦- شیعری کۆمەڵایەتی.

٧- شیعری ستایش.

٨- شیعری لاواندنەوە.

٩- شیعری داشورین

١٠- دووبەیتی و تاکە بەیتیەکان.

لە ساغکردنەوەی شیعرەکاندا دەستونووسەکانم بەراورد کردووە و ئەگەر هەڵەیەکی بچکۆلە یاخود لەبیرکردنێکی سادە لە دەستنووسەکاندا ڕوویدابێت ئەوا چاکم کردۆتەوە و لەنێوان دوو کەوانەی گەورەدا ﴿......﴾ دام ناوە . بۆ دەستنووسەکانیش ئەم ڕەمزانە بەکارهاتوون.

أ- خالید دووسەرەیی: خ. د

ب- ئەحمەد ڕەشوانی: أ. ر

ج- محەمەد خەلیل: م. خ

د- مەولوود کەندالی: م.ك

لە لێکۆڵینەوەی شیعرەکانیش، بەحرە عەرووزیەکان دیارکراون و وشە گرانەکان لێکدراونەتەوە و هەندێ بەیتی فورس واتایان نووسراوە و هەندێ لایەنی ڕەوانبێژی دیاریکراون، بەتایبەتی زۆر گرنگی بە ئیقتیباسی ئایەت و حەدیسەکان دراوە.

# بـەشی یـەکەم

- ژیان و سەردەمی موخلیس
- گەشتەکانی موخلیس
- نـازنـاوی شیعری موخلیس
- بەرهەمەکانی
- موخلیس و شیعر
- پلەو پایەی شیعرەکانی
- وێنەی شیعری لای موخلیس
- موخلیس و شـامـازیکردن بە شیعرەکـانی
- موخلیس و شێوەزاری هەولێر

# ژیان و سەردەمی موخلیس

شاعیر ناوی (خەلیل کوڕی ڕسوڵ کوڕی مستەفا)یە و لە خێڵی سنجاوییە، لەم بارەیەوە خۆی لە شیعرێکدا دەڵێت:

**کوردم و سنجاوییە تیرەم ، لە سنەمتدا مەلام**

**نیشتیمادمانە عیراق و شاری هەولێرە لیوام[1]**

لە ساڵی ١٩١٠ عیسایی/ ١٣٢٩ کۆچی لەگوندی (شۆڕمزەرتکە) لەدایك بووە لەو کاتەی خێزانەکەیان لەبەهاردا بۆ مەڕ لەوەڕاندن دەچنە ئەو شوێنە، هەروەکو لە قەسیدەیەکدا دەڵێت:

**من جێگەی پێشووم شۆڕمزەرتکەیە — ئەو شۆڕمزەرتکەی کەندێناوەیە**

**دێیەکی زۆرە، زۆر خۆش هەوایە — ئاوەکەی شۆری وەك دەرمان وایە**

**پیشەی کوردانە، لەوێ وابووە — هەرکەس مەڕدار بێت بۆ قەراج چووە**

هەروەها دەڵێت:

**بوار خۆش بووە، لەو بوارەدا — متی دەرخست خوا لەو هەوارەدا**

**مێژوویی هیجری لەودەم وای دەگۆ — هەزارو سێ سەد بەر لەبیست ونۆ**

کەتەمەنی بووە پێنج شەش مانگان باوکی دەمرێت و بەهەتیوی لە ئامێزی دایکیدا کرۆشکەی کردووە، بەڵام دایکی زۆر بەمەردانە بەخێوی کرد و نەیهێشت وەکو زۆربەی منداڵەکانی ئەو سەردەمە لە چێژی خوێندن بێ بەش بێت و دەینێرێتە بەر خوێندنی فەقێیان و خۆشی ماڵئاوایی لە دنیای جوان وتاقانەکەی دەکات، لەم بارەیەوە دەڵێت:

**بووم بە پێنج شەش مانگ باوکم باری کرد**

**دایکم بەتەنیا بەخێوکاری کرد**

---

(١) موخلیس، مەولودنامەی کوردی، چاپخانەی هەولێر – ١٩٦٨، ل ٢٨.

لۆ دایکی وا چاك من تاقانه بووم

بۆ ژین لەو دەمەدا بەگزادانە بووم

تاعومرم دەبوو بە پێنج شەش ساڵان

ڕامبوارد بۆ خۆم هەروەك منداڵان

ڕۆژ و شەو دایکم هەر دوعای دەکرد

ژین و چالاکی بۆم داوای دەکرد

دەیگوت: ئەی خوایە هەر بۆ خۆم نەبوو

کەمن خەلیلم داواکرد لەتوو

دەمەوێ چاك بی، دەموێ مەلابی

بۆ دین و دنیا ئیشی پێ چا بی

هەرچی لەخوای خواست، ئەوی لەبۆ کرد

من کەتمە خیندن ئەویش کۆچی کرد

لەم شیعرەی خوارەوەدا شاعیر بۆمان دەردەخات کە ژیانی سوختایەتی و فەقێیاتی زۆر بە ناگزووری ڕابواردووە و نازار و تاڵی و سوێرییەکی زۆری دیوە لە ڕاتبە[1] هێنانەوەدا و زۆر کەوەڕێ[2] بووە، بەڵام کۆڵی نەداوە:

خۆم تەوانەدا زۆر بەدەست و برد

گەرچی هەژار بووم خوێندنم دەکرد

بێکەس و بێدەر بەبێ ڕەقابەت

بێ جل و جۆرو شتی کیتابەت

خۆراکی ڕۆژێم بەحاڵ و بێ حاڵ

دوو نانی ڕەق و سێ دیشلەمەی تاڵ

(١) راتبە: کۆکردنەوەی خواردنە بۆ فەقێیان.

(٢) کەوەڕێ: ماندوو و شەکەت.

زۆر شپرزە بووم تاکو سوختەبووم

دەست و پێ چلکن زۆر ناپوختە بووم

لۆ نان و لۆ ئاش لەدێ دەسووڕام

کۆم ئەکردەوە لەبۆ مامۆستام

هێوارە و بەیان لە کڕی زستان

باران لێی دەدام بەڵام چ باران

سەرەتای خوێندنی لای مامی (مەلا ئەبووبەکر)[1] بووە لەگوندی دووسەرە [2] دەستی پێکردووە، پاشان وەکو هەموو فەقێیەکی کورد زۆر شوێن گەڕاوە و دەرسی تێدا خوێندووە و بەزۆری لای ئەم زاتانە خوێندوویەتی: بە فەقێیەتی لەساڵی ١٩٣٢-١٩٣٤ لەلای (مەلا ڕەشیدی موکریانی) لە گوندی کەندالی نزیک مەخموور خوێندوێتی، هەروەها لەلای (مەلا قادری سووریژەیی) لە گوندی سووریژەی سەر بە ناحیەی قوشتەپە و لای (مەلا محەمەدەمینی سوێری) لە گوندی پیرداودی سەر بەناحیەی قوشتەپە خوێندوویەتی. بە موستەعیدی[3] لای (مەلا شێخ جەلالی بەرزنجی) کانی کوردەیی لە گوندی ترپەسپیانی سەر بە ناحیەی قوشتەپە و (مەلا ئەحمەدی ڕەش) لەگوندی چەغەمیرەی کەندێناوە و (مەلا ساڵحی کۆزەپانکە) لە هەولێر لە مزگەفتی تەکیەی شێخ نوورەدین خوێندوێتی. هەر ئەلای (مەلا ساڵح) ماوەتەوە تا لە ساڵانی ١٩٤٢-١٩٤٤ ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە.

---

(١) کە مەلا ئەبووبەکری مامی وەفاتیکردووە، موخلیس لەقوناغەکانی ناوەڕاستی خوێندن بووە، بەڵام مەلایەتیی دێیەکەی بۆ هێڵراوەتەوە تاوەکو خوێندنی تەواوکردووەو لە ساڵەکانی سەرەتای چلەکاندا لەلای خولێخۆشبوو حاجی مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی لە شاری هەولێر ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە و بووە بە مەلای مودەڕیس. عەلی فەتاح دزەیی، سێ گوڵ لەباخی لاوانەوە، کاروان، ژمارە: ٣٨، ١٩٨٥، ل ٤٩.

(٢) دووسەرە: گوندێکە (٢٠ کم) لە خوارووی هەولێرە لە ڕێگەی دیبەگە.

(٣) موستەعید: زاراوەیەکی دوا قوناغی خوێندنی مەلایانە، واتا: ئەوەی ئامادەیە بۆ ئەوەی ببێتە مەلا و بەرامبەر دواناوەندی ئێستایە.

# گەشتەکانی موخلیس

هەرکە موخلیس ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لە جێی مەلا ئەبووبەکری مامی لە گوندی دووسەرە بووەتە مەلا و فەتاح ئاغای دووسەرە زۆری خۆشویستووە و یارمەتی داوە.

موخلیس مرۆڤێکی دڵ ناسك و سۆفی بووە، بۆیە جاروبار لەماڵێ زویر دەبێ و لە شوێنی دیکە دەگیرسێتەوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٢-١٩٥٣ لە ماڵەوە زویر دەبێ و لە دووسەرە دەڕواو نزیکەی شەش حەفت مانگ هیچ سەر و سۆراغی نابێت. توومەزە دەچێتە (قزرابات) و لەوێشەوە بۆ کفری، ئینجا لە کفری دووبارە دەست بەخوێندن دەکاتەوە، بەڵام ئەو مەلایەی دەرسی پێدەڵێ دەزانێ کە موخلیس لەوانە نییە تازە ئەو کتێبانە بخوێنێ و لەئەنجامدا لەمەسەلەکە دەگات.

دوای ماوەیەك نامەیەك بۆ (مەلا سەید محەمەدی پیرداود) دەنووسێ، بەهۆی پوولی نامەکەوە دەزانن کەوا لە کفری یە. لە هەمان کاتیشدا نامەیەك بۆ فەتاح ئاغای دووسەرە دەنووسێ و شیعرێکی تێدا دەبێ کە هەست بە سۆزی دەروونی خۆی و بۆنی دووریی وڵاتیشی لێ دێت، ئەمە نموونەیەکە لەو شیعرە:

گەرچی خۆ زۆر زەحمەتە تەرکی وەتەن کردوومە من

زۆر موناقینە لەگەڵ یەك، کەسبی عیلم و کەسبی ماڵ

مە نشەئی فیتنە و بەڵای دونیا و قیامەت هەر ژنە

(فانظروا هلي اني في هذا المقال في الضلال)؟

هەر کە خزم و برادەرانی دەزانن لە کفرییە، ڕۆژێکیان مەلا سەید محەمەدی پیرداود و مەلا قادری سووریژەیی و مەلا سادقی فەرهادی و حاجی پیرداودی ئامۆزای موخلیس دەچنە شوێنی و لە کفری دەیدۆزنەوە و دوای هەوڵدانێکی زۆر ئینجا بۆیان دەسەلێنێ کە لەگەڵیان بێتەوە دووسەرە.[1]

---

(١) مەلا سەید محەمەدی مزگەفتی عەداڵە گوتی: کە ئیمە چووینە شوێنی، موخلیس لەو کاتەدا (خەریکی دەستنوێژ) دبێ و گوێی لە دەنگی ئێمە دەبێ، دەیەوێ خۆی لێمان بشارێتەوە، بەڵام لەبەر خۆیەوە دەڵێ: ئەوانە بۆخوا هاتوونەتە لام نابێ دڵیان بشکێنم.

له ساڵی ۱۹۵۱ بۆ یەکەم جار دەچێتە حەج و زیارەتی ماڵی خوا دەکات. لە ساڵی ۱۹٦٤ بێ ئەوەی خەڵکی دووسەرە بزانن هۆی چیە، موخلیس باردەکا و دێتە هەولێر و لە مزگەفتی حاجی تەهای قەساب دەبێتە مەلا.

لێرەش هێندەی پێ ناچێ دووبارە سەر هەڵدەگرێ و دەچێتە (فەلووجە) و لە مزگەفتی گەورەی فەلووجە دادەمەزێ و ناشنایەتی لەگەڵ مەلای مزگەفتەکە پەیدا دەکات کە ناوی (شیخ عبدالعزیز سالم السامرائی) بووە.[1] لەوێ دەست بەوانە گوتنەوەی زانستی لۆجیك (منطق) دەکات.

دوای ماوەیەك کەڵکەڵەی چوونە شام و مەدینەی دێتە مێشك، شێخ (عبدالعزیز) پاسەپۆرتی بۆ دەبڕێ و دەچێتە سووریا لەوێ لەگەڵ شێخێکی نەبهانی[2] ناشنایەتی پەیدا دەکات. ئینجا یادی نیشتمان دەکاتەوە و بەرەو وڵات دەگەڕێتەوە و سەرێکی دیکەش لە شێخ (عبدالعزیز) دەداتەوە.[3]

پێش ئەوەی بەرەو وڵاتی حیجاز بڕوات، نامەیەك بۆ مەلا سەید محەممەدی پیرداود دەنووسێ و تێیدا دەڵێت: "ئەوا دەڕۆمە مەدینە، ئەو پارەیەی لەلاتە باهەر لەت بێ یان لە مەککە یەکتر دەبینینەوە یا لەقیامەت"[4]. جا بۆ ئەم مەبەستە هەندێ پارەی عێراقی گۆڕیەوەو کردیە دۆلار، بەڵام هەکە گەیشتە سەفوان هێزێکی گیانی وای لێکرد کە پەشێمان ببێتەوە و بگەڕێتەوە وڵاتە شیرینەکەی[5]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە موخلیس نەگەیشتووەتە حیجاز و مەدینە و لە سەفوان گەڕاوەتەوە[6]، نابێ ئەوەش

---

(۱) شێخ عەبدول عەزیز سالم سامەرائی: مامۆستا و پێش نوێژ و خوتبە خوێنی مزگەفتی گەورەی فەللووجەبوو، کتێبێکی هەیە بریتییە لە دوونامیلکە: هاتان رسالتان: ۱- جداول الامثله فی الصرف. ۲- اوضح المقال لبیان تحفة الاطفال فی التجوید، مطبعة العانی، ط۲، بغداد ۱۹٦٤، ص ۷۰.

(۲) نەبهانی: تەریقەتێکی سوفیەتیەوەدەگەڕێتەوە سەرنەقشبەندی،موخلیس لە بارەی ئەوشێخە نەبهانییەگوتوویەتی: ئەوویستی پارەم بداتێ لێم وەر نەگرت، ئەمن پارەم دایێ وەری کرت. ئەم زانیاریەم لە دکتورعەبدوڵلا نەقشبەندی وەرگرت.

(۳) ئەم زانیاریەم لەبەڕێزمەلاسەیدمحەممەدی پیرداودوەرگرت.

(٤) هێشتا دەقی ئەو نامەیەلە لای مەلا سەید محەممەدی پیرداود ماوە.

(٥) ئەم زانیاریەم لە بەڕێز د.فائیق عەبدوڵلا نەقشبەندی وەرگرت.

(٦) ئەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن کە موخلیس نەچووەتە مەدینەئەم زاتانەن:
(مەلاعەبدوڵلای فەرهادی، مەلا سلێمانی مزگەفتی شێخ مستەفا، د.فائیق عەبدوڵلا نەقشبەندی). جالەمەرایەکەی (سوران مەحوی ڕەد دەکاتەوە کە لە بەیانی ژمارە: ۱۲۲ ساڵی ۱۹۸٦ نووسیویەتی کە گوایە چووەتە مەدینە و ماوەیەك لەوێ بووەو لەبەر چەند هۆیەك کە بە درێژی نووسیویەتی گەڕاوەتەوەکوردستان.

لەیاد بکەین کە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە هەولێر نامەیەك بۆ شێخ مستەفا دەنووسێ و تێیدا دەڵێ: " لەم ڕۆژانە دێمەوە هەولێر "[1]. هەرکە دەگاتەوە هەولێر یەکسەر دەچێتە خزمەت شێخ و زۆر لەوە دەترسێت کەلێی زوێر بووبێت، بەڵام شێخ بەجوانی وەریدەگرێتەوە و دڵی ناشکێنێ[2].

دوای ئەمە بەماڵەوە دەچێتەوە دووسەرە و دەبێتەوە مەلایان هەتا ساڵی ١٩٧٥. ئەمجارە بە یەکجاری دووسەرە و ماڵ و منداڵ بەجێدێڵێ و دەچێتە خانەقای شێخ مستەفا لە شەقڵاوە، لەوێندەر وەکو زاهیدێکی گۆشەگیر خەریکی خواپەرستی دەبێ و لەهەموو کاروبارێکی جیهان پەرستی دوورەپەرێز دەبێ و جاروباریش سەردانی مزگەفتی شێخ مستەفا و گوندی دووسەرە دەکاتەوە، لە مزگەفتی شێخدا ژوورێکی هەبوو خزم و برادەرانی سەریان لێدەدا.

موخلیسی ڕەند هەتا دەهات پیری و نەخۆشی تەنگی پێ هەڵدەچنی و لەپەل و پۆی دەخست، ماوەیەك لە مزگەفتی شێخ مستەفادا بە نەخۆشی کەوت و پاشان بردیانە نەخۆشخانەی سەدام کە رزگاری ئێستایە[3]. بەڵام نەخۆشیەکەی تادەهات قورستر دەبوو و فرزەی لێ بڕی و زانست بەرامبەر قەدەری خوا دۆش داماو لەشازدەی ڕەمەزانی ١٤٠٦ ك / ١٩٨٥/٦/٥ زەهراوی مەرگی نۆش کرد و بەرەو ژیانی نەمری هەنگاوی نا و تەرمە پیرۆزەکەیان بردە گۆڕستانی گردی پیرداود و لەسەرگردی لەنزیك فەتاح ئاغای دووسەرە بەخاکیان سپارد و هەزارەها هیواو ئاواتی مەزنی زیندە بەچاڵ بوو.[*]

---

(١) ئەم زانیاریەم لە د. فائیق عەبدوڵلا نەقشبەندی وەرگرت.

(٢) د. فائیق نەقشبەندی بۆی گێڕامەوە کەگوایا موخلیس بێ ئیزنی شێخ مستەفا رویشتبوو.

(٣) لە د. فائیق نەقشبەندیم بیست کە خوی لە نەخوشخانەی رزگاری دووجار سەری لە موخلیس داوە، جارێکیان بۆ خۆی و دووەمیان شێخ مستەفای باپیری لە جیاتی خوی ناردوویەتی. هەرکە بوجاری دووەم دەچێت یەکسەر موخلیس هەست بەوە دەکات کەلە جیاتی شێخ هاتوتە لای، چاوەکانی پڕفرمێسك دەبن.د. فائیق لێی دەپرسێ وا دیارە ئازارت زورە؟ موخلیس دەڵێ: ئەمە فرمێسکی ئازار نییە، بەڵکو ئەو فرمێسکەیەکەماوەی (٤١) ساڵ بەچاکی نەمتوانی خزمەتی شێخ بکەم، ئەمەش جورە کەرامەتێکی موخلیسە.

(*) باوکم پێش مردنی وەسیەتی کرد کە لە تەنیشت موخلیس بنێژرێ سەرەڕای ئەوەی کە گۆڕی بابو باپیرو دایکی لەگرد عازەبانە. لە١٤/٨/١٩٩٤کەوەفاتی کرد لە قیبلەی گۆڕی موخلیس نێژرا (نووسەر).

# نازناوی شیعری موخلیس

شاعیر لەسەرەتای شیعردانانی نازناوی، (واقی)ی بۆ خۆی داناوە، جگە لە مەلا خەلیل ئەم شاعیرانەش نازناوی واقییان هەبووە:

١- مستەفای کوڕی مەلا عەلی کە خەڵکی سلێمانی بووە و زۆربەی ژیانی بە فەرمانبەری ڕابواردووە، خزمی عیرفان ئەفەندییە، لەساڵانی ١٩٣١ لە سلێمانی وەفاتی کردووە. ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرێکی کە لەڕۆژنامەی ژیانەوەی ژمارە (٦)ی (٣)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ بلاویکردۆتەوە:

مەقسوودە فنوون، دوورە لەناو ئێمە کەمالات

بێهۆش دەمرین ئاخری، وەك پیری خەرابات

تا دەڵێ:

سەد حەیف و خەساری کەوەها ڕۆیی زەمانمان

(واقی) چ دەڵێی سوودی نییە شیعرو غەزەلیات[1]

٢- مەلا تەهای گوندی مام قلنجی کە لە ١٩٠٩ لە دایکبووە، بە عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی شیعری هەیە و ئێستاش لە مزگەفتی مەلا جامی لە کۆیە مەلایە. ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرێکی:

لەو زەمانە گەر لەڕاستی و ماف و حەق گوێت کەڕ نەکەی

خۆت حەواڵەی تیر و تانە و مەنجەنیقی شەڕ دەکەی [2]

تا ساڵی ١٩٤٢ شاعیر نازناوی واقی هەڵگرتووە و لەو شیعرانەی بە دەستم گەیشتوون لە سێ شیعردا نازناوی واقی تێدایە. لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٤ هاتۆتە ژێر باڵی ڕێبازی نەقشەبەندییەوە و شێخ مستەفای هەرشەمی کردۆتە ڕابەری خۆی و نازناوی

---

(١) دەستنووسی (هەفت لشکری بیانات)، بە پێنووسی نەجمەدین مەلا،کتێبخانەی مەرکەزیی زانکۆی سەلاحەددین، ژمارە /٤٨٨، ل ٤٦٩ / ٤٧٠.

(٢) ئەم زانیاریانەم لە مەلا عەبدوڵلای فەرهادی وەرگرتووە.

(موخلیس)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و تامردن بۆی ماوەتەوە. لەناو کورددا چەند شاعیرێکی دیکەش نازناوی (موخلیس)یان هەبووە، لەوانەش:

١- ئەحمەد موخلیس کوڕی ئەمین: لەم بارەیەوە مەلا ئەنوەر مایی دەڵێ: "ئەمز نزانم ب ڕاستی کا نەڤ تووڕەڤانێ مەزن لەکیش سالدابوویە بەلکی ئەو بخوەژی نزانیت. بەلی یا ئەمز دزانم ئەحمەد ل گوندی بامەڕنیدا هاتیە دونی، بابێ ئەحمەد ب نالبەندی مژوول دەبوو، ئەو تووڕەڤانە ل ناڤێ بەهدینانـدا ب ئەحمەدێ نالبەند تێتە ناسین. ئەحمەد ل بامەڕنی دەست ب خواندن کریە، نو پاشی چوویە گوندی مایی کو دکەڤیتە ناڤ ئەشیرا بەرواری بالا ئو ل ویرێ دەمەکی زۆر مایە لنک مەلا ئین مایی دخوند"[1].

٢- مەلا فەیزوڵلای شافیعی سەقزی: خەڵکی کوردستانی ئێران بووە و نازناوی موخلیس بووە و لە ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٦ لە سلێمانی بووە و گەڕاوەتەوە ئێران، لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ٦ ساڵی (٦)ی ١٩٤٥ قەسیدەیەك بڵاودەکاتەوە بەناوی (دەمێکە)، ئەمە کۆتاییەکەیەتی:

عەزیزی (موخلیس)ە وەتەن، لەجێی هەوایی گوڵ بەدەن
لە عەشقی زوڵف و خاڵی چین، بەڕووی گوڵی عوزارەوە[2]

هەروەها لەبارەی ئەم شاعیرە گیو موکریانی دەڵێت: ناوی مەلا فەیزوڵلای سەقزییە و نازناوی کۆنی موخلیسە وەی تازەشی (ئاوارە)یە[3].

٣- شێخ مستەفای کوڕی عەبدول سەمەدی قازی نازناوی موخلیسە، لە سلێمانی لەدایکبووە و لەوێش ژیاوە، لەدەوری عوسمانیدا ئەندامی دادگا بووە، ماوەیەکیش مودیری هەتیوخانە بووە. شارەزایی لە زمانی فارسی و عەرەبی و تورکیدا هەبووە. لەسەرەتای مانگی مارتی ١٩١٩ لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. نموونەیەك لە شیعری:

---

(١) مەلا ئەنوەری مایی، موخلیس،هەتاو،١٩٥٥، ژمارە:١٠٤، ل ٩.
(٢) عەبدولقادر دەباغی، دەمێکە، پاشکۆی عیراق، ١٩٨٨، ژمارە٢٢، ل ٦
(٣) گیو موکریانی، هەتاو، ١٩٥٥، ژمارە: ٤٦، ل١٣.

ئەهلی جەوهەر ناعەزیزن، بۆیە وابوو دەردی ڕۆم

حەیفە (موخلیس) تابەکەی وەك گەنجی ناو وێرانە بێ[1]

٤- حاجی مەلا ڕەسوولی دڵێژەش نازناوی موخلیس بووە، لەساڵی ١٨٣٩ لەدایکبووە و لە ١٩٢٩ وەفاتیکردووە. ئەمەش بەیتێکە لە شیعرێکی:

کە (موخلیس) ئوممەتی تۆیە و موریدی خاسی کاك ئەحمەد

لە کەشتیی موعجیزەی تۆدا چ باکی بەحری عیسیانە[2]

---

(١) د. مارف خەزنەدار، موخلیس. لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا ١٩٨٤، ل: ٣٠.

(٢) عەبدولقادر دەباغی، وەڵام و سوپاس. پاشکۆی عیراق، ١٩٨٨، ژمارە: ٥٠، ل١٢.

# بەرهەمەكانی

مـوخليس ئـەم بەرهەمانـەی خـوارەوەی بـۆ بـەجێ هێـشتووین كـە جگـە لـە مەولوودنامەكەی ئەوانەی دیكە ڕۆشنایی چاپیان نەدیوە، بەرهەمەكانیش بە كوردی و عەرەبین، سەرەڕای چەند حاشیەیەك كەلەسەر هەندێ كتێبی نووسیوە:

## أ- بەرهەمە كوردییەكان:

١- مەولوودنامـەی كـوردی: لەسـاڵی ١٩٦٨ لـە چـاپخانەی هـەولێر چـاپكراوە و قـەبارەی ناوەنجیە و (٣١) لاپەڕەیە. سەرەتا بەمجۆرە دەست پێدەكات:

بابكەین یارانی دین حەمدی خودا
دین و دونیامان زیاتر پێ دەدا
چاكەیەكی وای لەگەڵ ئێمە هەیە
ناكرێ شوكری بەكەس ئەو چاكەیە

كۆتاییەكەشی بەم شێوەیە:

هەروەكو تەیری سپی جبریل دەهات
تاوەكو دەفعی جەفامان لێ بكات
جوبرەئیل وەك هات و دیتم بێ جەفا
دام دەنا زاتی محەمەد مستەفا

٢- دیـوانی مـوخليس (بـاغی لاوان): بریتیـە لـە كۆمەڵـە شـیعرێك كـە بەشـی زۆری مەبەستە شیعرییەكانی تێدایە و زۆربەی ئایینی و سۆفیانەیە جگە لە چوارینە و

یەك بەیتەكان. ئەم دیوانە تا ئێستا دەستنووسەو بە خەتی (محمد خلیل)ی كوڕی شاعیر ماوەتەوە و دانەیەكی لای كاك (عبدالله احمد فتاح دزەیی)یە و دانەیەكیشی لای منە.

٣- هیجرەت نامەی كوردی: باسی كۆچكردنی پێغەمبەر (ص) دەكات لە مەككەوە بۆ مەدینە، قەسیدەكە مەسنەویە و (٢٠٧) بەیتەو چەند دەستنووسێكی هەیە لەوانەش دەستنووسی شاعیر خۆی و علی حیدر قارەمان و مەلا مەحموودی زەرگەزەوی. بەم دواییە ساغم كردوونەتەوە و لێیانم كۆڵیوەتەوە و ئامادەم كردووە بۆ چاپ و (بنكەی تەفسیر) چاپكردنی گرتۆتە ئەستۆی خۆیەوە. ئەمەش سەرەتای قەسیدەكەیە:

شاهم شاهێكە شاهی شاهانە

قەیسەر و كیسرا لای ئەو گەدانە

ئەمەش كۆتاییەكەیەتی:

خولاسەی هیجرەت بەكورتی و كوردی

ئەوهایە موخلیس واعەرزی كردی

٤- دین و دونیا بۆ گەلی وریا: بە خەتی شاعیر نووسراوەتەوە و (١٦٣) لاپەڕە و بریتیە لە چەند بابەتێكی كۆمەڵایەتی و ئاینی كەبە شیعر هۆنراوەتەوە. ئەمەش سەرەتاكەیەتی:

سوپاسی من لەبۆ یەزدانی تاكە

كە ئێمەی خستە سەر ئەو ڕێیە پاكە

واناوی هەندێ لەسەرە بابەتەكانی دەنووسین بەنموونەوە:

## علیم وخێندن

برای دین ئێوە گەر دەربەستی دینن

ئەزانینە بە منداڵان ئەخێنن

فەلەك تاریكە گەر ڕۆژی نەبیتن

زەمین تاریكترە عیلمی نەبیتن

## کار و کۆشش کردن

خودا عەبدێکی خۆشناوێ زەغەل بی
لەبۆ دونیا و قیامەت بێ عەمەل بی
بەنانی دەستی خۆت گەر ڕابوێری
دیارە کەمتیار نی، بەچکە شێری

## جیرانەتی وادەبی

دەبی جیران لەجیرانی ڕەزابی
وەکو جیرانەتی ئەورۆکە نابی
لە ناخۆشی و لەخۆشیی ئەو شەریك بە
لە ئەزیەتدانی زۆر دوور و تەریك بی

٥- ئاینی ئیسلام ئەوەیە: ئەم کتێبە بریتیە لە وەرگێڕانی کتێبی (زواجر ابن الحجر) و بە شیعر کردوویەتیە کوردی، ئەمەش چەند نموونەیەکە لە بابەتەکانی:

## منع الزوج حق الزوجة و منع الزوجة حق الزوج، کبیرة:

مێردو ژن حەقیان لەسەر یەکتر هەیە
مەنعی ئەو حەققە گوناهی گەورەیە
فەرقی نێر و مێ نییە هیچ بۆ ژیان
بەرگ و خواردن یەکە بۆ پیاو و ژنان

## قطع الطریق کبیرة

ڕێگری حەربی خودا و پێغەمبەرە
بۆ زەمین یەکجار فەساد و زەرەرە
جارێ ڕێگر هەردەبی ئەوها بکەی
بیکوژی یاخۆ دەبی صەلبی بکەی

٦- کاکڵەی عەقیدەی کوردی: لە (٣٦) بەیتە شیعری مەسنەوی پێکهاتووە و باسی خود و سیفەتەکانی خواو بنەماکانی ئیسلام و ئیمان دەکات. لەبەیانی ژمارە: ١١٢ ساڵی ١٩٨٥ لاپەڕە (٣٩) جەلال مەولود ناوی هێناوە. لەساڵی ١٩٩٩ دەستنووسەکەم بەدەستکەوت و بەلێکۆڵینەوەیەکەوە لەگۆڤاری ڕامانی ژمارە (٣١) لە ساڵی ١٩٩٩ بڵاوم کردەوە، ئەمەش دوو بەیتی سەرەتاکەیەتی:

حەمدی خوا ئەکەم صەلەوات ئەدەم

لەخۆشەویستیی ئالی موحتەرەم

برایانی دین دەنووسم بۆتان

عەقیدەی کوردی فێربکەن خۆتان

## ب- بەرهەمە عەرەبییەکان:

١- __مآثر الابرار و الاخیار و مقالاتهم__، ئەم کتێبە (٧٧) لاپەڕەیە و بەخەتی خۆی نووسراوەتەوە، بریتیە لە کۆمەڵە وتارێك کە تەنیا ناوی خاوەنەکەی لێ نووسراوە بێ ئەوەی هێما بۆ هیچ سەرچاوەیەك بکات، بۆ نموونە:

"من مقالات الصديق الاكبر ابي بكر (رض): اكيس الكيس التقوى، و احمق الحمق الفجور، و اصدق الصدق الامانة، و اكذب الكذب الخيانة". و من مآثره: انه كان يأخذ بطرف لسانه و يقول: هذا الذي اوردني الموارد.

٢- __موائد الفوائد__، ئەمە کتێبێکی گەورەیە و زۆر بابەتی بەخۆوە گرتووە و لەهەندێ جێگا ناوی ئەو سەرچاوانەی هێناوە کە شتی لێ وەرگرتوون و لە هەندێکی دیکە فەرامۆشی کردووە. کتێبەکە بەم جۆرە دەست پێدەکات: "الحمدلله الذى لم يجعل للانسان الا ماسعى و اعلم أن سعيةسوف يرى". ئەمەش هەندێ لە بابەتەکانێتی:

اهل الفترە:

(الاصح في اهل الفترة و هم من لم يرسل اليهم رسول، انهم في الجنة عملا بقوله تعالى: (و ما كنا معذبين حتى نبعث رسولا). وحمل على من قبل البعثة الفتوى الحديثة.

**ساڵی بوون و مردنی زاناکان:**

- اعلم ان ابا حنيفة ولد سنة (٨٠)ه و مات سنة ١٥٠ه و عاش ٧٠ سنة.
- وقد ولد الامام مالك سنة (٩٠)ه و مات سنة ١٧٩ و عاش ٨٩ سنة.

٣- <u>مجمع العقائد:</u> ئەم کتێبەم دەست نەکەوت تەنیا لەبەیانی ژمارە: ١١٢ی ساڵی ١٩٨٥ جەلال مەولوود لە لاپەڕە (٣٩) ناوی هێناوە.

٤- <u>القطف النظيف بشرح التصريف:</u> بریتیە لە لێکدانەوەی تەسریفی مەلا عەلی لەسەرفدا لە ١٩٧٣ (عبدالقادر مەلا سلیمان) ناشۆکانی لەگوندی موورتکە نووسیویەتەوە.

٥- <u>شرح کتاب شرح الفية بن مالك، عبدالرحمن الاسيوطي:</u> لە لێکدانەوەکەدا گەیشتۆتە باسی (نواسخ المبتدا و الخبر).

هەروەها موخلیس حاشیەی لەسەر ئەم کتێبانە نووسیوە بە زمانی عەرەبی:

أ- حاشية مدونة على باب الفعل، القسم الثاني من كتاب حدائق الدقائق لسعدالله البردعي بشرح الانموذج للزمخشري. کتێبەکە (٩٦) لاپەڕەیە و لە ١٣٦١ ك سابیر گردمەلایی نووسیویەتەوە.

ب- حواشي على حاشية عبدالله اليزدي على تهذيب المنطق للتفتازاني.

ج- حاشية على حاشية العلامة الباني على متن جمع الجوامع لأبن السبكي.

د- حواشي متفرقة على شرح منهج الطلاب للشيخ زكريا الانصاري - اربع مجلدات في الفقه الشافعي.[1]

---

(١) زانیاری ئەم حاشیانەم لەمەلا تەیب بەحرکەیی وەرگرتووەو کتێبەکانیش لای ئەون.

# موخلیس و شیعر

لەبەرئەوەی رۆشنبیریی شاعیر ئیسلامی بووەو لەحوجرە خوێندوێتی لەزۆربەی زانیارییە ئاینییەکانی سەردەمی خۆی شارەزاییەکی باشی هەبووە، شوێن پێی شاعیرە کلاسیکەکانی کوردو بێگانەی گرتووە و بەرهەمەکانیان بوونەتە هەوێنی شیعردانانی "سەرەتای ئاشنایی لەگەڵ جیهانی شعری کوردیدا لەرێگای شاعیرێکی خزمی خۆیەوە بووە کەناوی مەلا خدر و نازناوی شیعری - دەشتی - بووە"[1].

هەرچەندە ئەم سەرەتایە بەتەواوی نازانرێ لە چ ساڵێك بووە، بەڵام ئەوەمان لەبەر دەستە کەوەکو خۆی دەڵێ: "لەدەوروبەری ساڵی ١٩٢٠ کە ئەوسا تەمەنم بیست ساڵان بوو بەتەواوەتی شیعری رێکم داناوە و بەزۆری بەرهەمی نالی و سالی سنە و حاجی قادرم خوێندۆتەوە، لە فارسیشدا سەعدی شیرازی و حافز"[2].

کەواتە موخلیس لە هەردوو سەرچاوەی ئەدەبی کوردی و فارسی بەهرەمەند بووە و وادیارە هەر لە زووەوە خولیای شیعر بووە، چونکە لە شوێنێکی دیکەدا ئەمە روون دەکاتەوە و دەڵێ: "بەخوا ئەوەی راستی بێت ناتوانم بەتەواوی ساڵێك دەستنیشان بکەم بۆ دانانی یان دەستپێکردنی شیعرەکانم. بەس وابزانم لە دەوروبەری ساڵی ١٩٣٠ کە تەمەنم ئەوسا بیست ساڵان بوو بەرە بەرە شیعرم ئەنووسی و ئەم خوێندەوە و لەو شاعیرانە کە بەدڵمە و کاریان کردۆتە سەر شیعرەکانم بێخودو حەمدی و نالی و حەزین و لە فارسیشدا حافزی شیرازی و سەعدی شیرازییە"[3].

لەلایەکی دیکەوە (علی فتاح دزەیی) لەو باوەڕەیە کە موخلیس لە ژێر کاریگەریی تایبەتی هیچ شاعیرێك نەبووە، واتا: دەنگ و ڕەنگی خۆی هەبووە و بووەتە خاوەن

---

(١) عەلی فەتتاح دزەیی، سێ گوڵ لەباغی لاوانەوە، کاروان ژمارە: ٣٨، ١٩٨٥، ل٥٠

(٢) جەلال مەولوود ئەحمەد، شاعیری دەشتی قەراج مەلا خەلیلی موخلیس، بەیان، ژمارە: ١١٢، ١٩٨٥، ل٣٤.

(٣) جەلال سنجاوی، ماموستا خەلیل موخلیس وەڵامی چوار پرسیار ئەداتەوە، هاوکاری، ژمارە: ٢٣٢، ٣٠ /١٩٧٤/٨، ل٦.

شیوازی تایبەتی لە شیعر نووسیندا "گەرچی لەسەردەمێکی وەهادا ژیاوە کەبێخود و ساق بە جووت بە ئوستادی غەزەل دەناسران و ئاشنایی لەگەڵیاندا هەبووە، بەڵام نە ئەمان ونەهیچ شاعیرێکی پێشتر کارێکی تایبەتییان لەتەبعی شیعری ئەودا نەکردووە"[1].

تارادەیەك راستە کەبێخود و ساق کاری تایبەتیان بەسەر موخلیسدا نەبووە، بەڵام حافز بە پلەی یەکەم و سەعدی بە پلەی دووەم و نالی و مەحوی و حەمدی بە پلەی سێیەم کاریان لەسەری هەبووە، حافزی شیرازی کارێکی تایبەتی لە تەبعی شیعری ئەودا کردووە بەرادەیەکی وا کە چەندەها شیعری ئەوی وەرگێڕاوە.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە زۆربەی شیعرەکانی موخلیس ئاینی بووە و بەرەو سوفیگەری رۆیشتووە، چونکە هەر لەدوای ئیجازە وەرگرتنی بووەتە سۆفی، زۆر ئیقتیباسی لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ص) وەرگرتووە، جا ئەم وەرگرتنەش یا راستەوخۆ ئایەتەکەی وەرگرتووە، یاخود بەدەستکارییەوە خستوویەتیە ناو بۆتەی شیعر و یاخود هێما بۆ چیرۆکەکانی قورئان دەکات. هەروەها لەچەند شیعرێکیدا مولەممەع بەرچاو دەکەوێت کە بەکوردی و عەرەبی و فارسی دایڕشتووە.

بێجگە لەمانەش شاعیر کە خۆی لەناو جەرگەی کوردەواری ژیاوەو قاڵبووی دەردو ئازاری رەش و رووتی نەتەوەکەی بووە، ئەدەبی سەرزاریی لەبیرنەکردووە و زۆر پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی ئاخنیوەتە ناو شیعرەکانی و هێمای بۆ چیرۆکە دڵدارییەکان کردووە، وەکو: مەم و زین و شیرن و فەرهاد و یوسف و زولێخا و لەیلا و مەجنوون.

موخلیس شاعیرێکی راستگۆ و دڵ ناسك و پڕ سۆز بووە، هەر هەڵوێستێك کاری تێ نەکردبێ شیعری بۆ دانەناوە، شیعری لا زۆر پیرۆز بووە و بە پوول و پایە نەیگۆڕیوەتەوە، هەربۆیەشە (بەشی هەرەزۆری شیعرەکانی ویژدانین واتە: دەربڕین لە جۆش و خرۆشانی دەروونی شاعیر دەکەن. راستییەکەی لەسەرتاسەری شیعرەکانیدا سۆزی عاتیفە کڵپە دەکات و هەربۆیێکەش ئەوەندە تەڕو پاراون)[2].

---

(١) عەلی فەتتاح دزەیی، سێ گوڵ لەباغی لاوانەوە، ل ٥٠.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

# پله و پایەی شیعرەکانی

هەرچەندە موخلیس کە شیعری هۆنیوەتەوە وەکو شاعیرە کلاسیکیەکانی دیکە مێژووی لەسەر دانەناوە هەتا یارمەتی لێکۆڵەر بدات بۆ ئەوەی بەدروستی هەڵ بسەنگێنێ و قۆناغەکانی گەشەکردنی دیاری بکا و لەرووی هونەرییەوە لێکیان جودا بکاتەوە، بەڵام لەو چاوپێکەوتنە کە (خالید جوتیار) لەگەڵی کردووە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە "ئەو شیعرانەی خۆی دابەشی کردووەتە سەر دوو قۆناغ، یەکەم: ئەو شیعرانەی کە لەهەرەتی لاویدا نووسیویەتی، دووەم: ئەو شیعرانەی ئێستا لەپیری دەیان نووسێت، سەرەتای دەستپێکردنی شیعری غەزەلیات و وەسفی سروشتی کوردستان بوو"[1]

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە غەزەل و وەسفی سروشت سەرەتای شیعرەکانیەتی و لەپلەیەکی بەرزی هونەری دانە. بەڵام ئایا شیعرە لاوازەکانی کامەن و چییان لێهاتووە؟ خۆ شاعیر یەکەم جار ئەم پلە بەرزەی نەبووە. ئەمەش وانە بێ هەر کێشەی شیعرەکانی موخلیس بێت، بەڵکو بەرهەمی شاعیرە کلاسیکیەکانمان بەم شێوەیە و تەنیا شیعرە پوختەکانیان بەدەستمان گەیشتووە و دیارە خۆیان شیعرە سەرەتاییەکانیان لەناو بردووە یان لەناو چووە.

ئەو شیعرانەی کە موخلیس بە پیری نووسیویەتی بریتین لە: ئاینی و سۆفیانە و کۆمەڵایەتی و نیشتیمانی و لاواندنەوە. واتا: موخلیس لەدەرگای زۆر مەبەستە شیعریەکانی داوە و تارادەیەکی باشیش تیایاندا سەرکەوتوو بووە.

دەتوانین لەدوو رووەوە لە شیعرەکانی بدوێین:

یەکەم: لەرووی روخسارەوە: موخلیس هەروەکو شاعیرە کلاسیکییەکانی دیکە لەسەر کێشی عەرووزی عەرەبی شیعری هۆنیوەتەوە و بەزۆری پەیرەوی ئەم بەحرانەی

---

(١) خالیدجوتیار، ماموستا خەلیل موخلیس کێیە؟ روشنبیری نوێ، ژمارە: ١٩٧٤، ١٤، ل١١

کردووه (رەمەل، هەزەج، موزاریع، رەجەز)، بەحری رەمەل بەپلەی یەکەم دێ و بەپێی زەحاف و عیلەکان بەم جۆرەی خوارەوەن:

رەمەلی هەشتی مەحزووف، رەمەلی هەشتی مەقسوور، رەمەلی شەشی مەحزووف، رەمەلی شەشی مەقسوور، رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور، رەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووف، رەمەلی شەشی مەخبوونی مەقسوور، رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف.

بەحری هەزەج بەپلەی دووەم دێت: هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف، هەزەجی هەشتی تەواو، هەزەجی شەشی مەحزووف، هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسور، هەزەجی چواری ئەخرەب، هەزەجی هەشتی موسەبەغ، هەزەجی شەشی مەقسوور، بە پلەی سێیەمیش کێشی رەجەز دێت.

موخلیس تەنیا لە قەسیدەیەکیدا کێشی خۆماڵی پەنجەی بەکارهێناوە کە (٥+٥=١٠)یە، قەسیدەکەش ئەمەیە:

ولات هەی ولات کەیێ بتبینم

دەست لە هەیاسەی پشتت وەرینم

هەرچەندە موخلیس خۆی نەیویستووە لەسەر کێشی پەنجە شیعر دابنێت، بەلام ئەمەی سەرەوە بەکاری فۆلکلۆی ناوچەکەیە و لە چاوپێکەوتنێکدا لە بارەی شیعری نوێی کوردییەوە دەڵێت: "هەندێکم لەو جۆرە شیعرانە خوێندۆتەوە، بەڕای من لەبارەی مانا و شێوە و ناوەڕۆك و تەشبیهو ئیستیعارە و رەمز ئەختێك مووەفەقن، بەلام لەبارەی وەزن و قافیەوە هەر لە حەیران یان هۆرێنەی ئەخۆش دەکات"[1].

لەڕووی سەرواش زۆربەی هەرە زۆری سەرواکانی ستوونییە و هەندێکیشی مەسنەوییە بەتایبەتی چەرۆکە شیعرییەکانی (هیجرەت نامە، عەقیدەی کوردی)، لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە چوارین و تاك بەیتی، چوارینەکان گەلێ زۆرن ولە هی باباتاهیرو خەیام زورترن.تاکە شیعرێکیشی هەیە کە هەر نیوبەیتێکی ئەگەر لەسەرەتاو بنەتاوە بخوێندرێتەوە وەك یەك دەردەچێ ئەمەش جۆرێکە لە یاری کردن بە وشە، بۆ نموونە:

---

(١) جەلال سنجاوی، ماموستا خەلیل موخلیس وەلامی چوار پرسیار دەداتەوە، هاوکاری ژمارە: ٢٣٢،٣٠ /١٩٧٤/٨، ل٦.

قوربان له غەما قەوتام، قەوتام له غەما قوربان

زیندان بووەتە قەسرم، قەسرم بووەتە زیندان

کەچی لەڕووی ڕەوانبێژییەوە هەرچەندە شاعیر بە زمانێکی ساکار و بە سەلیقەیەکی وردەوە شیعری هۆنیوەتەوە و زۆری لەخۆی نەکردووە، بەڵام لایەنی ڕەوانبێژی فەرامۆش نەکردووە و هەر بە سەلیقە بابەتەکانی ڕەوانبێژی وەکو (لێکچوون و ڕەگەزدۆزی و دژ یەك و خوازە و گونجان و پێچاو بەخش ...هتد) بەکارهێناوە و لەو شوێنەی ویستبێتی لە بۆتەیەکی جوان و ناسك دایڕشتووە و وەستایی خۆی تێدا ئاشکرا کردووە. نابێ ئەوەش لەیادبکرێ کە ناونیشانی بۆ زۆربەی شیعرەکانی داناوە، ئەمەش لەبەرهەمی شاعیرە کلاسیکیە کوردەکان نابینـدرێ و جۆرە داهێنان و نوێگەرییەکە.

دووەم: لەڕووی ناوەڕۆکەوە: موخلیس بەش بە حاڵی خۆی لەم مەبەستانەدا شیعری داناوە:

١- شیعری ئایینی.
٢- شیعری سۆفیانە.
٣- شیعری دڵداری.
٤- شیعری کۆمەڵایەتی.
٥- شیعری نیشتیمانی.
٦- شیعری وەسف.
٧- شیعری لاواندنەوە.
٨- شیعری پیاهەڵدان.
٩- شیعری چیرۆکی.
١٠- شیعری داشۆرین.

پلەی هونەری شیعرە ئایینی و سۆفیگەری و دڵداری و وەسفەکانی بەرزترە لەوانی دیکەی، چونکە جۆشی دەروونی زیاتر کاری تێکردووە و داڕشتنەکەی خەستتر بووە، ئەمەش دیاردەیەکە لای شاعیرانی دیکەش بەرچاو دەکەوێ. (لەبەشی سێیەمدا بەدرێژی لەم مەبەستانە دەدوێین).

# وێنەی شیعری لای موخلیس

ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە موخلیس شاگردێکی دڵسۆزی نالی و کوردی و حاجی و حەمدی و بێخود و حافز و سەعدی بووە، شیعرەکانیان کاریان لە کانی تەقیوی شیعری ئەو کردووە و وەستایانە سوودی لێیان وەرگرتووە. ئەو وێنە شیعرییە باوانەی کەلایان دووبارە بۆتەوە ئەمیش کاڵایەکی نوێی بەبەردا بڕیوە و بەدەست و مەقەست و دەرزییە وردیلانەکەی بەرگێکی ڕەنگینی بۆ بووکی شیعر ساز کردووە و بە سەلیقەی لێهاتووی لایەنە جوانکارییەکانی ڕەوانبێژی ئارایشتی ئەو بووکەی کردووە.

ئەمەش وانەبێ ئەوە بگەیەنێ "کەگوایە شاعیر کت و مت لاسایی چەند کەڵە شاعیرێکی وەکو: نالی، وەفایی، مەولەوی... کردۆتەوە و بەوانەوە چ وەک ناوەڕۆک و چ شێوەکارتێکراوە و شوێن پەنجەی شیعری ئەوانە بە سەرتاپای شیعرەکانیەوە دیارە".[1]

ئەم ڕایە بەگشتی بەسەر هەموو شاعیرەکاندا دەسەپێندرێ، بەڵام هەموو شتێ سنووری خۆی هەیە، خۆ ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە شاعیر ببێتە نوسخەی دووەمی ئەوان و کەسێتیی خۆی لەناو کەسێتی ئەواندا گوم بکات.

وەنەبێ هەرتەنیا بەوەی کە موخلیس "سەرلەنوێ هاتووە بەرگ و سیپاڵێکی نوێ و تازەی کردۆتەوە بەبەرداو.... دیارە بەمەش وێنە شیعرییەکان لەو حاڵەدا چۆتە ڕیزی شیعرە تازە و هاوچەرخەکانی شیعری کوردییەوە"[2]. موخلیس هەرچەندە گوێی بەزایەڵەی شیعری ئەوان زرینگاوەتەوە و دڵ و دەروونی پێ ئاوێزان کردووە، بەڵام دەنگ و ڕەنگی خۆی بزرنەکردووە و ئەویش لێوی بەنایەی شیعرەوە ناوەو و چەند ئاوازێکی وای لێداوە، کەدڵدارانی شیعر گەمارۆیان داوە، جۆرە هەڵپەرکێیەکی تایبەت بەخۆی پێکهێناوە.

---

(١) سوران مەحوی، وافی یان موخلیس، بەیان، ژمارە: ١٩٨٦،١٢٢، ل ٢١.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

ئێستاش وا بەپێی توانا بە چەند وێنەیەکی شیعری تازەی موخلیستان شاد دەکەم بەهیوای ئەوەی ئەگەر هەمووشی راستیی نەپێکابێ، ئەوا بەشی زۆری پێکابێ، ئەمەش وێنە شیعرییەکانە:

١- لەم بەیتەدا موخلیس سینگی خۆی دەکاتە ئێستگەی عەشقی یارەکەی و داوای لێدەکات بێت گوێی لێ بگرێت، مەبەست لە سینگیش دڵە و ناڵەی دڵە:

کە سینەم جێی ئیزاعەی عیشقی تۆیە
وەرە گوێ بگرە، چت گوێ لێ دەبیتن؟

٢- لەم بەیتەدا موخلیس نیشانی دەدا کە رێزی لای خەڵکی هەیە و ئەو رێزە بەوشەی بانق دەردەبڕێ، لەمەش گرنگتر عەشقی یارەکەشی بەبانق دەچوێنێ و ئەو لەو بانقەدا موفلیسە، کەواتە لەڕووی دونیاییەوە پلە و پایەی خۆی هەیە لای خەڵکی، بەڵام لای یارەکەی بێ نموودە و لەبانقی ئەودا چەکەکەی بێ نموودە:

لەبانقی خەلقی ساحێب ئیعتیمادم
لەبانقی عیشقی تۆ بێ ئیعتیبارم

٣- شاعیر ڕووی خۆشە چونکە یار بەرەو ڕووی پێکەنیە وکوڵم و زوڵفی یارەکەی بەشەکر و چا چوواندووە لە سپێتی و رەشێتیدا، ئەمە بۆ یەکەم جارە کوڵم و زوڵف لای شاعیران بە شەکر و چا دەربڕدرێت، لەلایەکی دیکەوە گرنگی شەکر و چا دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا، چونکە بەدەست کەم کەس دەکەوت:

بۆیە ئەوڕۆوا بەشووشم، یار بەرەو ڕووم پێکەنی
شەکر و چای پێدام، بەکوڵم و زوڵفەکەی پڕ شکەنی

٤- موخلیس کوڕی ناو کوردەوارییە و هەڵگری کولتوورەکەیەتی و دەیەوێ ئەو کولتوورە بخاتە بۆتەی شیعرەوەو وێنەی ڕەنگینی پێ بنەخشێنێ، کێ هەیە دەندە لاوازەکانی خۆی بەشەقڵەی بێ هەراش چوواندبێ موخلیس نەبێ، وێنەیەکی چەند جوانە و چ داهێنانێکی بێ وێنەیە:

من بەتەنیا غەم دەخۆم، غەم گۆشت و خوێنی من دەخوا

بۆیە یەك یەك دەندەکانم بووینە شەقڵەی بێ هەراش

٥- هەمدیسان موخلیس دەمانباتەوە ناو کۆڕ و یاریی کوردەواری و ئەمجارە سوود لە دامە و دار دەمە وەردەگرێ و بەرامبەر یارەکەی وەستاوە و وەك حەپەساو وایە و ناتوانێ بیگاتێ و ئۆینی بۆ نایێ، کەچی یارەکەی داش بەداشیشی لەگەڵ ناکاو هیچ گرنگیی پێ نادات و ناوڕیشی لێ ناداتەوە:

دڵ لەسەر داردامەیی عیشقت لە وەسڵی ئەو سوار

ئۆینی لۆ نایێ کەچی، ناشکا لەگەڵما داش بەداش

٦- جارێکی دیکەش شاعیر پەنا دەباتەوە بەر چای قورس و خوێنی خۆی پێدەچووێنی، سەیر لەوەدایە موخلیس خوێنی خۆی لەداخی دووریی یارەکەی فڕکردووە وایزانیوە چایەکی قورسی خواردۆتەوە، پاشان تێگەیشتووە چا نییە و خوێنی خۆیەتی:

چایەکی قورسم بەچاکە خواردەوە

پاشی زانیم خوێنی خۆمە، چانییە

٧- موخلیس لەم بەیتەدا هەناسەی خۆی بە دووکەڵی جغارە دەچوێنی، ئەو هەناسەی ئەو مەبەستیەتی مشتی خەم و خەفەتە، ئەوەی خەمباریش بێت قوم لەسەر قوم لە جغارە دەدات و بەرەو ئاسمان ئەو دووکەڵە هەوراز دەچێ و گێژ دەخوات، شاعیر لەواقیعی کۆمەڵگاکەی وێنە شیعرییەکان دەچنێت و لەم ڕووەوە داهێنەرە:

وەك جەننەتە ئەمڕۆکە لەبەر حۆری میسالان

هەڵدەستێ هەناسەم وەکو دووکەڵ لە جغارە

٨- شاعیر کوڕی کۆمەڵگاکەیەتی و لەو دەوروبەرە وێنە شیعرییەکان وەردەگرێت، کە چاوی بە تەبارە (کەگەنم و جۆ تەواو خشت گوڵ دەبن تەبارەیان پێدەگوترێ) دەکەوێ، هێندە جوان و ڕێك دێتە بەرچاوی بەزوڵفێکی شانەکراوی دەچوێنی لە

ڕێکیدا و له ڕەشیش بۆیه به زوڵفی دەچوێنێ چونکه تەبارەی جۆیه. کەواته وێنەکه له واقیع هەڵقوڵاوه و داهێنانی بیری خۆیەتی:

جۆی بۆ ڕەشی وەك خاڵه لەسەر ڕوومەتی لەیلا

وەك زوڵفەکی شانه بکرێ وایه تەباره

٩- ئەمجارەش موخلیس سەیری دیاردەیەکی سەردەمی خۆی دەکات که ئێستاش بەردەوامه و ئەویش دەرنەچوونی کرێچیه له خانوو، جا شاعیر سوودی لەم دیاردەیه وەرگرتووه و بۆ مەسەلەی دونیاپەرستی مەزراندوویەتی. هیچ شاعیرێ پێش موخلیس لێکچوواندنی واو وێنەی شیعری بەمجۆرەی دانەهێناوە:

وەك کرێ چی چۆن له خانوو ناچته دەر

دڵ که دونیای هاته نێو، ناڕواته دەر

١٠- لەم بەیتەدا شاعیر ڕووی دەمی لەبەرامبەرەکەی دەکات و تێمان دەگەیەنێ که نانی مزاشی ناوێ چونکه ڕەشەو جۆی تێکەڵه، بەڵام دیبی مزاشی دەوێ، واتا: بەویستی خۆی بنەماکانی دین دەگۆڕێ و پێی قایله، خۆ دەبوو پێچەوانه بووایه. کێ له پێش موخلیس دەربڕینی شیعری وایه داڕشتووه؟:

نایەوێ نانی مزاش و دەیەوێ دیبی مزاش

بۆچی وا دڵ ڕەشی چاوپان، ڕەشه ئینسانی چیه؟

١١- لەسەردەمی موخلیس دا تازه دەرِاسه پەیدا بووه و چووەته گژ تەبارەی دەغڵ و دان، موخلیس هاتووه لەم دیاردەیه وێنەیەکی شیعری داهێناوه و پارەکەی کردووەته شوفێر و دەرِاسەی زوڵم و زۆری له تەبارەی تەمەنی موخلیس بەرداوه، جا موخلیس هاواری لێهەستاوەو دەڵێ: ئەگەر تەمەنی خەدری زندەشم هەبێت زوو تەواو دەبێت،چونکه دەرِاسه وەکو داس نییه زوو کۆتایی بەتەباره دێنێ:

مەگینەی جەوری بەردایتە تەبارەی عومرمکەم دڵبەر

دەبێ گەر عومری خزریشم هەبێتن، هەر زوو کۆتابێ

ئەو وێنە شیعرییانەی کە لەبەشێکی دیوانی موخلیس دەرهێنراوە بەبڕوای لێکۆڵەر وێنەی شیعری تازەن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هەر ئەوەندە وێنە شیعرییە لەدیوانەکەیدا هەبێ، چونکە لێکۆڵینەوەکە لەسەر بەشێکی دیوانی شاعیرە بەناوی (باغی لاوان).

# موخلیس و شانازیکردن بەشیعرەکانی

موخلیسیش هەروەکو شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش سەردەمی خۆی شانازیی بە شیعرەکانی خۆی کردووە و بەدوڕوگەوهەر و یاقووت و توحفەی چوواندووە و هەندێ جار خۆی بەسوارچاکی ئەو مەیدانە زانیوە و لەزەنگینیدا خێری بە قاروون کردووە و لەکاریگەریشدا هارووت و مارووتی بەشاگردی خۆی زانیوە.

شاعیرە کلاسیکیەکانی پێش موخلیس بەگشتی ئەم شانازییەیان کردووە و خۆیان پێ هەڵکێشاوە، بۆ نموونە (مەلای جزیری) لەسەدەی حەڤدەمەوە گوتەیەتی:

گەر لوئلوئی مەنپوور ژ نەزمی تە دخوازی

وەر شیعری مەلێ بین تە ب شیراز چ حاجەت [1]

هەروەها نالی پێی وایە کەشیعری شاعیران ناگەنە پایەی شیعرەکانی ئەو لەناسکی و وردی:

شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی

کەی لەدیقەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا [2]

(مەحوی)ش بەهەمان شێوە خۆی هێناوەتە ڕیزی پاشاکانی فارس چونکە خاوەنی دیوانی شیعرە، واتا: چۆن پاشاکان خاوەنی دیوەخانن و خەڵکی لەسفرەیان دەخوات، ئاواش مەحوی خاوەنی دیوانی شیعرە و شاعیران تام و چێژی لێ وەردەگرن:

گەدایەکی وەکو (محوی) قەلەندەرێکی کورد

میثالی پادشەهی فورسە صاحێبی دیوان [3]

---

(١) العقد الجوهری فی شرح دیوان الجزری، ج ١، ملا احمد الزفنگی، ط ٢، مطبعة الصباح، ١٩٨٧، ص ١٢٩.

(٢) دیوانی نالی، مودەڕیس، کوڕی زانیاریی کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ١٠٧.

(٣) دیوانی مەحوی، مودەڕیس، چ٢، چاپخانەی ئوفسێتی حیسام، بەغدا ١٩٨٤، ل ٣٤٨.

نامەوێ بە دوور و درێژی بچمە ناو دیوانی شاعیرەکانەوە و هەر بەوەندە واز دێنم. ئێستاش دێینە سەر ئەو بەیتە شیعرانەی موخلیس کە شانازیکردن دەگەیەنن. لەبەرئەوەی بەیتەکان زۆرن لە چەند لایەنێکەوە دەیانخەینە ڕوو:

أ- لەبارەی سروشتی شیعریی شاعیرەوە: شاعیر لەکۆمەڵە بەیتێکدا بۆمان دەدەخات کەخاوەن سروشتێکی پاك و بەهێزی شیعرە و بە ئاسانی شیعری چاکمان بۆ دەهۆنێتەوە:

١- لەم بەیتەدا دەڵێ: موخلیس لە ڕواڵەت تۆ ئەزان و هەژاری، ئەو وشە جوانانە لە کێ دێن کە بەیتی شیعریان پێ دەهۆنیەوە:

لەبەرچاوان ئەتوو (موخلیس) ئەزانی

لەکوێ دێن ئەو قسانەی وا بەتامت

٢- وادیارە لەبەهاران موخلیس قەریحەی شیعری دەبێتەوە و گەر بێت و لەو وەرزە شیعر بنووسێ، شیعرەکانی هێندە بەرز دەبن لە ڕووی هونەرییەوە کە دەست بەدەست دەگەنە شاران:

گەر بەهاران تەبعی موخلیس، بێ غەزەل نووسی بکا

باقە باقەی شیعرەکانم، دەچتە شاران دەست بەدەست

٣- ئەمجارە موخلیس گوتەکانی خۆی بەزێر دادەنێ و نایەوێ بە پارەی قەڵپی بگۆڕێتەوە، واتا: بەشیعری خراپ:

قسەی وەك زێری قیمەتداری خۆت (موخلیس) بپارێزە

لەگەڵ پارەی قەڵپ تێکەڵ دەبیتن، مەیخە دەست سەراف

٤- لەم بەیتەدا شیعرەکانی موخلیس دوڕو مەرجانە و گەر ڕۆڵەکانی کورد تێی بگەن گیرفانیان پڕ دەکات:

موخلیسا گەر کورد موسەقەف بێت و ئەشعاریان بوێ

هەرچی کوردبی بەرك و کیسەی پڕ دوڕو مەرجان دەکەم

هەرکەسێ موژدەم بداتێ ئیشتمان ئازادبووە

باغەر و بەرگی لە ئەشعار پڕ دووڕ و مەرجان دەکەم

٥- سروشتی موخلیس وەك هەوری بەهاری کوردستان پڕ شیعر دەکات:

وەتەن پڕ گوڵ دەکا شیعرم کە بڕژێ
لەتەبعی هەروەکو هەوری بەهارم

٦- موخلیس خۆی لەشاعیرانی بۆتان و سۆران بەتواناتر دادەنێ و پێی وایە گوتەکانی لەم دوو ناوچەیە بەدەرناکەون:

قسەی ئەوهام بەجێهێشتووە لە بۆتان
پەیا نابێ لەسۆران و لە بۆتان

٧- وادیارە موخلیس لە دەوروبەری بێزار بووە و حەزی لەشیعر نووسین نەماوە، بەڵام ئەو شیعرەی کە داناوە لەسەر داواو هەوەسی هاوڕێیانە:

یەك زەڕە نەماوە هەوەس و مەیلی لە ئەشعار
ئەمما ئەمەیە توحفەیە بۆ کەیفی رەفیقان

٨- بەلای موخلیسەوە یار سەرچاوەی جۆش و خرۆشی کانیی شیعرە، بۆیە شیعرەکانی هێندە بەرزن:

دەست لەباڵای بەرزی یار هەڵناگرێ (موخلیس) بەدڵ
شیعرەکانی بۆیە مەعنای هێندە بەرز و ڕاقیە

٩- شاعیر هەرخۆی گلەیی لەخۆی دەکا و خۆی بەبێ سەرو سیما وەسف دەکا و داوا لەخۆی دەکات کە بەپێی سروشتی شیعر بدوێ، چونکە شیعرەکانی خۆراکی گیانە وناوی ژیانە:

موخلیسی بێ سەرو سیما بەتەبیعەت بدوێ
قووت و پاقووتە قسەی، ئاوی حەیاتە غەزەلی

١٠- هەرچەندە موخلیس لەڕواڵەت و جل و بەرگدا گەدایانە هەڵکەوتووە، بەڵام لەدڵدا خاوەنی دوڕ و گەوهەری شیعرە و هەر بەتەبع شیعر دۆستە:

موخلیسا گەرچی گەدا هەیئەتی لێك
لە دڵا خاوەنی دوڕو گەوهەری

پ- لەبارەی نەبوونی گوێگری شیعرەوە: هەروەك چۆن شاعیرانی دیکە گلەییان لەوە هەبوو کە کەس نیە گوێ لە شیعرەکانیان بگرێ و پەند و حیکمەت و چێژی شیعری لێ وەرگرن، موخلیسیش بەهەمان شێوە ئەم گلەییەی هەیە.

وادیارە ئەحمەدی خانی هەر لەو سەردەمەوە ئەم گلەییە دەکا و نەبوونی بازاڕی شعیر ڕادەگەیەنێ:

چ بکم کو قەوی کەسادە بازاڕ
نینن ژ قوماشڕا خەریدار
کەس ناکەتە مەیتەرێ خوە جامی
ڕاناگرتن کەسەك نیزامی (1)

هەر لەم بارەیەوە (نالی) دەڵێ:

عومرێکە بەمیزانی ئەدەب توحفە فرۆشم
زۆرم وت و کەس تێنەگەیی ئێستە خەمۆشم (2)

شاعیرەکان بەگشتی ئەم گلەییەیان لەسەردەمی خۆیان هەبووە، چونکە خوێنەری شیعرکەم بووە بەتایبەتی و خوێندەواریش کەم بووە بەگشتی، موخلیسیش وەکو ئەو شاعیرانە گلەیی خۆی دەکات:

1- شاعیر خۆی بەمەلەوانی دەریای شیعر دادەنێ و پێی وایە هەر جارێ خۆی نقوم بکات دوڕی شیعر دەردێنێ، بەڵام لەبەرئەوەی کڕیاری نیە داوا لەخۆی دەکات کە بەخامۆشی و کڕی دابنیشێ:

غەواسی فیکری (موخلیس) دوڕ دێنێتە دەر لەدەریا
کڕیاری وەك نەبیتن، دانیشە وەك خەمۆشان

---

(1) مەم وزین، چ1، ئەمینێ ئوسمان، مطبعة الجاحظ، بغداد، 1990، ل 56.
(2) دیوانی نالی، ل280.

٢- هەمیسان شاعیر گلەیی ئەدیەمنی خۆی دەکات کە نابووتە و جێی سەرنجی چاوان نییە، بەڵام گەر کڕیاری هەبێ قووت و یاقووتی شیعری پێیە:

گەرچی زاهیر هەیئەتێکی ڕووت و نابووتم هەیە
گەر خریدارم هەبێتن، قووت و یاقووتم هەیە
قوماشی مەعمەلی موخلیس، هەتا ئەوڕۆکە مومتاز بوو
لەبەر بێ ئیمتیازی خەلقی، بێ کڕیارە ئەوڕۆکە

٣- هەمیسان گلەیی لەنەبوونی کڕیاری یاقوتی شیعری خۆی دەکات و زۆر لەمێژە لەفرۆشتنی یاقووتی شیعردایە:

چ کەس ناپرسی یاقوتت بە چەندی
فرۆشیارم بەچاوان چەند لەمێژە

٤- ئەو کەسانەی کە لە حەقیقەتی شیعر دەگەن و شیعر و میعر لێك جودا دەکەنەوە، هەر بەیتە شیعرێکی بە دانە دوڕێ دەکڕێ. وادیارە کڕیاری نییە، بۆیە بەم جۆرە نیشانی داوە:

غەزەلی موخلیسی دڵ پڕ لەحە قایق وەکو ڕووح
هەرچی زەوقێکی هەبێ، بەیتی دەباتن بە دوڕێ

ج- لەبارەی بەراوردکردنی شیعرەکانی لەگەڵ شاعیراندا: شاعیرەکان بەگشتی شانازییان بە شیعری خۆیان کردووە و پێیان وابووە کەهاوتای نییە لەدونیای شیعردا، موخلیسیش بەهەمان شێوە پێی وایە کە غەزەلەکانی لەناو شاعیراندا تاکەو ئەوەی بەوردی سەیری بکا تێدەگا کەهاوشانیان نییە و سەرپشکن:

غەزەلی موخلیسی تۆ، وەك غەزەلی خەلقی نییە
چ قوماشێکی هەیە سەیری بکە مەعمەلی ما

هەروەها لەم ڕووەوە دەڵێت:

بە وردی هەرکەسێ بێت و تەماشای شیعری (موخلیس)کا
چ بەیتێکی لەکوردیدا بە شیعری شاعیران نادا

# موخلیس و شێوەزاری هەولێر

هەرچەندە موخلیس هەوڵی داوە کە بەزمانی شیعری نالی و کوردی و حاجی و حەمدی و بێخود بنووسێت و تارادەیەك شوێن پێیانی هەڵگرتووە، بەڵام نەیویستووە لە وشە و زاراوەی ناوچەی دەشتی هەولێر دەرباز بێ و کاری ئەدەبی سەرزای ئەو ناوچەیەی پێوە دیارە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە ڕەسەنایەتییەك دەگەیەنێ و زمانی ئەدەبی پێ دەوڵەمەند دەبێت.

لە لێکۆڵینەوەی شیعرەکاندا واتای ئەم وشانەی خوارەوە نووسراوە، بەڵام وام بەچاك زانی کەدووبارەواتاکانیان بنووسمەوەبو ئەوەی بەدیار بکەوێ کەشاعیر چەند پابەندی شێوەزارەکەی بووە.

| وشە | واتاکەی | وشە | واتاکەی |
| --- | --- | --- | --- |
| ئەوڕۆ | ئەمڕۆ | دەو | دەم |
| ئەتوو | تۆ | داکەسێ | وازبێنە |
| ئۆین | فێڵ- وردی لەیاریدا | دەزی | دەزوو |
| ئاوقەران | هاوڕێ | دورنە | درە و |
| بوار | بەهار | داندۆك | ترخێنە |
| بسك | زولف | رۆن | روون |
| بارەبان | باربەر | رووەت | ناوبانگ |
| بڕیار | بڕشت لەکشتوکاڵدا | زل | پووش |
| بەڕك | گیرفان | زێروو | زەروو |
| پەلکوپار | گەڵا | زەغەل | تەمبەڵ |

| وشە | واتاکەی | وشە | واتاکەی |
|---|---|---|---|
| | | سۆر | سوور |
| | | سایەدی | ئاگاداری |
| پەنگر | پشکۆ | سەیوان | چەتر |
| تیر | خەست | سوولاوکە | ئەوبۆڕیەی ئاوی بارانی |
| تاژی | تانجی | | پێدادێتە خوارەوە |
| تەبارە | گەنم وجۆدوای | ساتمە | هەڵنگاوتن |
| گوڵکردنی | | شەقڵە | داربۆدارەڕێی خانوو |
| جوون | جوێن | شەوین | مەڕلەومڕاندن بەشەو |
| چاردە | چواردە | شوقە | ژووری بووک |
| چشت | شت | | |
| خین | خوێن | | |
| خاپەرۆك | پاشماوەی خەرمان | | |
| خنخنۆك | قورگ | | |
| دەغومرێتن | ئارایشت دەدرێ | | |
| غورد | خوردبێتەو | | |
| قەلاش | بێ پارە وپوول | | |
| کەلەن | کەلێنەدرز | | |
| کەتە | پەککەوتە | | |
| کوو | چۆن | | |
| کەسك | سەوز | | |
| کۆخە | کۆکە | | |
| کلەنگوچك | فەقێیانە | | |
| کیز | کچ | | |

| وشە | واتاکەی | | |
|---|---|---|---|
| کۆر | کول | | |
| کەپنێ | کەی | | |
| گرژینەوە | خەندەبزە | | |
| گەروو | سەرمووەی شاخ | | |
| گچکە | بچووك | | |
| لاسەرە | پارچە خشڵێکی ژنانە لەلایەکی سەردەدرێ | | |
| لۆ | بۆ | | |
| لەودە | ئەوشوێنەی کای تێدەکرێ وخانوونییە | | |
| لەدوو | لەشوێن | | |
| مامز | ئاسك | | |
| ناجسن | نارەسەن | | |
| نەدیتکە | شت نەدیو | | |
| وەچ | کەڵك، سوود | | |
| هەراش | گەورە، زەل وپووش | | |
| هەوری | مشکی | | |
| هەرکەو | ئەو چاڵەی کەلەشاخداناوی بارانی تێدا کودەبێتەوە | | |
| هۆبە | رەشماڵی کۆچەر | | |

ئەم وشانەی نووسراون ژمارەیەکی کەمن لەوشەکانی شێوەزاری هەولێر و گەر هەموو شیعرەکانی بپشکنرێن چەندەها بەقەد ئەوەندەی تێدایە. بۆیە دەتوانین بڵێین یەکێ لەشێوازەکانی شیعری موخلیس هەبوونی ئەم وشانەیە لە شیعرەکاندا.

بۆ ئەوەی زیاتر شارەزاییمان لە هەندێ لەبوارەکانی شیعری موخلیس هەبێت، ئەوا بەنموونەوە ئاماژە بە چەند خاڵێکی دەکرێ.

موخلیس هەرچەندە کاریگەریی شاعیرانی دیکەی لەسەربووە و بەردەوامیی بزوتنەوە شیعرییەکەی بابان بووە، بەلام وەستایانە هەڵس و کەوتی کردووە و خۆی لەناو چاولێکەرییەکی کوێرانە نقوم نەکردووە و توانیویەتی لەسەردەمی خۆی ببێتە خاوەنی ڕەنگ و دەنگی خۆی و شێوازی تایبەت بەخۆی هەبێت.

یەکێك لە شێوازەکانی شیعری موخلیس بەکارهێنانی وشە و زاراوەی شێوەزاری هەولێرە، ئەم وشانە یەکجار زۆرن و لێرەدا تەنیا ئاماژە بەچەند وشەیەك دەکرێت و نموونەشی لەشیعری موخلیس بۆ دەهێنرێتەوە:

١- **وشەی حەرد:** شاعیر لە هەرشوێنێ ئاماژەی بەزەوی کردبێ، وشەی (حەرد)ی بەکارهێناوە، ئەمەش وشەیەکی باوی ناو کوردەواریی ناوچەی دەشتی هەولێرە و موخلیس نەبێ بە بەرچاوم نەکەوتووە کەس بەکاری هێنابێ، بۆیە دەشێ بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە شیعردا بەشێوازی شاعیر بزانرێت:

شەنگەبێری دوور نەبوون دەستکەن بە مەرِ دۆشی، کەچی

با لەسەر سەر بێرشوانی برد بە حەردی دا دەدا

هەروەها دەڵێ:

تۆزی رێگای کەس نەبوو نەیکاتە چاو

دامەنی نازی لەسەر حەرد وەك خشاند

لەو شیعرانەی لەدەستنووسەکەی مندان (١١) جاران ئەم وشەیەی بەکارهێناوە.

٢- **وشەی بوار:** شاعیر لەجیاتی بەهار وشەی بواری بەکارهێناوە و لەبەر ئەوەی شیعرەکانی موخلیس تەڕ و پاراون لەکۆی شیعرەکانیدا (٦٣) جار (بوار)ی بەکارهێناوە و ئەمەش بۆچوونەکەمان پشت ڕاست دەکاتەوە کەبەکارهێنانی ئەم وشەی ناو کوردەواری جۆری شێوازی شیعری موخلیس دەگەیەنێ:

وا لەزستانی جودایبم، وەرە بیکە بە بوار

بدە جامێ بەسەفا، بەو دلێ جام پەروەری ما

ساڵی بێ بوار کەس نەیبیستووە

چەند ساڵە بۆ من نایێ بوارت

٣- دووپاتکردنەوەی وشە لەبەیتدا: ئەم دووپاتکردنەوەیە دیاردەیەکی زەقی شیعرەکانی موخلیسە و مۆسیقایەکی تایبەتی بە شیعرەکان داوە و جۆرە جەختکردنێك دەگەیەنێت لەسەر ئەو وشانە.

پێوەنان نییە گەر بگوترێ چواریەکی بەیتەکانی شاعیر ئەم دووبارە کردنەوەیان تێدایە و زیاتر داڕشتنی دەربڕینە شیعرییەکانی توند و تۆڵ و چڕو پڕ کردووە، بۆ نموونە:

قوڕ پەیا بوو کەتنە نێو قوڕ تا دەلێنگان پێوەبوون

بەژن و باڵایان ببینە جێی بەبێ قوڕ یان نەما

بەر لەپەیدابوونی عالەم عاشقی خۆی بوو خودا

جۆشی عیشقی خۆی لەخۆی ویست خۆی بەخۆی پیشان بدا

ئیش کەویستی گەورەبی، باگەورەبی عەیبی نییە

ئیش کەویستی دابنیشی دابنیشی هیچ نەکا

٤- بەکارهێنانی جووت وشە: موخلیس لەبەکارهێنانی جووت وشەدا دەستێکی باڵای هەبووە و بەزەقی لەشیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە و ئەمەش بووەتە هێمایەکی دیاری شێوازی شیعرەکانی.

جووت وشەکانیش دوو جۆرن:

أ- جووت وشەی وەکو یەك: ئەو جووت وشانەن کە بەهۆی ناوگرێکەوە یان ئامرازێکی پەیوەندییەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە:

خۆشە دلبەر دابنیشی ڕوو بەڕووت

ساقی سادە، بیدی بادە تاق و جۆت

لەم بەیتەدا (ڕووبەڕووت) وەکو یەکن بەهۆی ئامرازی (بە) بەیەکەوە بەستراونەتەوە، (تاق و جۆت)یش جووت وشەیەکی جودان و بە (و) عەتف لێکدراون.

ب- جووت وشەی جودا، وشەکان جودان و بەهۆی ئامرازی پەیوەندییەوە پێك بەستراونەتەوە:

موخلیسا دانیشە بۆ خۆت بەتەنێ

بگرە گێی خۆت لە قسەی بێ سەروبەر

لێرەدا جووت وشەی (سەروبەر) جودان و لە ڕێگەی (و)ی عەتفەوە پێك بەستراونەتەوە. ئەم جووت وشانە گەلێ زۆرن و سەدان جووت وشە لەشیعرەکاندا هەن و لێرەدا جێگەیان نابێتەوە.

٥- بەکارهێنانی دیاردەی مجنح: واتا: دەرکەوتنی وشەیەك لە (صدر)ی بەیتەکە و بوونی بەسەروا لە (عجز)ی بەیتەکە. ئەم دیاردەیە لای موخلیس ڕوون و ئاشکرایە و پتر لە (١٠٠) شوێن بەرچاو دەکەوێت:

ئاوونیشانت ئەوێ تا بارەگای پیرۆزی یار

ڕووی ئەدامی یار هەتاکو ئاوونیشانم ئەبوو

تاکو گەنجێکی ئەفام بووم مەیلی پیرانم هەبوو

هەر کە پیری کەوتە سەر ڕووم مەیلی گەنجانم هەبوو

کە ساقی سادە دامەن هەڵدەکاتن

چ زەوقێکت دەداتێ ساقی ساقی

٦- ئەری و ئەرێ لەدوو وشەی لەدوای یەك (گباق سلبی): گەر سەیری شیعرەکانی موخلیس بکەی لە دەیەها شوێن جووت وشەیەکت دێتە بەرچاو کە ئەرێ و ئەرێنە و ریتم و مۆسیقایەکی پوختەی بە بەیتەکە بەخشیوە وەکو دیاردە و شێوازێکی شیعری شاعیر خۆیان نواندووە، بۆ نموونە:

بە دونیا دەداتن یاری، موخلیس

ئەبوون و بوونی دونیا بێ دەوامن

حەق لەلایان ناحەقە، ناحەق حەقە

ئاشکرایە وادەبینن چی دەکەن

لە هەندێ شوێنیش وشەکان لەدوای یەك نین و وشەیەك یان زیاتریان لەنێواندایە.

هەرکەسێکی دین و ئەخلاقی ئەبی

گفتوگۆشی با هەبی و چار بێ ئەبی

**٧-خوێندنەوەی پێچەوانە:** لە روخساری شیعرەکانی ئەوەمان نیشان دا کە موخلیس غەزەلێکی هەیە ئەگەر وشەکانی لەسەرەوە و بنەوەڕا بخوێنیەوە وەکو یەك دەردەچێت، بێگومان ئەمەش یەکێکە لە وردەکاری و دەستڕەنگینی و شێوازی شیعری موخلیس، شاعیر لە غەزەلێکی چواردە بەیتیدا ئەم شێوازەی بەکارهێناوە و لەکۆتایش کردوویەتیە مولەممەع و دوو بەیتی فارسی تێ ئاخنیوە:

موخلیس غەرەزی وەسڵە

وەسڵە غەرەزی موخلیس

نیشان بدە پێی ڕووی خۆت

ڕووی خۆت بدە پێی نیشان

# بەشی دووەم

- موخلیس و شاعیرەکانی پێش سەردەمی خۆی
- قوتابخانەکانی ئەدەبی بەراوردکاری
- موخلیس و خەیام
- موخلیس و سەعدی شیرازی
- موخلیس و حافز شیرازی
- موخلیس و رابیعەی عەدەویە
- موخلیس و شافیعی
- موخلیس و حەللاج
- موخلیس و شبلی
- موخلیس و ئیبن عەرەبی
- موخلیس و شاعیرە کلاسیکیەکانی کورد
- موخلیس و بابا تاهیری هەمەدانی
- موخلیس و نالی
- موخلیس و سالم
- موخلیس و مەلا وەسمان
- موخلیس و کوردی
- موخلیس و حاجی قادر
- موخلیس و شێخ رەزا
- موخلیس و مەحوی
- موخلیس و ئەدەب
- موخلیس و حەمدی
- موخلیس و کەمالی
- موخلیس و بێخود
- موخلیس و حەزین

# موخلیس و شاعیرەکانی
# پێش سەردەمی خۆی

ئـەم بەشـەیان دەکەوێتـە خانـە ئـەدەبی بەراوردکارییـەوە، چـونکە باسـی کاریگەربوونی موخلیس دەکات بەشاعیرە فارس و عەرەب و کوردەکانی پێش خۆی. کەواتە دەبێ لەپێشەوە کورتەیەکی ئەدەبی بەراوردکاری باس بکەین لە ئەوروپا و لەناو کورد، ئینجا بێینە سەر لایەنی کارەکی کارەکەمان.

## ئەدەبی بەراوردکاری:

زاراوەی ئەدەبی بەراوردکاری کەلە ئەدەبی کوردیدا بەکاردێت، یەکسەر وەرگێڕانی (الادب المقارن)ی عەرەبییە، عەرەبەکانیش لە زمانـەکانی ئەوروپییان وەرگرتـووە، لە فەرەنـسیدا (litterature Comparee)ی لـە ئینگلیـزی (Comparative Literature)، لە ئیسپانی (Litterature Comparae) بەکاردێت، لە زمانی فارسیش (ادب تطبیقی، طبقة بندي)ی بۆ دانراوە. - واتای ئەدەبی بەراورد لایەنێکی مێـژوویی دەگەیـەنێ، چـونکە باسـی لایەنـە لێکـچووەکانی ئـەدەبی جیهـانی دەکـات، هـەروەها باسـی پەیوەندییـە مێژوویـەکانی کـۆن و نـوێ دەکـا و لایـەنی کاریگـەریی دەستنیـشان دەکـات. بـەلای هەنـدێ لـە زانایـەکان گـەر نـاوی بنرابـا (مێـژووی بەراوردکردنی ئەدەبەکان) لە ئەدەبی بەراورد باشتر مەبەستی دەپێکا، یاخود (مێژووی ئـەدەبی بـەراورد)، بـەلام بـەناوی (ئـەدەبی بـەراورد) نـاوی دەرکـرد، چونکە سووك و ساناترە لەوانی دیکە.[1]

بۆ یەکـەم جـار رەخنـەگری فەرەنـسی (ڤیلمـان) لـە ١٨٢٧ لـە وانـەکانی لـە زانکـۆی سۆربۆن (بـەراوردکردنی ئـەدەبی)ی بـەکارهێناوە و لـەو بـاوەڕە بـووە کـە ئەمـە جـۆرە دزییـەکی ئـەدەبی هەمیـشەیە کـە لـەنێوان دەوڵەتانـدا ڕوودەدات. بـەلام ئـەم

---

(١) الادب المقارن، د. محمد غنيمي هلال، ص ٩/١٠.

بەراوردكردنی ئەدەبییە مەیدان و ئاسۆی لێكۆڵینەوەی زۆر لە دزییە ئەدەبییەكان فروانترە و لێكۆڵەری فەرەنسی (جۆن جاك ئەمپێر) باسی گرنگی مێژوویی ئەم لێكۆڵینەوەیەی كردووە و لە ١٩٣٢ لە سۆربۆن گوتوویەتی (ئەم لێكۆڵینەوە بەراوردكاریانەی ئەنجامی دەدەین، بەبێ ئەو لێكۆڵینەوانە مێژووی ئەدەب تەواو نابێ)[1].

ئەدەبی بەراوردكاری لە ئینگلتەرا بۆ سەرەتای حوكمی شاژن ڤیكتۆریا دەگەڕێتەوە، لەو كاتەدا (هنری هالام) كتێبێكی بلاوكردەوە بەناوی (پێشەكیەك بۆ لێكۆڵینەوەی ئەدەبی ئەوروپی لەسەدەی پازدەم و شازدەم و حەڤدەمدا). یەكەم كەس كە زاراوەی (ئەدەبی بەراوردكاری)ی لە ئینگلتەرا بەكارهێنا (ماتیۆ ئارنۆلد)بوو. ئارنۆلد داوای لێكۆڵینەوەی ئەدەب دەكات دوور لە هەموو كۆت و سنوورێك و گلەیی لە ئینگلتەرا دەكات كە لەم بوارەدا لە هەموو وڵاتە ئەوروپیەكانی دیكە دواكەوتووترە[2].

ئەدەبی بەراوردكاری لەڕووی زانستیەوە بریتییە لەو لێكۆڵینەوە ئەدەبیەی كە پیشەی ساغكردنەوەی كاریگەری ئەدەبیە لەنێوان میللەتاندا بەمەرجێ پەیوەندی مێژوویيان لەگەڵ یەكدی هەبێ. كەواتە ئەدەبی بەراوردكاری بەواتای كارتێكردن و وەرگرتن و پەرەسەندن دێت.

بەپێی قوتابخانەی فەرەنسی بنەماكانی ئەدەبی بەراوردكاری یاخود مەرجەكانی لەسەر ئەم خاڵانە بەندە:

١- **لایەنی مێژوویی:** پێویستە بسەلێندرێ كە پەیوەندی مێژوویی لەنێوان ئەو دوو میللەتانەدا هەبووە و جۆری پەیوەندییەكەش دیاری بكرێت.

٢- **لایەنی زمانی:** بەراوردكردنی ئەدەبی لەنێوان ئەدەبیاتی دوو زمانی جیاواز دەبێت.

٣- **لایەنی كاریگەری و كاتێكردن:** بۆ سەلماندنی خاڵی یەكەم و دووەم دەبێ ئەدەبیاتی میللەتێ كاریگەری بەسەر ئەدەبیاتی ئەوی دیكەدا هەبێ. چونكە جاری وا هەیە پەیوەندی مێژوویی هەبووە و زمانەكەش جودا بووە، بەڵام كاریگەری و كارتێكردن ڕووی نەداوە.

---

(١) الادب المقارن، د. محمد غنيمي هلال، ل. ١١

(٢) مجلة عالم الفكر، المجلد/١١، العدد/١٩٨٠،٣، ص ٢٩.

# قوتابخانەکانی ئەدەبی بەراوردکاری

ئـەدەبی بـەراوردکاری لەئـەنجامی پەرەسـەندنی ڕەخنـەی ئـەدەبی و مێـژوویی ئەدەبیـەوە پەیـدابووە و لەسـەرەتاکانی سـەدەی بیـستەم وەکـو زانـستێکی سـەربەخۆ ناسراوە و بنەماو پرۆگرامی تایبەتی خۆی هەبووە.

تا ئێستا سێ قوتابخانەی ئەدەبی بەراوردکاری لە جیهاندا پەیدابووە کە ئەمانەن:

١- قوتابخانەی فەرەنسی

٢- قوتابخانەی ئەمریکی

٣- قوتابخانەی سلافی (روسی، دیالەکتیکی)

قوتابخانـەی فەرەنـسی تاماوەیـەکی زۆر یەکـەم قوتابخانـە بـووە لەجیهانـدا و هـەر خۆی میرکوڕی مەیدانی لێکۆڵینەوە بەراوردکاریەکان بووە، بەڵام بنەما وشك و تونـد و تیـژەکانی بوونەتـە هـۆی پەیـدا بـوونی قوتابخانـەی دیکـە و مەیـدانی لێکۆڵینـەوەی بەراوردکاری زیاتر فراوان بووە و گەشەی کرد.

بێگومان قوتابخانـەی ئـەمریکی و سلافی لەسـەر بنـەماکانی قوتابخانـەی فەرەنـسی پەیدابوون لەگەڵ هەندێ جیـاوازی.کەواتـە لـە هەنـدێ خـاڵ لێکـچوون و لـە هەنـدێکی کەش جیاوازن.

**(لایەنی لێکچوونی قوتابخانەکان)**

١- هەرسێ قوتابخانەکان سنووری نەتەوەیی دەبەزێنن

٢- هەرسێ قوتابخانەکان مەرجی تایبەتی بۆ لێکۆڵـەری ئـەدەبی بـەراوردکاری دادەنـێن، لەوانەش: ڕۆشنبیری و ئەمانـەتی زانستی و دەستپاکی[1].

---

(١) دراسات في الادب المقارن التطبيقي، د. داود سلوم، ص ١٥ /١٦.

٣- هەموویان کار بۆ بەجیهانبوونی ئەدەب دەکەن و لەبەرژەوەندیی میللەتەکانی خۆیاندان[1].

٤- هەرسێکیان بابەتەکانی ئەدەبی نووسراو و نەنووسراو دەخەنە ناوخانەی ئەدەبی بەراوردکارییەوە.

(لایەنی جیاوازی قوتابخانەکان)

١- ڕێبازی لێکۆڵینەوەی قوتابخانەی فەرەنسی متمانە دەکاتە سەر لایەنی مێژوویی، بەڵام قوتابخانەی سلاڤی پشت بەهۆکارە ناوخۆییەکان دەبەستێ و لایەنێکی سەرخانی کۆمەڵە[2].

٢- قوتابخانەی فەرەنسی گرنگی بەلایەنی پەیوەندیی نێوان دوو ئەدەب و کارتێکردنی یەکێك لەوی دیکە دەدات، بەڵام قوتابخانەی ئەمریکی بایەخ بە پەیوەندییەکان نادات و قوتابخانەی سلاڤیش گرنگی بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەدات[3].

٣- قوتابخانەی فەرەنسی مەرجی جیاوازی زمان دادەنێ، بەڵام هەردوو قوتابخانەکانی دیکە ئەمە بە مەرج نازانن[4].

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە هەموو لێکچوونێك ناکەوێتە خانەی ئەدەبی بەراوردکارییەوە، جا بەپێی بۆچوونی هەر قوتابخانەیەك بێت، چونکە لەوانەیە دوو ئەدیب لە دوو شوێنی جیاواز بەیەك جۆر بیریان کردبێتەوە، بۆیە بەمە دەگوترێ یەکبیری (توارد الخواگر)، چونکە بەلای هەندێ لە زانایەکان هەموو دەقێك بریتییە لە ناوێتەبوونی دەقی دیکە، یاخود هەموو دەقێك وەرگێڕانی چەند دەقێکی دیکەیە.

(ئەدەبی بەراوردکاری لای کورد)

ئەدەبی کوردی بەدرێژایی مێژوو کاریگەری ئەدەبیاتی دەوروبەری لەسەر بووە، چونکە لە زووەوە کورد ژێر دەستە بووە و بەزمانی ئەو میللەتانەی خوێندووە کە

---

(١) الادب المقارن غنيمي هلال، ص ٢٩.

(٢) الادب المقارن، د. عبده عبود، ص ٢٦.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥

(٤) الادب المقارن، غنيمي هلال، ص ٩.

حوکمیان کردووە. هەرسێ میللەتی فارس و عەرەب و تورك حوکمی کوردیان کردووە، بۆیە دەبینین بە پلەی یەکەم ئەدەبی فارسی و بە پلەی دووەم ئەدەبی عەرەبی و بەپلەی سێیەم ئەدەبی تورکی کاریگەرییان بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا هەبووە لەڕووی روخسار و ناوەڕۆکەوە.

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەراودکاری لەناو کورددا گرنگییەکی زۆری پێ نەدراوە بەتەواوی شێوەی زانستی خۆی وەرنەگرتووە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم لایەنە فەرامۆش کراوە، بەڵکو تاك و تەرا ناوڕی لێ دراوەتەوە.

لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبی بەراوردکاری لە ئەدەبیاتی کوردیدا سەرەتا بەشێوەیەکی سادە بووە و بریتی بووە لە ئاماژە پێکردن و پێشەکی کتێب و وتار و بەشێك لە کتێب(1).

یەکەم سەرچاوە لەڕووی تیۆرییەوە کتێبەکەی عەزیز گەردییە بەناوی (ئەدەبی بەراوردکاری) و لەکۆتاییدا باسی لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبی بەراوردکاریی کوردی کردووە و کردوویەتیە سێ بەش:

١- سەرەتەڵەم

٢- باسی نازانستی

٣- باسی زانستی

لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبی بەراوردکاری کوردی تا سەرەتای ساڵانی نەوەت بەپێی قوتابخانەی فەرەنسی بووە جگە لە هەندێ بەراوردی عەلائەدین سەجادی کە لە کتێبەکەی (مێژووی ئەدەبی کوردی) ئەنجامی داوە بەپێی قوتابخانەی سلافییە. سەجادی کوردی بەراوردکردووە لەگەڵ میللەتەکانی دیکە لەبواری ئەدەبی سەرزارەکییەوە و هەندێ لایەنی لێکچوونی دەستنیشانکردووە.

لێشتان ناشارمەوە ئەم بەراوردەی منیش دەیکەم هەر بەپێی پرۆگرامی قوتابخانەی فەرەنسییە و متمانە دەکاتە سەر لایەنی مێژوویی و جیاوازی زمان و کاریگەری و کارتێکردنی نێوان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی فارسی و عەرەبی و تورکی.

---

(١) ئەدەبی بەراوردکاری، عەزیز گەردی، ل ١١٢.

# موخلیس و شاعیره کلاسیکیەکان

هەروەکو لە بەشی یەکەم باسکرا کە موخلیس کاریگەری خەیام و سەعدی و حافزو نالی و سالی سنە و کوردی و حەمدی و حاجی و بێخود و حەزینی لەسەرە و زۆر بەجوانی لەسەر ڕێبازیان ڕۆیشتووەوهونەرە شیعرییەکانیانی بەشێوە یەکی تازەتر دارشتووە.

موخلیس وەکو هەموو مەلایەکی کورد لە حوجرە خوێندوویەتی و لەو خوێندنەش سەرەڕای زانستە ئیسلامیەکان لە هەندێ حوجرەکان ئەدەبیاتی فارسیش دەخوێندرا بەتایبەتی بەرهەمەکانی سەعدی و حافز و مەولانای رۆمی. کەواتە لەم روانگەیەوە مەلایانی کورد بەتایبەتی شاعیرەکانیان تام و چێژێکی زۆریان لەم بەرهەمە فارسیانە وەردەگرت و ئەو کاریگەریە لەبەرهەمە شیعرییەکانیان رەنگی دەدایەوە.

لەو بەراوردانەی لێرە ئەنجام دەدرێن هەموو مەرجەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەراوردکاری بەپێی قوتابخانەی فەرەنسی دێتە دی.

لەرووی مێژووییەوە کورد پەیوەند یی لەگەڵ هەرسێ میللەتی فارس و عەرەب و تورك هەبووە و زمانەکەشی لەگەڵ زمانی ئەوانە جودایە و لایەنی کاریگەری و کارتێکردنیش رووی داوە و موخلیس خۆی دانی پێداناوە کەسەعدی و حافز کاریان تێی کردووە. هەروەها لەبەیتە شیعرێکدا بە ئاشکرا دان بەم کاریگەریە دەنێ و دەڵێت:

بۆ غەزەل ئوستادی (موخلیس)، حافزی شیرازییە

هەر زەمان بۆ شاعیرێکە، هەرسەدایێ هات، چوو

هەروەها لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێ: لە فارسیدا حافز و سەعدی شیرازی کاریان

کردۆتـە سـەر شیعرەکانم[١]. بـەڵام لـەبارەی خەیامـەوە (محمـد)ی کـوڕی شـاعیر گـوتی: باوکم زۆر جاران چوارینەکانی خەیامی دەخوێندەوە و کاریان لەچوارینەکانی کردووە. ئەوەی راستی بێ لەبەر ئـەوەی چوارینەکانی خـەیام زۆربـەی بـریتین لـە سەرسـوڕمان بەرامبەر رازەکانی پەیدابوونی سروشت و دڵگران بوون بۆ چارەنووسی لێڵی ئادەمیزاد، بۆیـە مەلایـە شـاعیرەکانمان زۆر ئاوڕیـان لـە خـەیام نەداوەتـەوە، بـەڵام مـوخلیس بەچاوێکی وردبینانەتر سەیری خەیامی کردووە و هەوێنی شیعری لێ وەرگرتووە.

ئێستاش بـەگوێرەی سـەردەمی شاعیرە فارسـەکان دەست بـە بـەراوردە ئەدەبیەکە دەکەین.

---

(١) جەلال سنجاوی، مامۆستا خەلیل موخلیس وەلامی چوار پرسیار دەداتەوە، هاوکاری /١٩٧٤، ٢٣٢، ل٦.

# موخلیس و خەیام (*)

ئەو بەیتە شیعرانەی موخلیس کە کاریگەریی خەیامیان بەسەرەوەیە دوو بەشن، لەهەندێکیاندا موخلیس بەشێك لە بەیتەکەی وەرگێڕاوە و بەشەکەی دیکەشی بیرۆکەی وەرگرتووە و دایڕشتۆتەوە، لە هەندێکیانیش تەنیا بیرۆکەکەی وەرگرتووە و فراوانی کردووە. ئێستاش وا نموونەکان دەخرێنە ڕوو.

١- وەرگێڕان و وەرگرتنی بیرۆکە:

موخلیس:

عاشقی ڕۆژی ئەزە ل گەبرو موسڵمان و یەهوود

وا لەدەرگا بەتەمای خیلعەت و دیداری تەیە / دەستنووس/١٠٢

خەیام:

در صومعه و مدرسه و دیر و کنشت

ترسنده دوزخند و جویای بهشت / رباعیات خیام، ص٤٨

واتا: ئەوانەی لە حوجرە و دێر و کەنیسە خواپەرستی دەکەن، هەموویان لە ترسی ڕزگاربوون لە دۆزەخ و چوونە ناو بەهەشت خوا دەپەرستن.

لێرەدا (گەبر، موسڵمان، یەهوود) پەیوەندیان لەگەڵ (مدرسه، دیر، کنشت) هەیە. بە هەشتیش لە فارسییەکە بەرامبەر (خیلعەت، دیداری تەیە)، ئەمە وەرگێڕانێکی بە دەستکارییەوەیە و شاعیر لە چەمکی بەیتەکەی خەیام نەچۆتە دەرەوە و بیرۆکەشی لێی وەرگرتووە.

---

(*) خەیام: ناوی عومەرەونازناوی غیاسول دینەوباوکی ناوی ئیبراهیمەو بەخەیام ناو بانگی دەرکردووە. لەبارەی لەدایکبوونی هیچ لەبەردەست نییە و هەر ئەوەندەیەکە لە ٤٦٧ ك لەسەردەمی مەلەکشای سەلجوقی زیندووبووە.رباعیات خیام، از روی نسخه محمد علی فروغی، انتشارات ربیع،١٣٧٣، ص ١١/٩.

موخلیس:

نە بە ساڵ و نەبە مانگ و نەبە ڕۆژو نە بەشەو

نییە تێربوون لە ویساڵت، هەموو لای من دەمەکە / دەستنووس، ١٠٤

خەیام:

عاشق باید کە سال و ماه و شب و روز

ارام و قرار و خورد خوابش نبود /رباعیات خیام، ص ٩٧

واتە: پێویستە عاشق بە ساڵ و مانگ و شەو و ڕۆژ ئارام و خواردن و خەوی نەبێت.

نیوەبەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێڕانی نیوە بەیتی یەکەمی خەیامە، نیوە بەیتی دووەم بیرۆکەی وەرگرتووە لەجیاتی ئەوەی بڵێ:

ئارام و خواردن و خەوم نییە گوتوویەتی: لە پێک گەیشتنت تێرنابم، تێر نەبوونیش جۆرە بێ ئارامییەکە.

موخلیس:

لەکونجی مەدرەسە گەنجیم بەسەربرد

کە پیربووم رووم لە مەیخانە و لە پیرکرد / دەستنووس، ٣٣

پێم لەنێو مەیخانەدانا گەیمە نێو جاه و جەلال

تاله نێو مەدرەسە بووم قەلبێکی وێرانم هەبوو / دەستنووس، ١٠٢

خەیام:

باشد کە درون میکدە دریابیم

ان عمر کەدر مدرسها گم کردیم / رباعیات خیام، ص١٤٢

واتا: دوای ئەوەی ئەو تەمەنەی کە لە قوتابخانەکان گومم کرد، دەبێ لەمەودوا لەناو مەیخانەدا دەربکەوم.

نیوە بەیتی یەکەمی موخلیس جۆرە وەرگێڕانێکی نیوە بەیتی دووەمی خەیامە، نیوە بەیتەکەی دیکەش بیرۆکەکەی وەرگرتووە و مەیخانە لە هەردووکیان دووبارە بۆتەوە و موخلیس (پیر)یشی بۆ زیاد کردووە. لێرەدا موخلیس بەیتەکە بەرەو

سۆفیگەری دەبا و مەیخانە و پیر لای ئەو خانەقا و شێخە، بەڵام خەیام کە (میکدە)ی بەکارهێناوە زیاتر لە مەیخانەی ئاسایی دەچێت.

هەروەها لەبەیتی دووەمی موخلیس مەیخانە دووبارە بۆتەوە و دڵی لە قوتابخانە وێران بووە، جا وێرانبوونی دڵ و تەمەن ڕابواردن و گومکردن یەکدەگرنەوە. ئەم دوو بەیتەی لە غەزەلێکی سەربەخۆ وەرگیراوە.

## ٢- وەرگرتنی بیرۆکە:

کارتێکردنی خەیام لەسەر موخلیس زیاتر وەرگرتنی بیرۆکەیە و موخلیس وەریگرتووە و بەکوردییەکی ڕەوان دایڕشتۆتەوە، لەم بەراوردەدا چەند بەیتێ بۆنموونە دەستنیشان دەکرێت کەنموونەی خەروارێکن.

موخلیس:

بەهاربێ و جەژنە بێ و جەژنانە مەی بێ و یار بەرابەر بێ

غەریبە وشکە سۆفی گەر وەکو من تۆبە نەشکێنێ /دەستنووس، ١١٠

خەیام:

تو توبە مکن ازمی اگرت می باشد

صد توبە نادمات در پی باشد

گل جامەدران و بلبلان نالەزنان

دروقت چنین تو بەرواکی باشد/ رباعیات خیام، ص٨٥

واتا: لەمەی تۆبە مەکە ئەگەر بیبتەمەی، چونکە لە ئەنجامدا سەد جار پەشیمان دەبیەوە، لەوکاتەی گوڵ یەخەی دەکرێتەوە بولبولەکانی دەناڵێنن تۆبە کردن کەی ڕەوایە؟!

موخلیس زۆر بەوردی بیرۆکەی چوارینەکەی خەیامی وەرگرتووە لە تاکە بەیتێکدا کۆی کردۆتەوە، موخلیس باسی بەهار دەکات کە بەرامبەر (گل جامەدران و بلبلان ونالە زنان)ە، ئەمجارە باسی تۆبە شکاندن دەکات خەیام ناڕاستەوخۆ دەڵێ: چۆن تۆبە

نەشكێنم (در وقت چنین توبە رواكی باشد)، بەلام موخلیس یەكسەر دەڵێ: (غەریبە وشكە سۆڤی گەر وەكو من تۆبە نەشكێنێ).

موخلیس:

زۆر بەسیتە چاوەكەم ئەسلی ژیان

نایەوێ چیتر بە غەیری ئاو و نان

من كە نان و ئاو ژیانم راگرن

بۆ ژیان بۆ بچمە ژێر باری گران /دەستنووس،٩٧

خەیام:

یك نان بدو روز اگر شود حاصل مرد

وز كوزه شكسته ابی دمی ابی سرد

مخدوم كم از خودی چرا باید برد

یاخدمت چون خودی چرا باید كرد / رباعیات خیام، ص١١٠

واتا: ئەگەر پیاو بە دوو رۆژان نانێكی دەستكەوێ و لەگۆزە یەكی شكاو قومە ئاوێك بەدەست بێنێ، بۆچی خزمەتی یەكێكی لەخۆی كەمتر بكات، یا بۆچی خزمەتی یەكێكی وەكو خۆی بكات.

موخلیس وەستایانە وشەی (نان و ئاوی) لە خەیام وەرگرتووە و دوو بەیتەكەی پێ رازاندۆتەوە و فەلسەفەی ژیانی لەسەر بنیاتناوە و ئامۆژ گاری خەڵكی دەكات كە خۆ نەخەنە ژێر باری گرانی ژیان و قنیات بەنان و ئاو بكەن، موخلیس ناڕاستەوخۆ وەكو خەیام دەڵێ: بۆچی خزمەتی لەخۆم كەمتر بكەم و بەچوونە ژێر باری گران دەری دەبڕێت.

موخلیس:

حاسیلی مەزرەعەیی كەون و مەكان هەر ج نییە

ساقیا مەی بێ كە ئەسبابی ژیان هەر ج نییە/ دەستنووس، ١٠٥

خەیام:

مى خور كه بكس عمر دوباره ندهند

هركس كه شد از جهان نم ايد باز/رباعيات خيام، ص١١٩

واتا: پێك هەڵدە چونكە دووبارە تەمەن بەكەس نادرێتەوە و هەر كەسێ لە جیهان دەرچوو ناگەڕێتەوە. خەیام تەنیا باسی تەمەنی كردووە، كە ڕۆیشت ناگەڕێتەوە، بۆیە تەمەنەكەی بە هەل بزانێ و خۆی مەست بكات. بەڵام موخلیس مەیدانەكەی فراوانكردووە و هەموو گەردوونی گرتۆتەوە و گەیشتۆووەتە ئەو قەناعەتەی كە لەكێڵگەی گەردوون چیی دەستناكەوێ و دەبێ بەجێی بێڵێت، بۆیە داوای مەی لەساقی دەكات. ئەو مەیەی كە موخلیس داوای دەكات لەوەی خەیام جودایە و مەیێكی خانەقایە و دەیەوێ پێی بەرەو جیهانی باڵا هەڵكشێت.

موخلیس:

نابێ مەیلی دوو جیهان بێتە دڵی عاشق چ دەم

غەیری عەشقی تۆ دەبێ باقی بەفانی تێبگا

گەر تەماشای دەفتەری ڕۆژی ئەزەل كەی تێدەگەی

تاعەت و مەی، مەسجید و مەیخانە عەینی قیسمەتە

مەسجید و دێر و كلێسا هەموو جێی عاشقییە

چی هەیە نەقش و نیگار و دەرو دیواری تەیە/١٠٧

خەیام:

هفتادو دوملت دردین كم و بیش

ازملتها عشق تو دارم درپیش

چ كفر و چه اسلام و چ گاعت و چه گناه

مقصود تونی بهانه بردار ز پیش/رباعیات خیام/١٢٨

واتا: لەو حەفتاو دوو گرووپەی كە لە ئایین پەیدا دەبن، لەناو ئەو هەمووانە من عەشقی تۆم گەرەكە، چ گاوری و چ ئیسلام و چ خواپەرستی و چ گوناه مەبەست لەوانە هەمووی تۆیە و بەس. خەیام مەبەستی ئەومیە بڵێ: گاور و جوولەكە و موسڵمان

هەموویان خوا دەپەرستن، بەڵام ئەو خوایەی کە دەیپەرستن خود و سیفەتەکانی لەیەکتری جودان، هەورەکو ئیبن عەرەبی دەڵێت: (ان الله یعبد علی درجات متفاوته کل حسب ایمانه و معتقده و دینه)[1]، هەروەها حەللاج لە بەیتە شیعرێکدا دەڵێت:

عقد الخلائق في الاله عقائدا

وانا اعتقدت جمیع ما عقدوه[2]

بەیتی یەکەمی موخلیس هەمان بیرۆکەی یەکەمی خەیامی تێدایە کە هەردووکیان لەم جیهانەدا تەنیا مەبەستیان عەشقی خوایە و لەو پێناوەدا هەوڵ دەدەن، بەیتی دووەم و سێیەمی موخلیس لەگەڵ بەیتی دووەمی خەیام یەك دەگرنەوە و لەچوارچێوەی یەکێتی ئایینەکان (وحده الادیان) دێن و دەچن و هەدردووکیان لەو باوەڕەن کە گاور و موسڵمان لەشوێنە پیرۆزەکانیان خودا دەپەرستن، لێرەدا موخلیسیش وەکو خەیام بیردەکاتەوە و بەرە و سۆفیگەری جیهانی (کۆزمۆسی) هەنگاو دەنێت.

موخلیس:

من وەتی هاتوویمە دونیا راحەتی قەلبم نییە

هەر غەمێك تیرێکە دێتن جەرگمی پێ لەت لەتە

من لەدونیا تێگەیشتوومە سەراسەر هەر غەمە

تێم بگەیەنە تۆ لە دونیا چۆن دەگەی؟ چی لەزەتە؟ ١٠٨/٩

خەیام:

چون حاصل ادمی درین شورستان

جزخوردن غصه نیست تاکندن جان

خرم دل انکه زین جیهان زود برفت

وه اسوده کسی که خو دنیا مد به جهان رباعیات خیام، ص١٢٨

واتا: دەسکەوتی مرۆڤ لەم خاکە شۆرەکاتە لەخەم خواردن زیاتر نییە تا گیان کێشانی، دلشاد ئەو کەسەیە کە لەم جیهانە زوو بڕوات و ناسوودە ئەو کەسەیە کە هەر نەهاتۆتە جیهان.

---

(١) الفلسفة الصوفية في الاسلام، د. عبدالقادر محمود، ص ٥١٧.

(٢) ديوان الحلاج، ط٢، د. كامل مصطفى الشيبي، ص ٩.

موخلیس تەنیا بیرۆکەی خەمخواردنی جیهانی وەرگرتووە و دوو بەیتە شیعری پێ دارشتووە، بەڵام بۆچوونەکەی خەیام فەلسەفیانەترە و دوورتر رۆیشتووە، هەردووکیان لەو باوەڕەن کە ژیان هەمووی هەر خەمە و تا لە جیهان بن هەر خەم نابڕێتەوە، موخلیس دەڵێ (سەراسەر هەر غەمە)، خەیامیش دەڵێ: (جز خوردن غصه نیست..).

# موخلیس و سەعدی شیرازی (*)

موخلیس یەکێکە لەو شاعیرانەی کە شیعرەکانی سەعدی شیرازی کاری تێی کردووە و خۆی لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا دان بەم کارتێکردنە دەنێ و دەڵێت: (لەو شاعیرانەی کە بەدڵمە و کاریان کردۆتە سەر شیعرەکانم، سەعدی شیرازی و حافزی شیرازییە)[1]، بەڵام عەلی فەتاح دزەیی بە پێچەوانەی ئەمە بیر دەکاتەوە و لەو باوەڕەیە (کەئەو شاعیرانە کارێکی تایبەتییان لە تەبعی شیعری ئەودا نەکردووە)[2]، ئەمە بۆچوونی خۆیەتی و موخلیس خۆی دان بەم کارتێکردنەدا دەنێت. کەواتە گومان لەوەدا نەما کە موخلیس کاریگەریی سەعدی شیرازی بەسەرەوەیە و کاریگەریەکەش تەنیا وەرگرتنی بیرۆکەیەو نەگەیشتۆتە ئاستی وەرگێڕان. لێرە بەدواوە ئاماژە بە بەیتە لێکچووەکان دەکرێ و ئاستەکانیان دەستنیشان دەکرێت.

موخلیس:

گەوهەری عەشق و تەبیعەت پەروەری رێك ناکەون

گوڵ لەجێگای شۆڕەکات قەت ناڕوێ و هەڵناکەوێ / دەستنووس، ١٠٨

سەعدی:

زمین شوره سنبل بر نیارد

دروتخم و عمل چایع مگردان /کلیات سعدی/ ٨١

---

(*) سەعدی: موشریفەدین موسلیح کوڕی عەبدوڵڵای سەعەدی شیرازی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە شیعر و پەخشانی فارسیی گەیاندۆتە بەرزترین پلەی رەوانی و رەوانبێژی، لە ٥٨٥ ك لە دایکبووە و لەنێوان ساڵانی ٦٩١ك - ١٢٩١ع/ ٦٩٤ك - ١٢٩٤ع مردووە. دووبەرهەمی بە ناوبانگی لەدوا بەجێماوە گولستان و بوستان. د. رجا زاده شفق، تاریخ ادبیات ایران، تهران ١٩٤١، ص ٢٦٣.

(١) جەلال سنجاوی، ل ٦.

(٢) عەلی فەتاح دزەیی، سێ گوڵ لەباغی لاوانەوە، کاروان، ژمارە/٣٨، ل٥٠.

واتا: خاکی شۆرەکات گوڵەکەی بەرنادات، تۆ و ماندووبوون لەو خاکەدا بەفیڕۆ مەدە.

موخلیس بیرۆکەی (خاکی شۆرەکات)ی وەرگرتووە وەك سەعدی لەو باوەڕەدایە کە ئەو جۆرە خاکە بەرهەمی نابێت. موخلیس جگە لەمەش مەیدانی بیرۆکەکەی فراوان کردووە و (گەوهەری عەشق) و (تەبیعەت پەروەری) لەگەڵ (گوڵ) و (جێگای شۆرەکات) بەراورد کردووە و عەشقەکەی بە گوڵ چواندووە و تەبیعەتەکەشی بە جێگای شۆرەکات، کەواتە ئەم دوو دوانەیە (پنائیە) دژی یەکترین و بەیەکەوە هەڵناکەن.

موخلیس:

واعیز و سامعی لاسار مونتەفیع نین بە وەعز

تیغ ئەگەر ئاسنی خراپ بوو، نەفعی بۆ نادا هەسان /دەستنووس، ٩٨

سەعدی:

شمشیر نیك از اهن بد چون کند کسی

ناکس به تربیت نشود ای حکیم کس / کلیات سعدی، ٨١

واتا: چۆن کەسێ شمشێری چاك لە ئاسنی خراپ دروست دەکات؟! ئەی زانا، ناکەس لە ڕێگەی پەروەردەوە نابێتە کەس.

لێرەدا شاعیر تەنیا بیرۆکەکەی لە سەعدی وەرگرتووە و لەجێی شمشێر تیغی بەکار هێناوە و هەمان بۆچوونی ئەوی دووبارە کردۆتەوە، هەروەها (واعیز و سامیعی لاسار)یشی لەگەڵ (ناکس)ەکەی سەعدی بەرامبەر کردووە، چۆن ناکەسەکە بە پەروەردە چاك نابێت ئاواش واعیز و گوێگری لاسار سوود لە وەعز وەرناگرن.

موخلیس:

فیکری نێو چوونە جەهەننەم هاتە نێو خانەی خەیاڵ

وەك لەکونجی مەدرەسە ڕووم کردە نێو ماڵ و منداڵ

هەرکەسێ عەقڵی هەبێ قەت خۆی وەکو من لێ نەکا

زۆر موناڤینە لەگەڵ یەك کەسبی عیلم و کەسبی ماڵ/٧٨

سەعدی:

ای گرفتار پای بند عیال

دیگر اسودگی مبند خیال

غم فرزند و نان و جامه و قوت

بازت اردز سیردر ملکوت / کلیات سعدی، ۱۳۲

واتـا: ئـەی ئـەو کەسـەی کـە گـیرۆدەی داوی مـاڵ و منـداڵی، چـیدیکە خـەیاڵی ئاسوودەیی مەکە، خەمی منداڵ و نان و بەرگ و خواردن لەجیهانی مەلـەکوت (گیـانی) دوورت دەخاتەوە.

مـوخلیس بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ بیرۆکـەی وەرگرتـووە و بەشـێوازی خـۆی دایڕشتۆتەوە. مەسەلەی پابەندبوون بە خێزانـی وەرگرتـووە و بـەڵام لەسـەعدی زیـاتر پەلی هاویشتووە و ژنهێنانی بە چوونە نـاو دۆزەخ لـە قەڵـەم داوە، لەوانەیـە مەبەسـتی ئەوەبێ کە پیاو بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منداڵی دوور نییـە دەست بۆ حەرام درێژ بکـا و حەرامیش هۆکارێکە بۆ چوونە دۆزەخ.

موخلیس:

چیی خودا پێی دای قەناعەت پێ نەکەی

دوورنیە خۆت ئاخری کافر بکەی / دەستنووس، ۱۰۷

سەعدی:

ای قناعت توانگرم گردان

کەورای هیچ نعمت نیست

بنان خشك قناعت کنیم و جامە دلق

کەبار محنت خود بە کە بارمنت خلق /کلیات سعدی، ۱۴۲

واتـا: ئـەی قەناعـەت وا بـەتوانام بکە کـە لـەو بـاوەڕەبم کـە لـە تـۆ بـەولاوە هـیچ نیعمەتێ نییە، بەنانی وشك و بەرگی دڕوێـشی قەناعـەت دەکـەین و بـاری نـاگزووریی خۆت باشترە لە باری منەتی خەڵکی.

مـوخلیس تـەنیا بیرۆکـەی قەناعـەتی وەرگرتـووە و بەسـادەییەوە بـۆ مەسـەلەکە چووە، بەڵام سەعدی بە چڕوپڕی بۆی چووە و بە نیعمەتێکی گەورەی لەقەڵەم داوە.

موخلیس:

یار بە دونیا مەدەدونیا چ نییە

هەرکەسێ وای گرد بزانە دەنییە /دەستنووس، ١٠٤

سەعدی:

بدست اوردن دنیا هنرنیست

یکی را گر توانی دل بدست ار / گلستان سعدی، ٤٥٨

واتا: هونەر نییە تۆ جیهان بەدەست بێنی، ئەگەر دەتوانی دڵی یەکێ بەدەست بێنە، واتا: بیکە خۆشەویستی خۆت.

موخلیس هەمان بیرۆکەی سەعدی دووبارە کردۆتەوە کە یار بەدەستهێنانە و درووکەوتنەوەیە لە جیهان پەرستی، لێرەدا (یار)ەکەی موخلیس بەرامبەر (دل)ەکەی سەعدییە، موخلیس زیاتر درێژەی پێداوە و دنیا پەرستی بەهیچ داناوە.

موخلیس:

وام دەزانی خواردنی خۆش عەقڵ و هۆش مەحکەم دەکا

تەجروبەم زۆر بوو، غەڵەت بووم، زێدە ناکا کەم دەکا/ دەستنووس، ٥

سەعدی:

فرشته خوی شود ادمی بکم خوردن

وگر خورد چو بهایم بیوفتد چو جماد / کلیات سعدی، ٢٠٨

واتا: مرۆڤ بە کەمخواردن دەبێتە مرۆڤ و وەکو فریشتەی لێدێت، ئەگەر وەکو ماڵات بخوات وەکو بێ گیان دەکەوێت.

موخلیس بۆچوونەکەی سەعدی (کەمخواردن) وەرگرتووە گۆڕانی بەسەرداهێناوە کردوویەتیە (خواردنی خۆش)، خواردنی خۆشیش زۆر دەخورێت، دیارە موخلیس لەسەر کەمخواردنە بۆیە خواردنی خۆشی پێ چاك نییە. سەعدی کەزاراوی (فریشتە خو) بەکارهێناوە لەبەرئەوەیە چونکە فریشتە خواردنیان نییە، جا مرۆڤ ئەگەر کەمی خوارد لە سروشتی فریشتە نزیك دەبێتەوە.

موخلیس:

کەس نەبوو تێربێ لە دونیا ئەودەمەی دەرواتەدەر

وەك جەهەننەم هەر دەڵێ (هل من مزید) نەفسی بەشەر/ دەستنووس،٤٥١

سەعدی:

دیده اهل گمع بنعمت دنیا

پر نشود همچنا نکەچاه بشبنم / کلیات سعدی، ٢١١

واتا: چاوی خەڵکی تەماحکار لە نیعمەتی جیهان پڕ نابێت، هەروکو چاڵ کە بەشەونم پڕ نابێت.

موخلیس هەمان بیروبۆچوونی سەعدی دووبارە دەکاتەوە کەتێرنەبوونە لە سامانی جیهان، بەڵام موخلیس ئەم تێرنەبوونەی بەسەر هەموو کەسێکدا سەپاندووە وەکو سەعدی کە لەوچووە (مشبە بە) موخلیس هاتووە لەوچووەکەی کردۆتە (دۆزەخ) کە پڕ نابێتەوە لە دۆزەخیان (یوم نقول لجهنم هل امتلئت و تقول هل من مزید ق/٣٠

موخلیس:

ئەو کەسانەی دەگەڕێن بۆ چێشتی خۆش و لە قسان

بۆچی قەت شەقیان نەبرد و بۆچی جارێك نەیسان /دەستنووس، ٩٨

سەعدی:

میان دوتن اتش افروختن

نەعقلست و خود درمیان سوختن

میان دوکس جنگ چون اتشست / گلستان سعدی، ٥٢٥

سخن چین بدبخت هیزم کشست / کلیات سعدی، ٢١٨

واتا: ئاگری قسە خۆشکردن لەنێوان دوو کەسان ژیری نییە و خۆسووتاندنە لەنێوانیان، جەنگ لەنێوانی دوو کەس وەکو ئاگرێکە، ئەوەی قسان لەو نێوانە بێنی و بیات بەدبەختە و وەکو ئەو کەسە وایە دارو پووشکە بخاتە ئاگرەوە.

موخلیس تەنیا قسە هێنان و بردنی نێوان دوو کەسانی وەرگرتووە لەگەڵ (چێشتی خۆش) کردوویەتیە بنەمای بەیتەکە، لێرەدا گەڕان بەدوای قسان لای موخلیس بەرامبەر (میان دوتن اتش افروختن) و (سخن چین بدبخت هیزم کشس)ە لای سەعدی شیرازی.

موخلیس:

چ خزربی، چ سکەندەر بی، دەبی

بگری ئاخری رێی دەربەدەری

کە قەزا ساحێبی تەدبیری نەبوو

بەهەبا رۆیی سکەندەر سەفەری / دەستنووس، ١٠٦

سەعدی:

شنید های کەسکندر برفت تاظلمات

بچند محنت خورد انکە خورد اب حیات /کلیات سعدی، ٢٤٢

واتا: بیستووتە کە ئەسکەندەر چووەتە تاریکستان و چەندە ماندوو بوو تاکو ئاوی ژیان بخواتەوە.

موخلیس مەسەلەی (ئاوی ژیان)ی ئەسکەندەری کردۆتە بنەمای دوو بەیتەکەی و ئەمەی لە سەعدی وەرگرتووە و ڕوونی کردۆتەوە کە هەموو هەوڵەکانی بەفیڕۆ چووە، لەلایەکی دیکەوە هاتووە ناوی خدری زندەی هێناوە، خدریش نیشانە و هێمای نەمرییە، موخلیس نەمریی خدری رەتنەکردۆتەوە، بەڵام هی سکەندەری رەتکردۆتەوە و پێی وایە ماندووبوونەکەی بێهوودە بووە.

موخلیس:

جین و ئینسان و مەلەك جوملە نەباتات و جەماد

کائینات هەرچی هەیە پەردەمی ئەمر کاری تەیە/دەستنووس، ١٠٣

سەعدی:

پرستار امرش همە چیزوکس

بنی ادم و مرغ و مورومگس /کلیات سعدی، ٢١٦

واتا: هەرچی لەو بوونەوەرەیە لە مرۆڤ و شتەکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودان بە ئادەمیزاد و باڵندە و مێروو مەگەسەوە.

موخلیس بیرۆکەی سەعدی وەرگرتووە هەموو بوونەوەرێ گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خودان لەگەورە تا بچووکیان، لەگیاندار تا بێ گیانیان (الا لە الخلق و الامر) الاعراف/ ٥٤

موخلیس:

ئەهلی دینم بتپەرستی کارمە

باخەلیل بم ئازەری رەفتارمە

چم لەناحەز لوتفی یارم گەر هەبی

ئاگری نەمروود وەکو گوڵزارمە / دەستنووس، ١٠١

سەعدی:

گلستان کند آتشی بر خلیل

گروهی بر آتش بردز اب نیل /کلیات سعدی، ٢١٧

واتا: خوای گەورە ئاگری بۆ ئیبراهیم کردە گوڵزار و گرووپێکیشی لە ناوی نیلەوە بەرەو ئاگری دۆزەخ برد کە گروپی فیرعەون بوون و نیل بووە گۆڕیان و دۆزەخیان.

لێرەدا موخلیس چونکە ناوی خەلیل بووە، ئاماژەی بە (ابراهیم خلیل)ی دۆستی خواکردووە هەر کەیەزدان ناو ئاگرەکەی بۆ کردە گوڵزار (قلنا یا نار کوني بردا و سلاما علی ابراهیم) الانبیاء/ ٦٩

شاعیر هەمان بیرۆکەی وەرگرتووە و مەیدانەکەی لەوەی سەعدی فراوانتر کردووە و ناوی ئازەری باوکی ئیبراهیمی هێناوە کە بتپەرست و بت تاش بووە، بەڵام ئەو بتپەرستیەی کە موخلیس دەیکات لەوەی ئازەر جیاواز بووە و مەبەست لێی جوانیی خواییە لە ناو لەش و لاری رابەری تەریقەتدا.

موخلیس:

مەحرەمت (روح الامین) بوو هەرکەچووی بۆ لامەکان

نەزمی (سبحان الذی) بۆ عزەتی شەئنی تووە

پەردەدار نازانی لەو دیو چی هەیە فەرموو ئەتوو

بۆ تووە هەرچی هەبی ئایاتی سوبحانی تووە/ دەستنووس، ١٠٢

سەعدی:

چنان گردم درتیەقربت براند

کەبرسدرە جبرئیل ازوبازماند

بگفتا فراتر مجالم نماند

بماندم کە نیروی بالم نماند /کلیات سعدی، ٢١٩

واتا: گەر بەمجۆرە بەرەو بیابانی نزیکیتم بەرن کە جوبرەئیل لە (سدره المنتهی) لە پێغەمبەر (ص) جودابوویەوە، جوبرەئیل گوتی: ناتوانم زیاتر بەرزببمەوە چونکە هێزی باڵم نەماوە.

ئەم دوو بەیتەی موخلیس باسی چوونە ئاسمانی پێغەمبەر (ص) دەکا، هەرچەند ئەم بابەتە لای زۆر لە شاعیرەکان دووبارە بۆتەوە دەشێ موخلیس ئاگای لەمەی سەعدی نەبێ، ئەگەر وەریشی گرتبێ تەنیا بیرۆکەی جوبرەئیلە کە لەگەڵ پێغەمبەر (ص) تا شوێنێکی دیاریکراو چووە و ئیتر نەیتوانیوە لەگەڵی بڕوات و پێغەمبەر (ص) لە هەوراز چوونەکەی بەردەوام بووە. بەپێی قوتابخانەی بەراوردکاری ئەمریکی ئەگەر شاعیر ئاگاداری دەقەکەی دیکەش نەبووبێ هەر دروستە و دەکەوێتە خانەی بەراوردکارییەوە.

# موخلیس و حافزی شیرازی (*)

موخلیس هەروەکو پێشتر باسکرا خۆی دانی بەوەدا ناوە کە کاریگەریی حافزی شیرازی بەسەرەوەیە و مامۆستای موخلیسە لە غەزەلدا. حافز بە پلەی یەکەم کاری لەشاعیر کردووە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە کۆمەڵە غەزەل و بەیتێکی حافزی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. وانەبێ خۆی دانی بەم وەرگێڕانانە دانابێ، بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوە لە غەزەلەکانی ئەمە بەدیارکەوت.

ئەم بەراوردەی کە دەمانەوێ بیکەین بە سێ قۆناغدا رەت دەبێ:

١- **قۆناغی وەرگێڕان:** ئەمە بەشی هەرەزۆری بەراوردەکە دەگرێتە خۆی.

٢- **قۆناغی خواستنی هەندێ وشە:** واتا بەزۆری لەڕووی روخسارەوە پێی دەچێ.

٣- **قۆناغی وەرگرتنی واتا:** لەم قۆناغەدا شاعیر بەدەستکارییەوە بەیتەکانی دارشتۆتەوە و گەر لێیان ورد نەبینەوە هەستی پێ ناکەین.

موخلیس لە قۆناغی وەرگێڕانەکەدا بەدوو پلەدا رەتبووە، لە پلەی یەکەمدا کت و مت بەیتە فارسیەکەی وەرگێڕاوە و لەیەکتر دەچن، لە پلەی دووەمدا بە هەندێ دەستکارییەوە بەیتەکانی وەرگێڕاوە و تۆزێ لە واتاکەی گۆڕیوە.

ئەمە لەڕووی واتاوە، بەڵام لەرووی روخسارەوە لەزۆربەی بەیتەکاندا لەسەر هەمان کێشی عەرووزی بەیتە فارسییەکان رۆیشتووە و هەمان سەروای بەکارهێناوەتەوە. بێگومان ئەمەش کارێکی هێندە ئاسان نییە مەگەر هەر زمان پاراوی و لێهاتوویی موخلیس ئەمەی لێ بوەشێتەوە.

ئێستاش بەپێی قۆناغەکان بەراوردەکە دەخرێتە ڕوو:

---

(*) ناوی محەممەدە و نازناوی (شمس الدین)ە، لە ٧٢٦ ك لەدایکبووەو لە ٧٩١ ك مردووە، بۆیە پێی گوتراوە حافز چونکە قورئانی لەبەربووە، لە ژیانی سیاسی دوورەپەرێز نەبووە و شیعری بەسەر هەندێ دەسەڵاتداراندا گوتووە. دیوان حافظ، امیر کبیر، ص٩/١١.

**قۆناغی وەرگێڕانی بەیتەکان:**

**موخلیس:**

**بۆ لەگەڵ بادی سەبا نانێری بۆم گوڵدەستەیێ**

**تاموعەتتەر بێ بەبۆی ئێوە سەراو هەیوانی ما/ دەستنووس، ٦٥**

**حافز:**

**با صبا همراه بفرست از رخت گلدسته ای**

**بوکه بویی بشنویم از خاك بستان شما/ دیوان حافظ،١٦**

بەیتەکەی موخلیس تاڕادەیەك وەرگێڕانی بەیتەکەی حافزە، تەنیا موخلیس بەشێوەی پرسیار دەری بڕیوە و وشەی (بستان)ی کردۆتە (هەیوان). لە لایەنی روخساریش لەسەر هەمان کێش و سەروای بەیتە فارسیەکەیە.

**موخلیس:**

**بەجامی زەڕنیگار ساقی وەرە یەندێ لەمن ببیە**

**سەحەرگاهان بکە پەرهیز لەتیری دڵ بریندارانا/ دەستنووس، ٦**

**حافز:**

**بخدا جرعه ده تو به حافظ سحر خیز**

**کەدعای صبحگاهی اثری کند شمارا/ دیوان حافظ، ٧**

نیوەبەیتی یەکەمی موخلیس پەیوەندیی بە بەیتەکەی حافزەوە نییە و نیوە بەیتی دووەمی وەرگێڕانی نیوە بەیتی دووەمی حافزە.

موخلیس لەم غەزەلەی دادێ بەهەندێ دەسکارییەوە بەیتە فارسیەکانی وەرگێڕاوە و هەندێ جاریش دەقاودەقە. سەرەڕای ناوەڕۆکی لەسەر هەمان کێش و سەروای حافز رۆیشتووە. ئەمەش غەزەلەکەیە:

**موخلیس:**

**هات لەمزگەوت بێتە مەیخانە دوێنێ پیری مە**

**ئەی رەفیقانی تەریقەت جا چییە تەدبیری مە**

پەیڕەویی پیر لازمە لەو فەیزە با مەحروم نەبین

بێ دەچێ ڕۆژی ئەزەل وا هاتبێ تەقدیری مە

ئایەتێکی حوسنی بۆ ئێمە کەشف کرد ڕوویی تۆ

بێ لەتافەت بۆیە نابینێ فسەی تەفسیری مە

دەستی ئێمەی بەست لە هەر کارێك و ڕووت لەولا دەکەی

غەیری زولفی تۆ بزانم کێ دەکا زنجیری مە

تیری ئاهی موخلیسی عیشقت لەگەردوون دەردەکا

ڕووحەکەی خۆم خۆت بپارێزە لەکاری تیری مە/دەستنووس، ۲۹

حافز:

دوش از مسجد سوی میخانه امد پیرما

چیست یاران گریقت بعد ازین تقدیرما

در خرابات گریقت ما بهم منزل شویم

کاین چنین رفتست در عهد ازل تقدیرما

روی خوبت ایتی از لطف برما کشف کرد

زان سبب جز لطف و خوبی نیست در تفسیرما

عقل اگرداند که دل در بند زلفش چون خوشست

عاقلان دیوانه گر دند از پی زنجیرما

تیر اه ما زگردون بگـزرد (حافظ) خموش

رحم کن بر جان خود پرهیز کن از تیرما/دیوان حافظ، ۹-۸

موخلیس بەتەواوی بەیتی یەکەمی حافزی وەرگێڕاوە، لەبەیتی دووەمدا تەنیا بەشی دووەمی بەیتەکەی موخلیس وەرگێڕانی بەشی دووەمی بەیتەکەی حافزە، بەڵام بەشی یەکەمی بەیتی دووەم پەیوەندیی بە فارسییەکەوە نییە. بەیتی سێیەم وەرگێڕانە تەنیا موخلیس لەبەشی دووەمی بەیتەکەدا وشەی (لطافت)ی بۆ زیاد کردووە، نیوە بەیتی یەکەمی بەیتی چوارەمی موخلیس هی خۆیەتی و تەنیا لە نیوەی دووەمی بەیتەکەدا واتای گشتیی بەیتەکەی حافزی وەرگرتووە. بەیتی پێنجەم بەگشتی

وەرگێڕانی بەیتی پێنجەمی حافزە و تەنیا موخلیس فرێزی ناویی (رووحەکەی خۆم)ی بۆ زیاد کردووە و (رحم برجان خود)ی حافزی فەرامۆشکردووە. لەڕووی روخسارەوە موخلیس هەمان کێشی عەرووزی و سەروای بەیتەکانی حافزی دووبارە کردۆتەوە.

موخلیس:

(بحمدالله) لە غەم رزگارم ئەوشەو

بڵێم چی خانەخێی دڵدارم ئەوشەو

لەبەختی خۆم و دڵداری وەفادار

بەبێ گازاندە بەرخوردارم ئەوشەو

لەبازاڕی مەحەببەتدا گەدا بووم

هەتا ئەوڕۆکە دەوڵەتدارم ئەو شەو/ ٣٣

حافز:

تعالی الله چ دولت دارم امشب

که امد ناگهان دلدارم امشب

نهال صبرم از وصلش بر اورد

زبخت خویش برخوردارم امشب

تو صاحب نعمتی من مستحقم

زکات حسن ده خوش دارم امشب /دیوان حافظ، ٢٥-٣٦

وەرگێڕانەکەی موخلیس دەقاودەق نییە و دەسکاریی کردووە وزیاتر لەڕووی روخسارەوە پێك دەچن چونکە لەسەر هەمان کێش و سەروای شیعرە فارسیەکانە.

لەبەیتی یەکەمدا موخلیس واتای گشتیی وەرگرتووە و لەگەڵ هەندێ دەستکاری، بۆ نموونە: لەجیاتی (تعالی الله) نووسیویەتی (بحمدالله)، بەیتی دووەم و سێیەم واتای گشتیی وەرگرتووە و تەنیا وشەی (بەرخوردارم)ی دووبارەکردۆتەوە لەبەیتی دووەمدا، بەیتی سێیەمیان لێك جودان و لەدوورەوە پەیوەندارن.

موخلیس:

ئەورۆ دەری مەیخانە کەجێی ئەهلی نیازە

واڵایە لەبەر جەژنە هەڵستاوە ئیجازە

بۆ شاه و گەدائێکە چ بادە، چ مەحەببەت

سوڵتان و گەدای ئەو دەرە مەحموودو ئەیازە

زاهید وەرە لەو فەیزەیە مەحرووم نەبی چاکە

زەوقت لە حەقیقەت کەمەبی چت لە مەجازە؟

سرێکی کەدا رەنگ نییە بێگانە بزانی

یارم دەبی بیزانی ئەوم مەحرەمی رازە /دەستنووس،٦٧

حافز:

المنه لله که در میکده بازست

زان رو کەمرا بردر او روی نیازست

بار دل مجنون و خم گره لیلی

رخساره محمود کف پای ایاز ست

خمها همه درجوش و خروشند زمستی

وان می که در انجا ست حقیقت نه مجازست

رازی که بر غیر نگفتیم و نگوئیم

بادوست بگوئیم که او محرم رازست/ دیوان حافظ/ ۹۷

نیوە بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێڕانی نیوە بەیتی یەکەمی حافزە و نیوەی دووەمی پەیوەندی پێوە نییە، لەبەیتی دووەمدا تەنیا لە رووی روخسارەوە وشەی (محمود و ایاز)ی وەرگرتووە، بەیتی سێیەم سەرەڕای وەرگرتنی دوو وشەی (حقیقت و مجاز) هەندێ لە واتای بەیتەکەی حافزی وەرگرتووە، بەڵام بەیتی چوارەمی موخلیس بەتەواوی وەرگێڕانی بەیتی چوارەمی حافزە. کەواتە ئەم چوار بەیتە هەرسێ لایەنی وەرگێڕان و واتا وەرگرتن و وشە وەرگرتنی تێدایە.

موخلیس:

بەیادی لێوو چاوی مەستی مەیگوون

بەبێ مەی مەستم و بێ تیر جگەرخوون

بپرسین حاڵی فەرهادی لە شیرین

(ومن لیلی اسئلن کیف مجنون)

لەگەڵ باڵا بڵندان سەر بڵندی

وەکو باڵات قسەت مەنزووم و مەوزون

کەسەروی جۆیە باری لێ بزربوو

ئەوەک جۆبارە دیدەم بوو بە جەیحوون/دەستنووس،۲۹۷

حافز:

بیاد لعل تو و ان چشم میگونست

زجام غم می لیلی که میخورم خونست

حکایت لب شیرین کلام فرهاد است

شکنج گره لیلی مقام مجنونست

دلم بجو که قدت همچوسرو دلجویست

سخن بگو که کلامت لطیف و موزونست

از اندمی که ز چشم برفت رود عزیز

کنار دا من من همچو رود جیحونست /دیوان حافظ، ۲۹۷

لەم چوار بەیتەدا موخلیس هەندێکی وەرگێڕاوە و لە هەندێکی تەنیا واتای وەرگرتووە و لەوی دی هەر روخساری بەیتەکەی وەرگرتووە و وشەکانی دووبارە کردۆتەوە. نیوە بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێڕانی نیوە بەیتی یەکەمی حافزە و لەنیوە بەیتی دووەمدا تەنیا وشەی (خون)ی وەرگرتووە واتاکەی جودایە. واتای بەیتی دووەم لە هی حافز ناچێ و تەنیا وشەی (فرهاد و شیرین، لیلی و مجنون) دووبارە کردۆتەوە و بەواتایەکی دیکە دایڕشتۆتەوە. بەیتی سێیەم وەرگێڕانێکی کت و مت نییە و واتای گشتی وەرگرتووە و دەسکاری کردووە. نیوەی دووەمی بەیتی چوارەمی موخلیس بە نیوەی دووەمی بەیتی چوارەمی حافز دەچێ و لەنیوەی یەکەمدا لایداوە.

موخلیس:

تاوەکو گەنجی عەزیزم خۆت بگەینە کۆی نیگار

پێنج ودوو ڕۆژێکە دەڕوا ڕەونەقی باغ و بەهار

دەوری مەجنوون تێپەڕی ئەوڕۆکە نۆبەی ئێوەیە

دەورو تەسلیمە هەموودەم وایە دونیای بێ قەرار/ دەستنووس/١

دورمجنون کذشت و نوبت ماست

هرکس پنج روزه نوبت اوست دیوان حافظ، لیمودهی، ٣١

موخلیس لە دوو بەیتەکەی خۆیدا بەیتەکەی حافزی وەرگێڕاوە، بەشی دووەمی بەیتی یەکەمی موخلیس پەیوەندی بە هەمان بەشی بەیتەکەی حافزەوە هەیە، هەروەها بەشی یەکەمی بەیتی دووەمی موخلیس وەرگێڕانی هەمان بەشی حافزە، تەنیا (ئێمە)ی کردۆتە (ئێوە).

موخلیس:

هەرچی ئەمڕۆ لەڕەفاقەت بەسەفاو بێ خەلەلە

جامی جەمشیدی هەوا بەخش و لەتیفەی غەزەڵە

تەنگە ڕێی عافیەتت هەر بەتەنێ ڕێ بگرە

دەم لەبادە مەکەوە عومری عەزیز بێ بەدەلە

هەر ئەمن نیمە کە ناڵاّ و لەبەڵای بێ عەمەلی

سەیری یەك یەك عولەمامان هەموو هەربێ عەمەلە

دامەنی ماهی دوو هەفتە بگرە چیدی مەکە

زەن مەبە سەعد و نحوسەت کە لە زوهرە و زوحەلە

(موخلیسا) سابیقە کە مەعلووم نەبێ چاکە بکە

خاتیمە چاك و خراپ تابیعی ڕۆژی ئەزەلە/دەستنووس/٤٠

حافز:

درین زمانه رفیقی که خالی از خللست

صراحی می ناب و سفینه غزلست

جریده رو که کـذرگاه عافیتت تنگست

پیاله گیر که عمر عزیز بی بدلست

نەمن ز بی عملی در جهان ملولم و بس

ملالت علما هم ز علم بی عملست

بگیر گره مه چهره و قصه بخوان

که سعد و نحس ز تأثیر زهرەو زحلست

بهیچ دور نخواهید یافت هشیاریش

چنین که (حافظ) مامست باده ازلست/دیوان حافظ، لیمودهی،٥٠

بـەیتی یەکـەم وەرگێڕانێکـی تـەواو نییـە و مـوخلیس کۆمەڵـە وشـەیەکی بـۆ زیـاد کردوه وەکو (هەرچی نـەورۆ لـە رەفاقـەت، جـامی جەمـشیدی هـەوا بەخـشی). بـەیتی دووەم وەرگێڕانێکی تـەواوی بـەیتی دووەمـی حـافزە، بـەیتی سـێیەم وەرگێڕانـی بـەیتی سێیەمی حافزە تەنیا موخلیس وشەی (سەیری) خستۆتە سەری. بەیتی چوارەم گـت و مـت وەرگێڕانـە، تـەنیا مـوخلیس لـەجیاتی (مـە چهره) وشـەی (مـاهی دوو هەفتـە)ی دانـاوە کـە دەکاتـە چـواردە، چـواردەش ئەگـەر ئـاوا بنووسـرێ: ٤ × ١٠ - ٤٠ دەکاتـە چـل مەبەستی پێغەمبەر (ص) کە لەتەمەنی چل ساڵیدا وەحی بۆهات. لە بەیتی پێنجەمـدا مـــوخلیس بـــە دەســـتکارییەوە بەیتەکـــەی رێکخـــستووە و تـــەنیا (رۆژی ئـــەزەل)ی وەرگرتووە.

موخلیس:

چاوی پاکی دڵ مەگەر بۆ دیتنی رووت دەست بدا

چاوی دونیا بینی من حەدی نییە بۆ ئینتیزار

مەنزیلی کێیە کە رێی ئەو مەنزیلە نادرێ بەمن

نیسبەتی دار موغیلانی لەگەڵ سەروو چنار/دەستنووس، ١

حافز:

دیدن روی ترا دیده جان بین باید

وین کجا مرتبه چشم جهان بین من است

یارب کعبه مقصود تماشاگه کیست

که مغیلان گریقش گل و نسرین من است/دیوان حافظ، لیمودهی،۳۷

مـوخلیس بەدەسـتکارییەوە بـەیتی یەکـەمی حـافزی وەرگێـڕاوە و بـەگوێرەی بۆچـوونی خـۆی دایڕشـتۆتەوە، بـەیتی دووەمـی مـوخلیس بـەتۆزێ دسـتکارییەوە وەرگێڕانی بەیتی دووەمی حافزە و لەجیاتی (گل و نسرین) موخلیس (سەرووچنار)ی داناوە.

موخلیس:

زاهیدی زاهیر پەرست ئاگای لە حاڵی مەنییە

گەرچی خۆم هەیئەت گەدامە هیممەتم سوڵتانییە

بۆ تەماشای عاشقان ئاگەی چ عالی هیممەتن

دڵ بریندارن لە حەلقەی وان، گەچی شەکوا نییە

کورتە باڵا وادەبێ دەستی بگاتە ئاسمان

کاری وەك خۆی وادەبێ باڵا بڵند باڵا نییە

لوطفی پیرانی خەرابات گاه و بێ گاه هەر هەیە

لوطفی شێخ و زاهیدانی بێ حەقیقەت وانییە

موخلیسا مەیخانە جێی ئیخلاس و جێی یەك ڕەنگییە

بۆ ئەوانەی خۆفرۆشن لێرە هیچ ڕێگا نییە/دەستنووس، ۳٤

حافز:

زاهد ظاهر پرست از حال ما اگاه نیست

درحق ماهرچه گوید جای هیچ اکراه نیست

حافظ ار برصدر ننشیند ز عالی مشربیست

عاشق در دی کش اندر بند مال و جاه نیست

هرچه هست از قامت ناسازی بی اندام ماست

ورنه تشریف تو بر بالای کس کوتا نیست

بنده پیر خراباتم که لطفش دا ئم است

ورنه لطف شيخ و زاهدگاه هست و گاه نست

بردر ميخانه رفتن كاريك رنگان بود

خودفروشانرا بكوى مى فروشان راه نيست/ديوان حافظ، ٣٢-٣٤

لەرووی کێشەوە هەمان کێشی حافزی بەکارهێناوە و سەرواکەشی هەمان شتە، تەنیا (نیست)ی فارسی بووەتە (نییە)ی کوردی و وەکو فارسیەکە بووەتە دواسەروا.

لەبەیتی یەکەمدا موخلیس تەنیا بەشی یەکەمی بەیتەکەی وەرگێڕاوە و بەشی دووەمی بەیتەکە پەیوەندیی بەفارسیەکەوە نییە. لەبەیتی دووەمدا واتای بەیتی دووەمی حافزی وەرگرتووە و دورە لەوەرگێڕان. لەبەیتی سێیەمدا موخلیس تەنیا لەبارەی کورتە بالاییەوە لێکچوون هەیە و موخلیس دەسکارییەکی زۆری کردووە و گەر لەبەر بەیتەکانی دیکە نەبێ هەست بەو لێکچوونە ناکرێ. بەیتی چوارەمی موخلیس وەرگێڕانی بەیتی چوارەمی حافزە لەگەڵ تۆزێ دەسکاری، بەڵام بەیتی پێنجەمی موخلیس بەتەواوی وەرگێڕانی بەیتی پێنجەمی حافزە و بەمجۆرە دەتوانین بڵێین: بەگشتی موخلیس ئەم غەزەلەی حافزی وەرگێڕاوە.

موخلیس:

عەیبی رەندان مەکە زاهید بە چ حاڵ

کردەوەی کەس لە چ کەس ناکرێ سوئاڵ

چی هەبێ ئەو ئەفرۆشێ هەموو کەس

یەك نییە بابەتی خۆشناو و بەقاڵ

هەموو جێ جێگەیی عیشقە دەرو دەشت

هەموو کەس تاڵیبی یارە بەخەیاڵ

مەسئەلەی سابیقەیی رۆژی ئەزەل

موشکیلە باسی مەکە وەك کەرواڵ/ دەستنووس، ٢٨

حافز:

عيب رندان مكن اى زاهد پاكيزه سروشت

كەگناه دگرى برتو نخوا هند نوشت

من اگر نیکم اگر بد تو بر و خودرا باش

هرکس ان درود عاقبت کار که کشت

همه کس طالب یارند چه هشیارو چه مست

همه جا خانه عشقست چه مسجد چه کنشت

نا امید مکن از سابقه لطف ازل

توچه دانی کهپس پرده که خو بست و که زشت /دیوان حافظ لیمودهی، ٤٧

موخلیس لەم غەزەلەی حافز کە (١٠) بەیتە تەنیا چواری وەرگێڕاوە. بەیتی یەکەمی حافزی بە دەسکارییەکی کەمەوە وەرگێڕاوە، بەڵام لەبەیتی دووەمدا تەنیا واتای بەیتی دووەمی حافزی وەرگرتووە و پەیوەندییان زۆر نییە. لەبەیتی سێیەمدا موخلیس بە کەمێ دەسکارییەوە بەیتی سێیەمی حافزی وەرگێڕاوە و لەبەر سەروای بەیتەکە لە جیاتی (دیرو کنشت) وشەی (دەر و دەشت)ی داناوە. لەبەیتی چوارەمدا شاعیر تەنیا بەشی یەکەمی بەیتی چوارەمی حافزی وەرگیراوە و بەشی دووەمی بەیتەکە هی خۆیەتی.

موخلیس،

تا مەی بەردەوام بێتن و مەعشوقە بە کام بێ

سوڵتانی جیهانم دەبێ لەو ڕۆژە غوڵام بێ

بەرداغی خسووسی بخە کار ساقی، بەهارە

موخلیس چ قسووری مەکە با مانگی صیام بێ/دەستنووس، ٣٧

حافز:

گل دربرو می در کف و معشوقه به کام است

سلطان جهانم بچنین روز غلام است

حافظ منشین بی می و معشوق زمانی

کأیام گل یاسمین و عید صیام است /دیوان حافظ، ٤٤

بەیتی یەکەم وەرگێڕانێکی تەواوی بەیتی یەکەمی حافزە، بەڵام بەیتی دووەمی موخلیس جۆرە گۆڕانێکی تێدایە و سەرەڕای ئەوەش لەجیاتی (عید) وشەی (مانگ)ی

بەکارهێناوە کە زیاتر بەیتەکەی بەهێز کردووە، چونکە مەی و مەعشووقە لەمانگی رەمەزاندا دەبێ وازیان لێ بهێنرێ، بەڵام وادیارە مەی و مەعشووقەکەی موخلیس وەکو هی حافز مەجازی نییە و حەقیقیە.

موخلیس:

بەتەمای تاعەت و تەقوا مەبە قەت لەو دڵی مەست

ناوی نووسراوە بە دێوانە لە دیوانی (الست)

لە قیامەت تەمی عیسیان وەکو یەك زمرە وەیە

لەدەری لوتفی خودا لامەچوو ئەی بادە پەرست

وەسفی رووی تۆ چ بکا دەم، چ بنووسێ قەڵەمم

با قە بەست وەك گوڵی رووی تۆی لە چ باغێکی نەبەست/دەستنووس، ٢١

حافز:

مطلب طاعت و پیمان در ست ازمن مست

كه به پيمانه كشى شهره شدم روز الست

كمركوه كمست از كمر مور انجا

نا اميد از در رحمت مشو اى باده پرست

جان فداى دهنت باد كه در باغ نظر

چمن اراى جهان خوشتر ازين غنچه نبست/ديوان حافظ، ليمودهى، ٢٠

بەیتی یەکەم بەتەواوی وەرگێرانی بەیتی یەکەمی حافزە، بەشی یەکەمی بەیتی دووەمی موخلیس هی خۆیەتی، بەڵام بەشی دووەمی وەرگێرانی بەیتی دوومی حافزە. هەروەها بەشی یەکەمی بەیتی سێیەمی موخلیس پەیوەندی بە حافزەوە نییە، بەڵام بەشی دووەمی وەرگێرانی بەشی دووەمی بەیتی سێیەمی حافزە.

لەرووی کێشەوە هەمان کێشی حافزی دووبارە کردۆتەوە و لەگەڵ ئەمەش بەهەمان سەروا بەیتەکانی دارشتۆتەوە.

موخلیس:

ئەر لە دەستی زوڵفی موشکینت خەتایێ هات، چوو

وەر لەهیندووی خاڵی سەر رووتان جەفایێ هات، چوو

گەر بە بەرقی عیشقی تۆ خەرمانی ئێمە سووت، سووت

جەوری شاگەر دەفعەیێ بۆ سەر گەدایێ هات، چوو

گەر لە غەمزەی یارەوە تیرێ لە بۆ دڵ هات، هات

زۆر لەبەینی جان و جانان ماجەرایێ هات،چوو

رەونەقی باغ و بەهار دەروا لەگەڵ بای پایزێ

گەر لەگەڵ عەهدی شەبابم هەر سەفایێ هات، چوو/دەستنووس، ٤١

حافز:

گرز دست زلف مشکینت خطایی رفت، رفت

ور ز هندوی شما بر ما جفائی رفت، رفت

برق عشق ار خر من پشمینه پوشی سوخت، سوخت

جور شاه کامران گر بر گدائی رفت، رفت

گرد لی از غمزه دلدار باری برد، برد

ورمیان جان و جانان ماجرائی رفت، رفت

در طریقت ر نجش خاطر نباشد می بیار

هرکدورت را که بینی چون صفایی رفت، رفت/دیوان حافظ، ٥٣

لەرووی روخسارەوە هەمان کێش و سەروای شیعرەکەی حافزی دووبارە کردۆتەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەتوانایی شاعیر لەهەردوو زمان دەردەخات.

موخلیس بەگشتی ئەم چەند بەیتەی حافزی وەرگێڕاوە و ناو بەناو هەندێ دەسکاری تێدا کردووە. بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێرانی بەیتی یەکەمی حافزە، لە بەیتی دووەمدا تۆزێ دەسکاری دەبینرێ و تەنیا موخلیس (پشمینە پوشی)ی کردۆتە (ئێمە)، بەیتی سێیەمی موخلیس وەرگێرانە، نیوەی دووەمی بەیتی چوارەمی موخلیس بە نیوەی دووەمی بەیتی چوارەمی حافز دەچێ و نیوەی دی پەیوەندی پێوە نییە و هی شاعیرە.

موخلیس:

مەرحەبا ئەی قاسیدی پاك بێنە بۆم پەیغامی دۆست

تابکەم رووحم بەقوربانی خەت و ئەرقامی دۆست

وا لەو شەیدایە هەروەك بولبولانی نێو قەفەس

تووتیی تەبعم لەشەوقی شەککەر و بادامی دۆست

هەر دەبێ سەرخۆش و مەست بێ تا دەگاتە نەفخی سوور

هەرکەسێ رۆژی ئەزەل مەست بێ بە جورعەی جامی دۆست

من دەکەم قەسدی ویسال و ئەو دەکا مەیلی فیراق

تەرکی قەسدی خۆم ئەوا کرد بەڵکو پێك بێ کامی دۆست

موخلیسا هەوڵی تەداوی بۆ دەدەی سەیرێ بکە

خۆش نییە مەیدانی مەحشەر بێ برین و زامی دۆست/دەستنووس، ٣٥

حافز:

مرحبا ای پیك مشتاقان بده پیغام دوست

تاکنم جان از سر رغبت فدای نام دوست

وا لەو شیدا ست دایم همچو بلبل در قفس

طوطي طبعم ز شوق شکر و بادام دوست

سر زمستی بر نگیرد تا بصبح روز حشر

هرکه چون من در ازل یك جرعه خور دا ز جام دوست

میل من سوی وصال وقصد او سوی فراق

ترك کام خود گرفتم تا بر اید کام دوست

حافظا با درد او میسوز و بی درمان بساز

زانکەدرمان ندارد دردبی ارام دوست /دیوان حافظ، ٣٥

لەرووی کێش و سەرواوە هەمان کێش و سەروای حافزی دووبارە کردۆتەوە و وەکو حافز بەدوا سەروا بۆی هاتووە.

ئـەم غەزەلـە وەرگێرانێکـی تـەواوی غەزەلەکـەی حـافزە و بەکوردییـەکی پـەتی و

دارشتنێکی بەهێزەوە وەرگێرانەکە ئەنجام دراوە، تەنیا لەبەیتی پێنجەم لەجیاتی نازناوی موخلیس (مەیدانی مەحشەر)ی بۆ نیوە بەیتەکە زیاد کردووە.

موخلیس:

به تەجەمول ئەخەن و رێ بە جەلالەت ئەبڕن

کاروانێ کە حلەو کێشی بێ لوگفی ئەزەلی/دەستنووس،٢٢

حافز:

کاروانی کە بود بدر قەش حفظ خدا

بتجمل بنشیند بجلالت برود /دیوان حافظ، قاسم غنی، ١٥٠

ئەم بەیتەی موخلیس وەرگێرانی بەیتەکەی حافزە لەگەڵ هەندێ دەسکاری، واتا: وەرگێڕانی وشە بە وشە نییە.

موخلیس:

مەپرسە کەعبە و بتخانە ئەی شێخ

تەهارەت گەر نەبێ نابێ بە عیسمەت /دەستنووس، ١٣٦

حافز:

چون طهارت نبود کعبە و بتخانە یکیست

نبود خیر در ان خانە کە عصمت نبود /دیوان حافظ، لیمودهی، ٩٧

موخلیس بەگشتی بەیتەکەی حافزی وەگێڕاوە و هەندێ وشەی زیادی خستۆتە ناویەوە، موخلیس بەیتەکەی بە نەرێ دەستپێکردووە، بەڵام لای حافز ئەرێیە، سەرەڕای ئەمەش موخلیس لەخۆیەوە وشەی (شێخ)ی بۆ داناوە.

موخلیس:

جین و ئینسان و مەلەك جوملە ئەباتات و جەماد

کائینات هەرچی هەیە پر دەمی ئەزکاری تەیە/دەستنووس، ٥

حافز:

نه بتنها حیوانات و جمادات و نبات

هرچه در عالم امراست بفرمان تو باد/دیوان حافظ، لیمودهی، ٩٥

موخلیس ئەم بەیتەی حافزی وەرگێراوە و (جین و ئینسان و مەلەك)یشی خستۆتە سەرەی وزیاتر روونی کردۆتەوە، هەرچەندە حافز بەگشتی باسی هەموو بوونەوەرانی کردووە (هرچه در عالم امر).

موخلیس:

رەختی خۆت راکێشە مەیخانە ئەگەر فورێت دەوێ

رۆژ و شەو تەی ناگرێ بێ لێوی جامی زەرنیگار/دەستنووس، ١

حافز:

حا لیا مصلحت وقت در ان میبینم

که کشم رخت به میخانه و خوش بنشینم/دیوان حافظ، لیمودهی،٢١١

بەدەستکاریەکی کەمەوە موخلیس بەیتەکەی وەرگێراوە و لەواتای گشتیدا یەك دەگرنەوە، بەلام بەشی دووەمی بەیتەکەی موخلیس پەیوەندی بە نیوە بەیتی دووەمی حافزەوە نییە.

موخلیس:

یا مودەعی نەزانی ئەسراری عیشق و مەستی

لەو جەهلە بایمینێ بمرێ لە خود پەرستی

گەرچی نەخۆشی عیشقی شەکوا مەکە لە عیشقت

خۆشترە دەردی یاران سەدجار لە تەندروستی

مەنوارە علیم و فەزلت بگرە تەریقی رەندی

دەتوێ بگەی بەگەنجت تێکدە قەلاتی هەستی

بنوارە سۆزی بادە وەردەگرێ چەند بەگەرمی

دامەنی چەندە کورتە، چەندە درێژە دەستی

دڵ مەستی گەر تۆ موخلیس نابێ ئەنیسی غەم بی

تۆ سەر بڵندی عیشقی ئەورۆکە بۆچی پەستی/دەستنووس،٢

حافز:

با مدعی مگوئید اسرار عشق و مستی

تابیخبر بمیرد در رنج خود پرستی

باضعف و ناتوانی هم چون نسیم خوش باش

بیماری اندرین غم خۆشتر ز تندروستی

تا فضل عقل بینی بی معرفت نشینی

یك نکتەات بگویم خود رامبین که رستی

صوفی پیاله پیما، ساقی قرابه پرکن

ای کوته استینان تاکی دراز دستی

از راه دیده حافظ تا دیده زلف پستت

با لجمله سر بلندی شد پایمالی پستی/دیوان حافظ، لیمودهی، ٢٨٠

بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێڕانی بەیتی یکەمی حافزە لگەڵ هەندێ جیاوازی کە لەجیاتی (بامدعی مگوئید) نووسیویەتی (بامودەع نەزانێ)، بەیتی دووەمی موخلیس وەرگێران نییە تەنیا واتای گشتی بەیتی دووەمی حافزی وەرگرتووە، هەروەها بەیتی سێیەمیش بەم شێوەیە. بەیتی چوارەم وەرگێڕانە لەگەڵ کەمێ دەسکاری بەتایبەتی لەبەشی یەکەمی بەیتەکەدا کەوشەی (بنەوارە)ی بۆ زیاد کردووە، بەڵام بەیتی پێنجەم وەرگێڕان نییە وتەنیا لەواتادا هەندێ لێکچوونی لەگەڵ بەیتی پێنجەمی حافز هەیە و وشەی (سربلند، پست) لای موخلیس دووبارە بۆتەوە.

موخلیس:

لە بۆ کوێ تۆ بەهەشت هەروەك حیکایەت

جەماڵی حۆری بۆ رووی تۆ کینایەت

لەطیفـەی لێوەکەت ئەنفاسی عیسا

قسەی ئاوی بەقا دەیکا ریوایەت

چ عەترێکی دەداتن گوڵ بە عالەم

لەلای تۆ گەر لەبۆی بێتن ریعایەت

نیگارا من کەوا صەیدی حەرەم بووم

لەبەرچی دەمکوژی وابێ جینایەت

تکاکارم بەرابەر تاقی ئەبرۆت

لە دڵمان بۆچی ناکا هیچ سیرایەت

لەتۆ وەعدەی لیقا وەربگرێ هەرکەس

بەدونیا و ئاخیرەت ناکا کیفایەت

کەسێ بۆ مەنزیلی لەیلا بچێتن

بەرێگا ناکەوێتن بێ هیدایەت

خەیاڵی پەنگری رووتم لەدڵ دێ

لەدەست دۆزەخ ئەمن ناکەم شیکایەت

لە ناڵین ناکەوێ موخلیس هەتا، نێ

بەهاواری لەلای یار، یەك عینایەت/٢٨/٣٧

حافز:

ای روضه بهشت زکویت حیکایتی

شرح جمال حور ز رویت روایتی

انفاس عیسی از لب لعلت لطیفه

و آب خضر نوش دهانت کنایتی

کی عطر سای مجلس روحانیان شدی

گل را اگر نه بوی توکردی رعایتی

در آرزوی خاك در دوست سوختیم

یاد آور ای صبا که نکردی حمایتی

بوی دل کباب من آفاق گرفت

وین آتش درون بکند هم سرایتی

ای دل بهرزه دانش و دینت ز دست رفت

صد مایه داشتی و نکردی کفایتی

در آتش ار خیال رخش دست میدهد

ساقی بیا که نیست ز دوزخ شکایتی

دانی مراد (حافظ) ازین آه و ناله چیست

ازتو کرشمه و زخسرو عنایتی/دیوان حافظ، لیمودهی، ۲۷٦

ئەم غەزەلەی موخلیس درێژترین غەزەلە کە پەیوەندی بە غەزەلەکانی حافزەوە هەبێ و بەشی هەرە زۆر وەرگێڕابی. هەندێکیش واتای گشتی وەرگرتووە و لە سەرهەمان سەروای فارسیەکە داپڕشتۆتەوە. بەیتی یەکەم و دووەمی موخلیس وەرگێڕانی هەمان بەیتە فارسیەکانی حافزە و بەشی دووەمی بەیتی سێیەمی موخلیس وەرگێرانی هەمان بەشی حافزە و لەبەشی یەکەمی بەیتەکەدا تۆزی دەسکاری کردووە و لەجیاتی (مجلس روحانیان) کردوویەتیە (گوڵ بە عالەم). لەبەیتی چوارەمدا موخلیس هەندێ واتاکەی وەرگرتووە و وەرگێران نییە. بەیتی پێنجەم سەربەخۆیە و تەنیا لەوشەی (سیرایەت) هاوبەشی هەیە و سەرواکەی پێ ڕێکخستووە، بەیتی شەشەم سەربەخۆیە و تەنیا وشەی (کیفایەت)ی وەرگرتووە. بەیتی حەفتەم سەربەخۆیە بەیتی هەشتەم وەرگێرانە لەگەڵ تۆزێ لادان. بەیتی نۆیەمی موخلیس دەقی وەرگێرانی بەیتەکەی حافزە لەگەڵ دەسکارییەکی کەم و موخلیس لەجیاتی نازناوی (حافف) نازناوی خۆی (مخلص)ی بەکارهێناوە و وشەی (خسرو)ی پشتگوێ خستووە.

موخلیس:

لەو شوێنەی کە گەدا جاهو جەلال وەردەگرن

گەر دڵا تۆ لەگەدایی یەکەمین بی چ دەبی

گە ئەتوو تالیبی یاری لەسەروماڵ وەرەدەر

یار ئەگەر بوو بەسەبار، یار گەنەبوو با چ نەبی/دەستنووس، ۱۳۲

حافز:

در مقامی کەصدارت بە فقیران بخشند

چشم دارم کە بجاه از همە افزون باشی

در رە منزل لیلی کە خطر هاست بجان

شرط اول قدم آنست کە مجنون باشی/دیوان حافظ، لیمودهی، ٣٧٤

بەشی یەکەمی بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێرانی هەمان بەیتی حافزە و بەلام بەشی دووەمی بەیتەکە واتای بەیتەکەی حافزی وەرگرتووە و دەستکاری کردووە. موخلیس لەبەیتی دووەمدا تەنیا هەندێ واتای بەیتی دووەمی حافزی وەرگرتووە و موخلیس لەحافز زیاتر داهێنانی کردووە و داوای ئەوەی دەکات کە عاشق دەبێ لەسەر و ماڵی خۆی خۆشبێ ئەگەر یاری بوێ. بۆچوونەکەی موخلیس لەم بەیتەی مەحوییەوە نزیکە کە دەڵێ:

کە رۆحم تێکەیی تو حەز بە دەرچوونی دەکەی دەرچوو

دەبێ عاشق کە دی بێزارە یاری، بێ برۆ بڕوا/دیوانی مەحوی، ٣٥

موخلیس:

هەرچەندە گەنجی بۆچی مەغروری

چاکە عاشق نی بۆیە مەعزووری

دووریە لە عاشق دێوانەی عیشقە

تۆ دۆستی عەقڵی، پێویستە دووری

جێی مەستی عیشقە ئەو سەراپەردە

تۆ مەستی بادەی ناوی ئەنگووری

لێوی بەبار و رووی زەعفەرانی

بۆ عاشق دەدەن دەوای رەنجووری /دەستنووس، ١٨

حافز:

ای که دایم به خویش مغروری

گر ترا عیشق نیست معزوری

گر د دیوانگان عشق مگرد

که به عقل عقیله مشهوری

مست عشق نیست در سر تو

رو که تو مستی آب انگوری

روی زرد است و آه درد آلود

عاشقانرا گواهی رنجوری/دیوان حافظ، لیمودهی، ۳۷۸

بەیتی یەکەمی موخلیس وەرگێرانی بەیتەکەی حافزە لەگەڵ تۆزێ دەسکاری، چونکە موخلیس بەیتەکەی بەپرسیار دەست پێدەکات و کەچی لای حافز خەبەرە. لەبەیتی دووەمدا موخلیس واتای گشتی بەیتی دووەمی حافزی وەرگرتووە و بیرۆکەی خۆشی خستۆتە سەری. نیوەی یەکەمی بەیتی سێیەمی موخلیس پەیوەندی بە حافزەوە نییە و تەنیا نیوەی دووەمی بەیتەکە وەرگێڕانی نیوەی دووەمی بەیتی سێیەمی حافزە. بەیتی چوارەم وەرگێرانە لەگەڵ تۆزێ دەسکاری کە بریتیە لەوەی موخلیس دەڵێ (دەوای رەنجووری) کەچی لای حافز (گواه رنجوری) یە کە بەواتای شایەتیی رەنجووری دێت.

موخلیس:

کێیە ئەوڕۆکە لە مەیخانە مەقامێکی هەبی

وەکو جەمشید بەخسووسی دەم و جامێکی هەبی

چاوەڕێی بادی سەبان چەند دڵی هەروەك دڵی من

بەڵکو ئەو دەفعەیە یار بێت و پەیامێکی هەبی

گەر غەریبێ غەمزەی پێك بێ لەلای تو چ دەبی

تۆنەبی کێ هەیە لەوشارە کەنامێکی هەبی

نابێ بروا لەدەرت موخلیسی هێندە بە ئەمەك

دەبێ شاهی وەکو تۆ کۆنە غولامێکی هەبیدەستنووس، ۲۸۰

حافز:

ای که در کوی خرابات مقامی داری

جم وقت خودی، اردست بجامی داری

ای صبا سوختگان برسر ره منتظرند

اگر از یار سفر کرده پیامی داری

کامی ار میطلبد از تو غریبی چه شود

توتی امروز درین شهر که نامی داری

بس دعای سحرت حارس جان خواهد بود

توکه چون حافظ شبخیز غلامی داری/دیوان حافظ، لیمودهی، ۲۷۸-۲۷۹

موخلیس لەبەیتی یەکەمدا سەرەتا بە پرسیار دەستی پێکردووە، بەڵام لای حافز بەبانگکردن دەست پێدەکا، جگە لەمە موخلیس بەیتی یەکەمی حافزی وەرگێراوە لەگەڵ لادانێکی کەم لەبەشی دووەمی بەیتەکەدا، هەروەها بەیتی دووەم وەرگێرانە بە دەستکارییەوە و لەبەشی یەکەمیدا موخلیس (هەروەك دڵی مـن)ی بۆ زیاد کردووە. بەیتی سێیەمی وەرگێرانێکی دەقاودەقی فارسیەکەیە، بەڵام لەبەیتی چوارەمدا موخلیس بە دەسکارییەوە بەیتی چوارەمی حافزی وەرگێراوە و لەجیاتی نازناوی (حافظ) نازناوی خۆی (مخلص)ی بەکارهێناوە و بەشی یەکەمی بەیتەکە هێندە بەفارسییەکە ناچێت.

## ((قۆناغی وەرگرتنی واتا))

لێرەدا موخلیس بە هەندێ بەیتی حافز کاریگەر بووە و واتاکەی بەگشتی وەرگرتووە و بەکوردییەکی رەوان دایرشتۆتەوە، ئەمەش لەچەند بەیتێکی کەم زیاتر نییە، چونکە موخلیس لەقۆناغی وەرگێرانیش سوودی لە وەرگرتنی واتا وەرگرتووە و لەشوێنی خۆیدا ئاماژەیان بۆکراوە. لێرە بەدواوە چەند نموونەیەك لەوەرگرتنی واتا تۆماردەکرێن:

موخلیس:

میحراب و تاقی ئەبرۆت مەعبەدی ئەهلی عیشقە

پێی خۆشە دڵ نوێژی لەو جێیە داببەستی/دەستنووس، ٢

حافز:

در کعبه کوی تو هر آن کس که در ابد

از قبله ابروی تو در عین نمازست/دیوان حافظ/٣٥

لەم بەیتەدا موخلیس واتای بەیتەکەی حافزی وەرگرتووە و بەکوردییەکی رەوان کردوویەتیە شیعر لەگەڵ تۆزێ دەسکاری کە نوێژکردنی دڵە لەو کەعبەیەدا.

موخلیس:

مەسجید و دێر و کڵێسا هەموو جێی عاشقییە

چی هەیە نەقش و نیگار و دەر و دیواری تەیە /دەستنووس،٥

حافز:

در عشق خانقاه و خرابات فرق نیست

هرجا که هست پر توی روی حبیب هست

انجا که کاری صومعه را جلوه میدهند

ناقوس و دیر و راهب و نام صلیب هست/دیوان حافظ، لیمودەی، ٥١

لێکچوون لەنێوان بەیتەکەی موخلیس و دوو بەیتەکەی حافردا هەیە و موخلیس واتای گشتیی وەرگرتووە و بە دەسکارییەوە دایرشتۆتەوە و لەجیاتی (خانقاه و خرابات) هەستاوە (مەسجید و کلیسا)ی بەکارهێناوە کە لە واتادا لەیەکدی دوور نین.*

کەوابوو هەردووکیان بەرەو بیرۆکەی یەکێتی عەشق یاخود یەکێتی ئاینەکان چوونە و لەروخساریشدا (عاشق، مەعشوق، مەسجید، دێر، کلیسا) دووبارە بۆتەوە لەگەڵ هەندێ جیاوازی لە دەربڕیند * هەرلەبارەی یەکیەتی ئاینەکانەوە بابا تاهیر دەڵێت:

کنشت وکعبەو بتخانەو دیر　　سرای خالی از دلبر نزونند/د.باباتاهیر/٦ =* =

هەروەها ئیبن عەرەبی دەڵێت:

لقد صار قلبي قابلاكل صوره فمرعی لغزلان ودیرلرهبان
وبیت لاوثان و كعبه طائف و الواح توراه و مصحف قران

ترجمان الاشواق، ابن عربي، بیروت، ص٤٢

موخلیس:

میحراب و تاقی ئەبرۆت مەعبەدی ئەهلی عیشقە

پێی خۆشە دڵ نوێژی لەو جێیە دابەستی/دەستنووس، ٣٠

حافز:

نماز درخم آن ابروان محرابی

كسی كند كه بخون جگر طهارت كرد/دیوان حافظ، لیمودهی، ٨١

بەیتەكەی موخلیس لە شوێنێكی دیكەش دووبارەبۆتەوە، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ ئەم بەیتەی حافزیش هەیە و واتا گشتیەكەی وەرگرتووە و هەردوو بەیتەكەی حافز و موخلیس باسی نوێژی عەشقی خوابی دەكەن و وشەكان زۆر خوازەن.

موخلیس:

بێ خەبەر بۆچی وەها بێ خەبەری

سەفەری گەرچی بەزاهیر حەزەری

كۆششێكی بكە تاپێت ئەكرێ

پسەری ئەورۆ، سبەینێ پدەری

نەبێ نازت نە بە زێڕ و نە بەزیو

تۆ بەدڵ مەعدەنی زێڕو زەبەری /دەستنووس، ٢٣

حافز:

ای بیخبر بكوش كه صاحب خبر شوی

تا راهر و نباشی كی راهبر شوی

در مکتب حقایق پیش ادیب عشق

هان ای پسر بکوش که روزی پدر شوی

بنیاد هستی تو چو زیر و زبر شود

در دل مدار هیچ چو زیر و زبر شوی /دیوان حافظ، لیمودهی، ۳۷۲

موخلیس له بەیتی یەکەمدا تەنیا هەندێ واتای لەبەیتی یەکەمی حافز وەرگرتووە و بە دەسکارییەوە نووسیویەتەوە. بەیتی دووەمی موخلیس وەرگێڕانی بەشی دووەمی بەیتی دووەمی حافزە و هیچ سوودی لەبەشی یەکەمی بەیتەکە وەرنەگرتووە. لەسێیەمدا موخلیس واتای گشتی بەیتی سێیەمی حافزی وەرگرتووە و بەهەندێ دەسکارییەوە وەریگێڕاوە و هۆنیویەتیەوە.

## ((موخلیس و شاعیرە عەرەبەکان))

ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە شیعرییە پێی دەگوترێ (بەراوردکاری)، ئەمە چەند مەرجێکی تایبەتی هەیە کەدەبێ لە هەردوو بەرهەمەکە هاتبنە دی. لەوانەش لایەنی مێژوویە. هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب لەسەرەتای پەیدابوونی ئیسلامەوە پەوەندیی مێژووییان بەیەکدیەوە هەبووە و کورد هەر زوو موسڵمان بووە و لەزۆر باردا مێژووی کورد تێکەڵی مێژووی عەرەب بووە، لەوانەش لایەنە ئەدەبیەکەی. لەبەرئەوەی رۆشنبیریی عەرەبی بەسەر رۆشنبیریی کورددا زاڵ بووە چونکە زمانی عەربی زمانی دەسەڵاتدار بووە و کوردیش ژێر دەستە بووە بۆیە لایەنە ئەدەبیەکەی هەندێ کاریگەریی ئەدەبی عەرەبی بەسەرەوەیە.

هەروەها مەرجێکی دیکەی بەراوردکاری جیاوازی زمان و کارتێکردنی ئەو زمانەیە لەسەر زمان و ئەدەبێکی دیکەدا. زمانی کوردی و عەرەبی جودان و لە رێگەی ئاینیەوە کاریگەریی بەسەر زمان و ئەدەبی کوردا هەبووە و خوێندنی ئەو سەردەم لە حوجرەکان بە زمانی عەرەبی بووە، ئەوکارتێکردنەش لەو کۆمەڵە وشە و زاراوەیە دەردەکەوێ کە چوونەتە ناو زمانی نووسینی کۆنی کوردییەوە. ئەمەش تەنیا کوردی نەگرتۆتەوە بەڵکو هەموو ئەو میللەتانەی گرتۆتەوە کە عەرەب نەبوون.

هیچ شاعیرێکی کۆنی کورد نەبووە کە لەحوجرە نەیخوێندبێ و زانیاریەکەی ئیسلامی و عەرەبی نەبووبێ، بەم پێیە شاعیرە عەرەبەکان بە پلەی دووەم کاریان لە شاعیرانی کورد کردووە.

لەبەرئەوەی هزر و رۆشنبیری میللەتی کورد لەگەل میللەتی عەرەب یەك بووە و ئارادەیەك چون یەك بیریان کردۆتەوە، بۆیە مەرج نییە موخلیس کاریگەریی ئەو هەموو شاعیرانەی لەسەربووبێ و زۆر ئاساییە کە وەکو یەك بیریان کردبێتەوە (تواردا لخواگر).

ئێستاش موخلیس لەگەڵ هەندێ شاعیر سۆفی عەرەب بەراورد دەکرێ و پلەی کاریگەرییەکە دەستنیشان دەکرێت.

# موخلیس و رابیعەی عەدەوییە (*)

هەرچەندە رابیعە دیوانی شیعری سەربەخۆی نییە، بەڵام لەسەرچاوە کۆنەکان شیعرەکانی بلاوکراونەتەوەوجاروبارێش تێکەڵی شیعری دیکەبووە.

موخلیس:

مەیلی وەسڵی یار منی خستە قەفەس

پێی نەهێشتم تاقەت و سەبر و هەوەس

غەیری فکری تۆ لە قەلبم دا نییە

رۆژ و شەو دێت دەچێ فکری چ کەس

حیثما کنت اشاهد حسنة

فهو محرابي الية قبلتي

قد هجرت الخلق جمعا ارتجي

منك وصلا فهو اقصى منيتي/الشعر الصوفي، عدنان حسين العوادي، ١٣٧

یارەکەی هەردووکیان ئاسایی نییە وخودایە، چونکە لای موخلیس هەموو دڵی داگرتووە و لای رابیعە بووەتە میحرابی کرنوش بردن و هەردووکیان لە عەشقی خودا لەکۆمەڵ دابڕاون و جگە لەو هیچیان ناوێ.

(*) ساڵی لەدایکبوونی دیارنییە و لە ١٨٥ك مردوو، سەرەتا گۆرانی بێژبووە و پاشان تۆبەی کردووەووازی لەدونیا هێناوەو بەرەو عەشقی خوایی چووەو لەقودس نێژراوە. طبقات الاولیاء، ص ٤٠٨.

# موخلیس و شافیعی (*)

موخلیس:

دەڕوا وەکو خەو وەسڵ و فیراق و هەموو (اضداد)

دونیا چ سەباتێکی نییە شیرن و تاڵی

شافیعی:

ولاتجزع لحادثة الليالي

فما لحوادث الدنيا بقاء /ديوان الشافعي، ١٥

ولاحزن يدوم ولا سرور

ولا بؤس عليك ولارخاء/د.الشافعي/١٦

موخلیس واتای هەردووبەیتەکەی شافیعی وەرگرتووە و نیوەی دووەمی هەردوو بەیتەکان بەیەکدی دەچن و وەرگێڕانێکی بەدەسکارییە.

موخلیس:

هەرکەسێ وا تێ بگا شەرع و تەریقەت لێك جودان

خۆی بە ئینسان چۆن دەزانێ؟ با بچێتە ناو کەران

شافیعی:

فقيها و صوفيا فكن ليس واحدا

فأني و حق الله اياك انصح /ديوان الشافعي، ٣٤

هەردووکیان لەو باوەڕەن کە زانایی و سۆفیاتی لێك جودا نین و پێکەوە ئایینی ئیسلام تەواو دەکەن و وەکو شێر و خەتی پارەی کانزان.

---

(*) ناوی محەممەدی کوڕی ئیدریسەلە١٥٠کلەشاری غەززە لەدایکبووە،رابەری مەزهەبی شافیعییە، لە٢٠٤ك لەمیسر لەشاری فوستات وەفاتی کردووە. دیوان الامام الشافعي، محمد عفيف الزعبي، ص٥.

موخلیس:

هەرچی دێتن غەم و شادی شەو و ڕۆژ

لای خودا دێ، پێی ڕەزا بە، دەنگ مەکە

شافعی:

دع الايام تفعل ما تشاء

وطب نفسا اذا حكم القضاء /ديوان الشافعي، ١٥

بەیتەکەی موخلیس وەرگێرانی بەیتەکەی شافیعیە و بەدەسکارییەوە واتاکەی تەواو وەرگرتووە.

موخلیس:

هەرچی خوا بۆی ئاشکرا کردی بەچاو یا خۆڵە خەو

هەر لەلای خۆت بابمێنێ، مەیخەرە سەر زار و دەو

شافعی:

اذا المرء افشى سرة بلسانة

ولام علية غيرة فهو احمق

اذا ضاق صدر المرء عن سر نفسة

فصدر الذي يستودع السر اضيق /ديوان الشافعي، ٦٥

بەیتەکەی موخلیس بەدوو بەیتەکەی شافیعی دەچێ و واتا گشتییەکەی وەرگرتووە و بە بەیتێ هۆنیوەیەتییەوە و داوای بە نهێنی کردنی بەهرەی خوایی یان زانستی خوایی دەکات.

موخلیس:

فیکر نێو چوونە جەهەننەم هاتە نێوخانەی خەیاڵ

دەرس و دەوری لێم مشەوەشکرد غەمی ماڵ و مناڵ

گەرچی خۆ زۆر زەحمەتە تەرکی وەتەن، کردوومە من

زۆر مونافینە لەگەڵ یەك، کەسبی عیلم و کەسبی ماڵ

شافیعی:

لا یدرك الحكمة من عمرة

یكدح في مصلحة الاهل

و لاینال العلم الا فتي

خال من الافكار و الشغل     /دیوان الشافعي، ٧١

جـۆره لێكـچوونێك لـەنێوان مـوخلیس و شـافیعی هەیـە و هـەردووكیان باسـی وەرگرتنی زانست دەكەن كە دەبێ دووربێ لە خـەیاڵی مـاڵ و منـداڵ. ئـەم دوو بەیتـەی مـوخلیس لەگـەڵ سـەعدی شـیرازیش بـەراورد كـراوە و نـاتوانین دوا بریـار بـدەین كـە كاریگەری كامیانی لەسەرە.

# موخلیس و حەللاج (*)

موخلیس:

روو لە دێر و کلیسا کە دەکەم تۆ سەبەبی

لە هەموو شوێنەوە گەر تۆ نەپەرستم چ بکەم

حەللاج:

واي الارض تخلو منك حتى

تعالوا يطلبونك في السماء/ ديوان الحلاج، ١٨

حەللاج پێی وایە خودا لە هەموو شوێنێکە (اینما تولوا فثم وجة الله)، کەواتە بەرەو یەکێتی بوون هەنگاوی ناوەبەڵام موخلیس لە یەکێتی بوونی حەللاج بەرەو یەکێتی ئاینەکان دەچێ و دەڵێ: خودایە کە روو لە دێر و کلیسا دەکەم بەدوای رووی تۆ دەگەڕێم، چونکە تۆ تەنیا لە مزگەوت نی و لە هەموو شوێنێکی پیرۆز دای.

موخلیس:

هەرچی خوا بۆی ئاشکرا کردی بەچاو یاخۆ لە خەو

هەر لەلای خۆت بابمێنێ، مەیخەرە سەر زار و دەو

حەللاج:

من لم يصن سر مولاه و سيده

لم يأمنوه على الاسرار ما عاشا / ديوان الحلاج، ٤١

سۆفی دەگاتە قۆناغێکی تایبەتی، فێری زانستی خوایی دەبێت، بۆیە موخلیس داوای پاراستنی ئەو نهێنیانە دەکات چونکە ئەوەی ئاشکرای بکات تێدەچێت. موخلیس بەم

---

(*) ناوی حوسێن کوڕی مەنسوورە و لە ٨٥٧ع لە دایکبووە، هاتۆتە بەغدا و رێبازی سۆفیەتیی خۆی بڵاوکردۆتەوە، لە ٩٢٢ع – ٣٠٩ك لە سێدارە دراوە. ديوان الحلاج، د. مصطفى كامل الشيبي، ص ١١ – ١٣.

بەیتەی حەللاج کاریگەر بووە کەداوای پاراستنی نهێنیە خواییەکان دەکات، کەچی خۆی نە یپاراست و لەسەریاندا.

موخلیس:

کە وەعدەت دا کە من بمرم ئەتوو دێی

خەنی خۆشیمە وا نێزیك وەفات بووم

حەللاج:

ان الحبيب الذي يرضيه سفك دمي

دمي حلال لة في الحل و الحرم /ديوان الحلاج، ٨٦

هەردووکیان لەوە دەگەنەوە یەکدی کەپێیان خۆشە بە دەستی یار بکوژرێن، واتا: لەپێناو یار خۆیان بکەنە قوربانی. موخلیس تەنیا ئەم بیرۆکەیەی وەرگرتووە.

# موخلیس و شبلی (*)

موخلیس:

تا خەریکی یادی تۆیم، هیچ کەسم نایێتە یاد

موفسیدی حوب و وەفایە، عالەمی کەون و فەساد

شبلی:

لیس یجري علی لساني شیئي

علم الله ذا سوی ذکرانا /دیوان ابي بکر الشبلي، ۱۱۷

هەردووکیان بەردەوام لە یادکردنەوەی خودا دان و هیچ شتێکی دیکەیان بەسەر زار دانایێ و بیر لە هیچی دیکە ناکەنەوە.

موخلیس:

خانەقا و مەیخانە هیچ فەرقی نییە بۆ عاشقی

بۆ هەمو جێ رۆیوە ئاسای نووری رووی حەبیب

شبلي:

فلما اراني الوجد انك حاضري

شهدتك موجودا في کل مکان /دیوان ابي بکر الشبلي، ۱۳۷

موخلیس بیرۆکەی بەیتەکەی شبلی وەرگرتووە و، زۆر جاران ئەمە لای موخلیس دووبارەبۆتەوە، کەواتە موخلیس باوەری بە یەکێتی بوونە ئیسلامیەکە و یەکێتی ئاینیە ئیسلامیەکە هەبووە، کەبریتیە لەوەی خودا لە هەموو شوێنێکە بە بێچوونی و ئاینەکان هەموو هی خوان و ئیسلام هەموو ئاینەکانی تێدا کۆیە.

---

(*) ناوی جەعفەری کوڕی یونسەو بەدەلەفی کوڕی جەحدەر ناسراوە،لە سامەڕا لەدایکبووەو لە٩٤٦ع مردووە، شبلی پەردەداری خەلیفە مووەفەقی عەباسی بووە. دیوان ابی بکر الشبلی، ص٢٣/٣٥.

# موخلیس و ئیبن عەرەبی (*)

موخلیس:

هەرچی خوا بۆی ئاشکرا کردی بەچاو یاخۆ لە خەو

هەر لەلای خۆت رابمێنێ، مەیخەرە سەر زار و دەو

ئیبن عەرەبی:

نبة على السر و لاتفشة

فالبوح بالسر له مقت /ديوان ابن العربي، ٣١

بەزۆری شاعیرە سۆفیەکان ئەم بیرۆکەیە دووبارە دەکەنەوە و داوای پاراستنی نهێنی عەشقی خودایی دەکەن، لە پێشتر سەعدی شیرازی و حەللاجیش هەمان بۆچوونیان هەبووە، جا دەشێ موخلیس لە یەکێ لەمانەی وەرگرتبێ.

موخلیس:

لەهەر جێگا تەجەللاگەر بکا یار

لەبۆ موخلیس دەبێتە کێوی توورم

ئیبن عەرەبی:

هو في الارض اله قادر

ومعى فى كل وجه اينما/د.ابن عربى/٨٩

موخلیس باسی دەرکەوتنی یار (خودا) دەکا کە لە هەموو شوێنێ هەیە، دەشێ وەری گرتبێ و هەروەها دەشێ لە قورئانی پیرۆزی وەرگرتبێ کەڕووی خودا لە هەموو شوێنێ هەیە ((اينما تولوا فثم وجه الله)) البقرە، ١١٥

---

(*) ناوی محەممەدی کوڕی عەلی کوری محەممەدی حاتەمیە، لەم نازناوانەی هەیە (ابوبکر، محی الدین، حاتمی، ابن عربی)، لە مەرسیەی ئەندەلوس لە ٥٦٠ك/١١٦٤ع لەدایکبووە، لە٥٩٨ك/١٢٤٠ع لەشام مردووە. التصوف الاسلامی، د.زکی مبارك، ص ١١٩.

موخلیس:

خانەقا و مەیخانە هیچ فەرقی نییە بۆ عاشقی

بۆ هەمو جێ ڕۆییوە ئاساری نووری ڕووی حەبیب

ئیبن عەرەبی:

فانظرة في شجر و انظرة في حجر

وانظرة في كل شيء ذلك الله / ديوان ابن عربي، ٢١٦

موخلیس:

مەسجید و دێر و کلێسا هەموو جێی عاشقییە

چی هەیە نەقش و نیگار و دەرو دیواری تەیە

ڕوو لە دێر و کلیسا کە دەکەم تۆ سەبەبی

لە هەموو شوێنەوە گەر تۆ نەپەرستم چ بکەم

ئیبن عەرەبی:

لقد حار قلبي قابلا كل صورة

فمرعى لغزلان و دير لرهبان

وبيت لاوثان و كعبة طائف

و الواح توراة و مصحف قرآن / مقدمات في الشعر

السومري، طراد الكبيسي، ١٩٢

موخلیس و ئیبن عەرەبی هەردووکیان لە عەشقی خودا نقوم بوونە و خۆشەویستی خوایی ئاینی ئەوانە، موخلیس بیرۆکەی بەیتەکەی ئیبن عەرەبی وەرگرتووە لەگەڵ دەسکارییەکی کەم.

موخلیس:

مەستووری عیشقە موخلیس گەرنا خودای تەعالا

پێی داوە هەرچی عیلمە بیخاتە نووکی خامە

ئیبن عەرەبی:

خصصت بعلم لم يخص بمثله

سواي من الرحمان ذي العرش و الكرسي /محي الدين ابن

عربي، عبدالعزيز سيد الاهل، ٢٠٤

موخلیس بیرۆکەی بەیتەکەی ئیبن عەرەبی وەرگرتووە لەگەڵ هەندێ دەسکاری، موخلیس پێی وایە لەبەر عەشقە خواییەکەی ناتوانی بۆچوونە زانستیەکانی دەربڕێ و عەشقە خواییەکەش بەهرەکی خواییە و بەشێکە لە زانستی خوایی (علم اللدنی)، ئیبن عەرەبیش بە ئاشکرا دەڵێ خودا خۆی زانستی (لدنی) پێ بەخشیوم و لەو سەردەمدا بەکەس نەبەخشراوە جگە لەو نەبێت. کەواتە موخلیس و ئیبن عەرەبی هەردووکیان خاوەنی زانستی ئاسایی و زانستی خوایین.

# موخلیس و شاعیره کلاسیکیەکانی کورد

هیچ شاعیرێك نییە کەلەئەدەبی پێش خۆی پچرابێ و شیعری کەلە شاعیرەکان هەست و هۆشی گۆش نەکردبێ. موخلیسیش یەکێکە لەو شاعیرانە و بەرهەمی هەندێ لەشاعیرەکانی بەر لەخۆی خوێندووتەوە کاریگەری ئەوانی بەسەرەوە دیارە. چاکترین بەڵگەشمان بۆ ئەمە گوتەکانی خۆیەتی کە دەڵێ: "لەدەوروبەری ساڵی ١٩٣٠ کە ئەوسا تەمەنم بیست ساڵان بوو بەتەواوەتی شیعری ڕێکم داناوە و بەزۆری بەرهەمی نالی و سالی سنە و حاجی قادرم خوێندۆتەوە"[1]. لەجێگایەکی دیکەشدا دەڵێ (لەو شاعیرانە کە بەدڵمە و کاریان کردۆتە سەر شیعرەکانم بێخود و حەمدی و نالی و حەزین)ن[2].

جا ئەم گوتانەی موخلیس ئەوە دەردەخەن کە ئەدەب یەکەیەکی نەپچراوەیەو خەرمانێکە هەریەکە دێ سوارەیەکی دەخاتە سەر و دەوڵەمەندی دەکات.

نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە بەپێی قوتابخانەی فەرەنسی بەراوردکردنی دووبەرهەمی ئەدەبی لەیەك زماندا کارێکی بەراوردکاری نییە و بەرامبەرییە (موازنە)، بەڵام ئەم کارەی کەمن کردوومە بەپێی قوتابخانەی ئەمریکیە، چونکە لەو قوتابخانەیەدا جیاوازی زمان مەرج نییە بۆ لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری.

لەلایەکی دیکەوە مەرج نییە موخلیس شیعری ئەو هەموو شاعیرانەی خوێندبێتەوە و کاریگەرییان بەسەریدا هەبووبێ، بەڵکو دەشێ گەلێ لەو لێکچوونانە بۆ لێکچوونی ڕۆشنبیری دەروربەر بگەڕێتەوە.

منیش هاتووم جگە لەو شاعیرانەی کە موخلیس خۆی ئاماژەی پێ کردووە، گەلێ

---

(١) جەلال مەولوود، شاعیری دەشتی قەراج مەلا خەلیل موخلیس، بەیان ١١٢، ١٩٨٥، ل ٣٤.

(٢) جەلال سنجاوی، مامۆستا خەلیل موخلیس وەڵامی چوار پرسیار دەداتەوە، هاوکاری، ٢٣٢،١٩٧٤، ل ٦.

شاعیری دیکەم هێناوە و لەگەڵ شیعرەکانی موخلیس بەراوردم کردووە بەپێی مێژووی ژیانی ئەو شاعیرانە ڕیز بەندم کردوون و لە بابا تاهیرەوە تاکو قانیع هاتووم.

لەم بەراوردەدا جاری وا هەیە بەیتە شیعرێکی موخلیس لەگەڵ چەند شاعیرێ بەراوردکراوە و بەتەواوی نازانرێ ئایا موخلیس کاریگەری کامیانی بەسەرەوەیە.

ئێستاش وا لەو لاپەڕانەی کەدادێن بە نموونەی شیعرییەوە ئەم لێکچوونە نیشان دەدرێ. بەگشتی ئەم لێکچوونانە دەکەونە خانەی وەرگرتنی واتاوە و وەکو بەراوردە فارسیەکەنییە کە هەندێکی وەرگێڕانێکی تەواوی شیعرە فارسیەکان بێت.

# موخلیس و بابا تاهیری هەمەدانی

موخلیس:

عاشقی ڕۆژی ئەزە ل گەبرو موسڵمان و یەهوود

وا لەدەرگا بەتەمای خیلعەت و دیداری تەیە / دەستنووسی/١٠٢

باباتاهیر:

ئەگەر مەستانی مەستیم ئەز تە ئیمان

ئەگەر بێ پاو و دەستیم ئەز تە ئیمان

ئەگەر هیند و ئەگەر گەبر ئەر موسڵمان

بە هەر میللەت کەهەسیتم ئەز تە ئیمان /دیوانی بابا تاهیری عوریان، وەحیدی دەستگردی، ٢٨

هەردوو بەیتەکان لەچوارچێوەی یەکێتی ئاینەکان دەخوێنەوە، موخلیس پێی وایە گاور و موسڵمان و جوولەکە لەبەردەرگای خودا چاوەڕوانی دیاری بینینی خودان، بەڵام باباتاهیر خوازیاری ئیمانە لەخواوە جا چ هیندوسی بێ یان گاور یان موسڵمان.

هەروەها موخلیس لە بەیتێکی دیکەدا هەمان بۆچوون دووبارە دەکاتەوە و لەگەڵ بابا تاهیر پێیان وایە کە مزگەوت و دێر و کڵێسا هەموو جێگای خواپەرستین و شوێنی پیرۆزن، ئەمەش بەیتەکانە:

موخلیس:

مەسجید و دێر و کلێسا هەموو جێی عاشقیە

چی هەیە نەقش و نیگار و دەرو دیواری تەیە

بابا تاهیر:

کەنیشت و کەعبە و بتخانە و دەیر

سەرایی خالی از دولبەر ئەزوونەند /دیوانی بابا تاهیری عوریان٦٠

# موخلیس و نالی

موخلیس:

بێ خەبەر بۆچی وەها بێ خەبەری

سەفەری گەرچی بەزاهیر حەزەری

نالی:

دائیم لە حەزەردا سەفەری بە لەوەتەندا

غوربەت کەش و عاجز بە ئەگەر ئەهلی تەریقی/دیوانی نالی، ٣٧١

هەردووکیان باسی ژیانی مرۆڤ دەکەن کە دائیم نیە و کاتیە و ئەنجامەکەی بەرەو نامۆیی دەچێت، بەتایبەتی سۆفیەکان زۆر هەست بەم نامۆییە دەکەن و دەیانەوێ گیانیان بچێتەوە جیهانی باڵای پێشووی.

موخلیس:

دەستی خۆم دانا لەسەر ڕووم، لێوی خۆم جووڵاندەوە

زاڵمەی سۆر هەڵگەڕا، ئەبرۆی بزاوتن، یانی یۆخ

نالی:

گوتم ئایا بە زاری خۆت دە پرسی حاڵی زاری من

برۆی هێنایە یەك وەك شکڵی لا یەعنی کە بێزارم/دیوانی نالی،٣٧٨

موخلیس بیرۆکەی بەیتەکەی نالی وەرگرتووە و بەشێوەیەکی تازە دایڕشتۆتەوە، هەردووکیان لەبارەی زمانی هێما دەدوێن بەبرۆ کە ئەگەر هەردوو برۆیەکەی بێنەوە یەك شێوەی (لا) وەردەگرن، واتا: نا ڕازیبوونی یار.

موخلیس:

غەواسی فیکری موخلیس دوڕ دێنتە دەر لەدەریا

کڕیاری وەك نەبێتن، دانیشە وەك خەمۆشان

نالی:

عومرێکه به میزانی ئەدەب توحفه فرۆشم

زۆرم گوت و کەس تێ نەگەیی ئێستە خەمۆشم /دیوانی نالی،٢٨٠

موخلیس هـزری بەیتەکەی نـالی وەرگرتـووه ئـەویش ئـەبوونی خوێنـەری شـیعره لەسەردەمی نالیدا، وادیاره لەسەردەمی موخلیسیش هەر وابووه.

موخلیس:

بەوردی هەرکەسێ بێت و تەماشای شیعری موخلیس کا

چ بەیتێکی له کوردیدا به شیعری شاعیران نادا

نالی:

نالییا ئەم غەزەله تازه که تازەت گوتووه

بەدووسەد مەسنەوی[*] بولوبیی[**] لوبابی نادەم /دیوانی نالی، ٢٠٨

- هەردووکیان شانازی به شیعری خۆیان دەکەن، موخلیس وەکو نالی پێی وایه له شیعری کوردیدا هیچ شیعرێ ناگاته شیعرەکانی ئەو، بەڵام نـالی نـەك هەر بەشیعری کوردی نادا بەڵکو بەشیعری فارسیشی ناگۆڕێتەوه.

موخلیس:

هەتا تۆ ئاشنامان بووی، هەموو کەس ئاشنامان بوو

بەبێ لوتفی تووە وا لەدونیا لەمن بێزاره ئەورۆکه

نالی:

هەتا تۆم ئاشنا بووی، ئاشنام بوون

ئەمێستا موو بەمووم ئەغیاره بێ تۆ /دیوانی نالی،٣٨٢

---

(*) مەسنەوی: دیوانی شیعری مەولانای رۆمییەکه له ١٢٧٣ع مردووه. تێکستی ئەدەبی کوردی، د. محمد نوری عارف، ل ١٥

(**) کتێبی (سیف الدین امودی)یه و له ١٢٣٤ع مردووه. تێکستی ئەدەبی کوردی، د. محمد نوری عارف، ل ١٥.

موخلیس بەتەواوی کاریگەریی بەیتەکەی نالی پێوە دیارە و بەشێوازی خۆی دووبارە بەیتەکەی هۆنیوەتەوە.

موخلیس:

ئەم لاوە کو لەولاوە، تەماشاکە چ لاوە

وەستاوە، ئەوەند خاوە، دەڵێی خاوە، رووا‌وە

نالی:

لەولاوێکە لەولاوە بەئەم لاوە کشاوە

یا یاسەمەنی خاوە بەرووی رۆژدا رژاوە /دیوانی نالی، ٥٣٠

موخلیس نەك هەر لەرووی واتاوە چاولێکەری نالی کردۆتەوە، بەڵکو لەرووی روخساریش لەسەر هەمان کێش و سەروای بەیتەکەی نالییە و چەند وشەیەکی وەکو (لاو، لەولاو، خاوە) دووبارە کردۆتەوە.

موخلیس:

سەیری سەحراکە چ رەنگینە وەکو فەسڵی بەهار

قەترە قەترە چك چکەی، خووناوی دووچاوی منە

نالی:

هەرجۆگە و جێگێکی کەوا سوور و سوێرییێ

جێی جۆششی گریانی منە و خوێنە رژاوە/دیوانی نالی، ٥٣٦

موخلیس هزری بەیتەکەی نالی وەرگرتووە کە رژانی خوێنی شاعیرە و لەبۆتەیەکی نایاب و مۆسیقا ئامێز دایرشتۆتەوە. بەتایبەتی نیوە بەیتی دووەمی خاوەنی ریتمێکی بالآیە و وشەکانی زۆر گونجاون لەگەڵ یەکدی.

# موخلیس و سالم

موخلیس:

بەجامی زەڕ نیگار ساقی وەرە پەندێ لەمن ببیە

سەحەر گاهان بکە پەرهیز لەتیری دڵ برینداران

سالم:

لە هەناسەی منی مەزلوومی غەریب

خۆت بپارێزە لەوەختی سەحەرا /دیوانی سالم، ٢٣

خۆپاراستنی یـار لەپارانـەوەی بـەیانیان دووبـارە بۆتـەوە و نیـوە بـەیتی دووەمـی موخلیس بە بەیتەکەی سالم دەچێت.

موخلیس:

موخلیسی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن

خوونی گەش بۆ ڕۆژی دەعوا شاهید و نیشانەمە

سالم:

کە فەن پیراهەنم بێت و مەشۆن زەخمم وەسییەت بێ

بەخوێن ئالوودە ئازادن لەمەحشەردا شەهیدانت/دیوانی سالم، ٤٩

هەردووکیان باسی شـەهیدبوونی عاشق دەکـەن لـە عەشـقدا شـەهیدیش شوشـتنی نـاوێ چـونکە خوێنەکـەی شـایەتی شـەهیدبوونیەتی. بەیتەکـەی مـوخلیس هـەمان بەیتەکەی سالە و بەدارشتنێکی دیکەوە.

موخلیس:

جین و ئینسان و مەلەك جوملە نەباتات و جەماد

کائینات هەرچی هەیە پڕدەمی ئەزکاری تەیە

سالم:

ئینس و جین موعتەرەفی قودرەتی حەقن بە یەقین
(همه در زکر و مناجات و قیامند و قعود)

هەردوو بەیتەکە باسی زیکر کردنی مرۆڤ و جنۆکە دەکەن، بەڵام بەیتەکەی موخلیس گشتگیرترە و هەموو بوونەوەری گرتۆتەوە ((وان من شيء الا يسبح بحمده ولكن لاتفقهون تسبيحهم)) الاسراء/٤٤، دەشێ لێکچوونەکەیان بۆ یەکبوونی رۆشنبیریان بگەڕێتەوە کە رۆشنبیرییەکی ئیسلامی بووە.

موخلیس:

ئەوا دەستی لەنێو دەستی نیگاری خۆیەتی هەرکەس
متی بێکەس نەبێ دەستم خراوە دەست غەمان دیسان

سالم:

ئەبەدومك من غەمیش ساحێب وەفایە
رەفیق و هەمدەمی دێرینە بێ تۆ /دیوانی سالم،١١٢

لەبەر ئەوەی یار دڵی رەقە بەرامبەر عاشق، بۆیە عاشق هەمیشە لەگەڵ خەم هاودەمە و کۆنن لەگەڵ یەکدی.

موخلیس:

ئەگەر هەر موو زمانێکی هەبیتن
لەدەردی عیشقی تۆ بەستە زمانم

سالم:

وەفا ناکا لەگەڵ من موومیانی من سەری یەك موو
ئەگەر هەرموو زەبانێ بێت و دەرکا هەر زەبان مووێ
/دیوانی سالم، ١٥٥

ئەم وێنە شیعرییە کە هەر مووێك ببێتە زمانێك وێنەیەکی سواوی کۆنە و لە ئەدەبیاتی فارسییەوە هاتۆتە ناو کورد. موخلیسیش ئەم وێنەیەی دووبارە کردۆتەوە، جا چ لە سالی وەرگرتبێ یان لەشاعیرێکی دیکە، کورد یان غەیری کورد.

# موخلیس و مەلا وەسمان

موخلیس:

میحراب و تاقی ئەبرۆت مەعبەدی ئەهلی عیشقە

پێی خۆشە دڵ نوێژی لەو جێیە دابەستی/دەستنووس، ٢

مەلاوەسمان:

سۆڵ نییە مۆژگان چییە وەستاوە لەمیحراب

ئاخ شۆڕشی چاو خانی بڕۆی کردە موسەللا/دیوانی مەلا وەسمان، ١١٨

هەردوو بەیتەکە میحرابی بـرۆی یاریـان کردۆتـە جێگەی دا بەسـتنی نوێـژ، بـەڵام ئـەو یـارە یـارێکی دونیـایی نییـە و یـارێکی گیـانیی سۆفیانەیە، چونکە ئـەو عەشـقەی ئەوان مەبەستیانە عەشقێکی حەقیقیە و مەجازی نییە.

موخلیس:

ئەو شەوە کەون و مەکان عالەمی مولك و مەلەکووت

یەك بەیەك جوملە بەجوملە، وا سەنا خوانی تووە

مەلاوەسمان:

شەوهات و من و بادی سەبا غەمزە دەجووتین

سەییاحی فەزای عالەمی مولك و مەلەکووتین دیوانی مەلاوەسمان١٥١

هەردووکیان باسی شەوی میعراج دەکەن کە ئەهلی جیهان و ئاسمانەکان هـەموو لـە ستایـشی زاتـی (محمـد)دان، مـوخلیس چـەند وشـەیەکی لـە بەیتەکـەی مـەلا وەسمان دووبارەکردۆتەوە وەکو (شەو، عالەمی مولك و مەلەکووت).

موخلیس:

عاشقی رۆژی ئەزە ل گەبرو موسڵمان و یەهوود

وا لەدەرگا بەتەمای خیلعەت و دیداری تەیە / دەستنووسی/١٠٢

مەلاوەسمان:

موسڵمان مەحووس ڕوو لەرووت کەن

سوحوف باوێتە ئاتەش پووری تەرسا /دیوانی مەلا وەسمان، ٣٦

بەیتەکان لە چوارچێوەی یەکێتی ئاینەکاندان، ئەم بەیتەی موخلیس لەگەڵ چەند شاعیرێکی دیکەش بەراورد و بەرامبەری کراوە و ناتوانرێ پێداگری بکرێت کە لە کامیانی وەرگرتووە، یاخود ئایا بیرۆکەی بەیتەکە وەرگیراوە یان هەڵقولاوەی رۆشنبیری خودی شاعیرە؟

موخلیس:

وەعزی وەك ئاگر لەدەم دێتە دەرێ

قەلبی ساردی کاری لێ ناکا لەهیب

مەلاوەسمان:

لەوشکی کەللەتە واعیز هەمیشە

دەهەن پاراوی وەعز و سینە خالی /دیوانی مەلاوەسمان، ٣٤

هەردووکیان باسی ئامۆژگاری کردنی ئامۆژگاریکەری دڵڕەق و زمان لووس دەکەن، وەعزەکانی گەرمە و کار لە دڵی ساردی خۆی ناکا جا چۆن کار لەخەڵکی دەکات؟ موخلیس بیرۆکەکەی وەرگرتووە و بە شێوازی خۆی بەیتەکەی هۆنیوەتەوە.

# موخلیس و کوردی

موخلیس:

هەرچەندە کە موخلیس بە نەزاکەت ئەدوێتن

ئەو رافزی بابە ئەبەدا رێی غەنە نادا

کوردی:

ئەی دڵ بەتەمای رەحمی لەیار، تا بەلەدی بۆ چ

کەی رەحمی لەدڵدا بووە ئەو رافزی بابە/د.کوردی/٤٤

موخلیس لەرووی روخسارەوە دەستەواژەی (ئەو رافزی بابە)ی وەرگرتووە، لەرووی ناوەرۆکیشەوە باسی بێ رەحمی یاری وەرگرتووە بەشێوازێکی تازە بەیتەکەی هۆنیوەتەوە.

موخلیس

گەرچی زاهیر هەینەتێکی رووت و نابووتم هەیە

گەر خریدارم هەبیتن، قووت و یاقووتم هەیە

کوردی:

دوڕو یاقووت دەبارێ لەم کەلامە شیرینەی کوردی

خوا سا کوا لەدونیادا قەدر زانێ، خریدارێ؟/دیوانی کوردی، ٥٣

موخلیس هەردوو وشەی (یاقووت، خریدار)ی وەرگرتووە و لەلایەنی واتاشەوە هەمان واتای کوردی دووبارە دەکاتەوە، ئەویش نەبوونی کریاری دەقی شیعریە.

موخلیس:

موخلیسی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن

خوونی گەش بۆ رۆژی دەعوا شاهید و نیشانەمە

کوردی:

من کەکوشتەی تیغی عیشقم رۆژی دیوانی خودا

بۆچی شاهید بێنم ئاخر کفنەکەم خوێناوییە/دیوانی کوردی، ٥٢

هەردوو بەیتەکە باسی شەهیدبوونی عاشق دەکەن بەدەستی یار و خوێنی ڕژاویان دەبێتە شایەد لە ڕۆژی دوایی کەوا شەهیدی دەستی یارن، موخلیس زۆر وەستایانە واتای بەیتەکەی دارشتۆتەوە.

موخلیس:

من بەتەنیا غەم دەخۆم، غەم گۆشت و خوێنی من دەخوا

بۆیە یەك یەك دەندەکانم بووینە شەقڵەی بێ هەراش

کوردی:

من خەمم خوارد و خەمیش خوێنی جگەرمی خواردەوە

بۆیە گریام چەند بە چەند فرمێسکی خوێنینم نەهات/

دیوانی کوردی، ۱۱

موخلیس لەنیوە بەیتی یەکەم چاولێکەریی نیوەی بەیتی یەکەمی کوردی کردۆتەوە، بەڵام لەنیوە بەیتی دووەمی وێنەیێکی شیعری داهێناوە کە بەر لەو کەس بۆی نەچووە کە دەندەکانی وەکو شەقڵەی بێ هەراشی لێ بێت.

# موخلیس و حاجی قادری کۆیی

موخلیس:

لەسەراتا بەسورە ییا ئەسەری نووری ئەوە

لەوجوودی هەموو چشت مەسدەرە پێغەمبەری ما

حاجی:

تابڵێی فەرقی هەیە میهری من و ماهی فەلەك

لەسەراتا بەسورەییا، لەسەما تا بەسەمەك /دیوانی حاجی، ٦٩

لەرووی روخسارەوە موخلیس دەستەواژەی (لەسەراتا بەسورەییا)ی وەرگرتووە، بەڵام لەرووی واتاوە لێك دوورن، چونکە بەیتەکەی موخلیس لەبارەی حەقیقەتی محەمەدییە کە سەرچاوەی بوونەوەرە، بەڵام حاجی باسی جیاوازی جوانیی یارەکەی و مانگ دەکات کە ئەرز و ئاسمانە.

موخلیس:

سەیری ئەو چەرخەیە ناکەی کە چ تەبعێکی هەیە

دەوڵەتی داوە بەکەر، نیعمەتی داوە بەسەگان

حاجی:

هەر ئەدیبێك بووە ساخوا لەدەمی ئاوە بڵێ

دەوڵەتی داوە بەکەر، نیعمەتی داوە بەسەگان/دیوانی حاجی، ٨٣

موخلیس بەتەواوی نیوە بەیتی دووەمی حاجی وەرگرتووە و لەگەڵ نیوەی بەیتێکی خۆی تێهەڵکێشی کردووە، وادیارە موخلیس پێی وابووە کەئەم نیوە بەیتە لەگەڵ واقیعی ئەوسای دەگونجێت و مرۆڤی هیچ و پووچ و کوڕی ناکەس لەناز و نیعمەتن و خاوەن قۆناغیش لێکەوتوون.

**موخلیس:**

**لەتیفەی حاشیەی زولفی و نوکاتی ئایەتی حوسنی**

**کەشف ئاگری بەئاسانی بەسەد تەفسیری وەك کەششاف**(*)

**حاجی:**

**کەششافی رمووزی ئایەتی تۆ**

**تەفسیری کەبیری**(**) **فەخری رازی**

موخلیس واتای بەیتەکەی حاجی وەرگرتووە کەباسی جوانی رووی یارەو بە تەفسیری کەششاف رەمزەکانی لێك نادرێتەوە، کەواتە یارەکە ئاسایی نییە و بەیتەکان باسی جوانیی خوایی دەکەن.

**موخلیس:**

**وەعزی وەك ئاگر لەدەم دێتە دەرێ**

**قەلبی ساردی کاری لێ ناکا لەهیب**

**لەلای خۆت وایە تۆ ئەمڕۆ خەتیبی**

**لەکاری چاکە ئاگەی بێ نەسیبی**

**حاجی:**

**گفتوگۆ حاسیلی هەموو بایە**

**عەمەلییاتە نانی تێدایە**

**عولەمامان بەقەولی بێ سەروپا**

**پاکی خنکا لەبەحری وشکی هەوا/دیوانی حاجی، ٢٣٦**

هەردووکیان لە ئامۆژگاریکردنی واعیزێ دەدوێن کە کار بەگوتەکانی خۆی ناکات بۆیە هیچ دڵێکی پێ نەرم نابێت، موخلیس واتای بەیتەکانی حاجی وەرگرتووە و بەشێوازی خۆی دایڕشتوونەتەوە.

---

(*) کەششاف: تەفسیری قورئانی (محمدعمر خوارزمی)یە لە ٤٧٦ك - ٥٣٨ك ژیاوە، بەپێی رێبازی موعتەزیلەیە و رووەکانی رەوانبێژیی قورئان دەردەخات. دیوانی نالی، مودەریس، ل ٦٨٨.

(**) تەفسیری کەبیر: هی (محمد عمرحسین الرازی)یە، پڕە لەفەلسەفەو کەلام و فیقهو رێزمان. التفسیر، د.محسن عبد الحمید وقحطان الدوری، ١٩٨٠، ص٣٢.

# موخلیس و شێخ ڕەزا

موخلیس:

بێ بوخار نابێ چ بەحر و بێ دڕی نابێ چ گوڵ

وەك چرایی موصتەفایی و دووکەڵی بوو لەهەبی

شێخ رەزا:

(رەزا)ش لەو ئەسلەیە بیبەخشە یارەب چونکە قەت نابێ

گـوڵی بێخـار و بـەحری بـێ بوخـار و ئـاگری بـێ

دوود/دیوانی شێخ رەزا، ٣٤

مـوخلیس (گـوڵی بـێ خـار و بـەحری بـێ بوخـار)ی شـێخ رەزای وەرگرتـووە و سەرلەنوێ بەیتە شیعرێکی پێ هۆنیوەتەوە و لەنیوە بەیتی دووەمدا جۆرە دژ یەکەکی نیشان داوە لەنێوان چرای موصتەفایی و (محمد) دووکەڵی گڕی ئاگر (ئـەبوو لەهـەب). بـوو لەهـەب دوو واتـا دەبەخـشێ و شـاعیر مەبەسـتی پێـی ئـەبوو لەهـەبی مـامی پێغەمبەرە (ص).

موخلیس:

موخلیسا چەرخی فەلەك ملكەچی تۆبی چ دەبی

تۆ سەگی قاپیەکەیی جەددی حوسێن و حەسەنی

شێخ رەزا:

یا رسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف

داخل جنت شوم در زمره اصحاب تو/دیوانی شێخ رەزا، ٢١٥

هەردووکیان خۆیان بە سەگی بەردەرگای پێغەمبەر (ص) داناوە، ئەم بیرۆکەیە لە سەگی یارانی ئەشکەفتەوە هاتووە کە دەچێتە بەهەشتەوە.

موخلیس:

رەختی خۆت راکێشە مەیخانە ئەگەر فوربت دەوێ

ڕۆژ و شەو تەی ناکرێ بێ لێوی جامی زەرنیگار

شێخ رەزا:

ایها الناس چو من رخت به میخانه کشید

نه به مسجد که درو زاهدك بی دین است/دیوانی شێخ رەزا، ١٢٥

موخلیس رستەی (رەختی خۆت راکێشە مەیخانە)ی شێخ رەزای دووبارە کردۆتەوە و بەشێوازێکی دیکە بەیتەکەی هۆنیوەتەوە و نیوە بەیتی دووەمی پەیوەندی بەوەی شێخ رەزاوە نییە.

# موخلیس و مەحوی

موخلیس:

پێی ناگرێ، دەست هەڵگرێ موخلیس لە مەحەببەت

تا پیر دەبی هەر دێتەوە سەر دەوری منالی

مەحوی:

لەبێ کەتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشێ وەکو مندالێ

لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم/د.مەحوی/۲۲۱

موخلیس بیرۆکەی بەیتەکەی مەحوی وەرگرتووە کەپیر نەبوونی هەوەس و دڵی مرۆڤە و گەڕانەوەیەتی بۆ دەوری منداڵی.

موخلیس:

کە داوای ڕۆحی لێکردم، منیش ماچم تەمەننا کرد

کەزانائدم دڵی دەشکێ، دڵم نەشکاندو سەلماندم

مەحوی:

کە ڕۆحم تێکەیی تۆ حەز بەدەرچوونی دەکەی دەرچوو

دەبی عاشق کە دی بێزارە یاری، بێ برۆ بڕوا/دیوانی مەحوی، ۳٦

هەردووکیان باسی گوێڕایەڵی عاشق دەکەن بۆ مەعشووکەی ئەگەر لەسەردانیشی تێدابێ لەلایان ئاسانە. موخلیس گیانی خۆی بە ماچێ دەدا و مەحوی بەبێزەی برۆی دەدا و بەتاڵانی دەبات.

موخلیس:

عاشق و مەعشووقی وەك مەجنوون و لەیلای بێ غوبار

بوونە ئەستێرە لە ئاسمان شەو تەماشایان دەکەم

لاوی وەك فەرهاد و وەك مەم چوونە ڕێزی قوودسیان

من بەناو هێنانی وان وا دەردی خۆم دەرمان دەکەم

لەبەرزیی عیشقە وامەجنوون و لەیلا

لە ئەرزی وەك نەمان، جێیان سەما بوو

مەحوی،

ئەگەر لەیلا ئەگەر فەرهادە تا حەشر هەر ببن مەمنوون

لە یومنی عیشقە، فەیزی حوسنە، وا بەم ڕوتبە نائیل

بوون /دیوانی مەحوی،٢٥٠

موخلیس لە بەیتەکاندا بیرۆکەی بەیتەکەی مەحویی وەرگرتووە و ڕوونی کردۆتەوە کەبەرزی پایەی لەیلاو مەجنوون و فەرهاد و لەبەر بەرزیی پایەی عەشقە، ئەگینا زوو لەبیر دەکران و کەس ناویانی نەدەهێنا، بەڵام عەشقێکی پاکی بێگەرد وەك ئەوانە پێیدا چوون.

# موخلیس و ئەدەب

**موخلیس:**

**واعیز کە دوێنێ مەی سەرکۆنە دەکرد خۆی**

**ئەورۆکە ئەوا مەی بە عەمامە دەکڕیتن**

**ئەدەب:**

**سۆفی کە دووێ مەنعی ئەمی کرد و مەلامەت**

**ئەمڕۆ لە خەرابات، عەمامە لەگرەودا/دیوانی ئەدەب، ٢١**

هەردوو بەیتەکان لەرووی روخسار و واتاوە پێک دەچن و موخلیس کاریگەریی بەیتەکەی ئەدەبی لەسەرە و سۆفی کردۆتە واعیز و کڕینی لەجێی رەهن داناوە.

**موخلیس:**

**گۆی سەرم پێی ناکرێ بیداتە بەر شەق هیچ کەسێک**

**چونکە گۆی مەیدانی عیشق و دەست و چەوگانی تووە**

**ئەدەب:**

**هەتا چەوگانی زوڵفی تا بە نووسیتم بە قەف دیون**

**سەرم بۆ گۆی شەفەت حازر، دەفەرموو گۆ لەمەیدانە**

**/دیوانی ئەدەب، ٨٨**

موخلیس هەمان بیرۆکەی بەیتەکەی ئەدەبی دووبارە کردۆتەوە بەشێوازێکی دیکە، هەردووکیان باسی سەری خۆیان دەکەن کە لەمەیدانە بۆ ئەوەی بکەوێتە بەر قاشۆی زولفی یارەوە.

موخلیس:

تاسەحەر مەیخانە گەرمە، یار لەڕوو، ساقی لەڕێ

خۆشبێ یاخوا دەست و بادەی ساقی دەورانی ما

قەت لەدونیا بێ مەی و بێ موتریب و بێ یار مەبە

تاوەکو دەمری لەوانە قەت بەدڵ بێزار مەبە

تامەی بەردەوام بیتن و مەعشووقە بەکام بی

سوڵتانی جیهانم دەبی لەو ڕۆژە غوڵام بی

ئەدەب:

ساغەر بەکەف و بەخت قەرین، یار بەرابەر

چاوی بەدی لێ دووربێ، چ عەیشێکی تەمامە /دیوانی ئەدەب، ٩٦

بەیتەکانی موخلیس واتای گشتیی بەیتەکەی ئەدەبی تێدایە کە بریتییە لە هەبوونی مەی و ئامادەبوونی یار و رابواردن. بەیتەکانی موخلیس بەرەو لایەنێکی سۆفیانە چوونە و مەی و یار ئاسایی نین و رەمزئامێزن، بەڵام بەیتەکەی ئەدەب باس مەی و یاری دونیایی دەکات.

# موخلیس و حەمدی

موخلیس:

عاشقی رۆژی ئەزە ل گەبرو موسلمان و یەهوود

وا لەدەرگا بەتەمای خیلعەت و دیداری تەیە / دەستنووسی/١٠٢

حەمدی:

کوفر زاهیر نەبوو، لەباتیندا

کە یەهوودی و مەجووسی و تەرسابوون

هەموو یەك قەول و یەك زمان و یەك دڵ

بێ تەفاوت بە حەلقە وەستابوون /دیوانی حەمدی، ٥٥

هزری ئەم بەیتانە بەرەو یەکێتی ئاینەکان دەچێتەوە، هەر هێندەیە کەوا بیرۆکەی بەیتەکانی یەکە، ئەگینا مەرج نیە موخلیس وەری گرتبێت چونکە ئەم بەیتەی موخلیس لەچەند شوێنی دیکە لەگەڵ شاعیران بەراورد کراوە.

موخلیس:

لە دوو دونیا مەچوو، با ئەو لەدووت بێ

بزانە چی ئەڵێم گەر تۆ ئەدیبی

حەمدی:

تالیبی دونیا نەبی تۆ، ئەو بە تۆ تالیب دەبی

موشتەری نابێ لەبازارِ مەتاعی وا چرووك/دیوانی حەمدی، ٢٧٠

بەیتەکەی موخلیس هەمان واتای بەیتەکەی حەمدییە و داوای دوور کەوتنەوە لەدونیا پەرستی دەکات، مەبەستی شاعیران ئەوەیە با مرۆڤ نەبنە بەندەی دونیا و دونیا جڵەوی لەدەستی ئەواندا بێت.

موخلیس:

ئەهلی دینم بتپەرستی کارمە

باخەلیل بم ئازە ری رەفتارمە

چم لەمناحەمز لوتفی یارم گەر هەبی

ئاگری نەمروود وەکو گوڵزارمە/ دەستنووس، ١٠١

حەمدی:

ئەم فیراقە بۆ بوومە باعیسی شادیی رەقیب

ئاگری نەمروود ئەبێتە گوڵشەنی خاسی خەلیل/دیوانی حەمدی، ٣٣٦

لەم بەیتانە بیرۆکەی سووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم دووبارەبۆتەوە لەلایەن نەمرودەوە، هەرچەندە لێکچوونێ هەیە لەنێوانیان چەند وشەیەکی وەکو (ئاگری نەمروود، گوڵشەن، خەلیل) دووبارە بوونەتەوە، بەڵام مەرجیش نییە موخلیس لێی وەرگرتبێ.

گەر سەیری دوو بەیتەکەی موخلیس بکەین، دەبینین لەرووی هونەرییەوە لەوەی حەمدی بەرزترە و مۆسیقاکەی سوارترە.

موخلیس:

میحراب و تاقی ئەبرۆت مەعبەدی ئەهلی عیشقە

پێی خۆشە دڵ نوێژی لەو جێیە دابەستی

حەمدی:

برۆ زاهید موبارەك هەر بەتۆبێ مەسجید و میحراب

من و ئەبرۆی بتان و گۆشەیی مەیخانە تامردن/دیوانی حەمدی، ٢٠٥

موخلیس و حەمدی هەردووکیان بەرەو میحرابی برۆی یار دەڕۆن و لەوێ نوێژ دەگرن، بەڵام یارەکە ئاسایی نییە و خەرمانەیەکی پیرۆزی دەورەی داوە، چونکە حەمدی میحرابی مزگەفتی داوەتە زاهید و بەرەو خانەقا و رابەری تەریقەت هەنگاوی ناوە.

موخلیس:

موخلیسا چەرخی فەلەك ملكەچی تۆبێ چ دەبێ

تۆ سەگی قاپیەکەیی جەددی حوسێن و حەسەنی

حەمدی:

یا (محمد) رووڕەشی دەرگانەکەی تۆم تۆ بەبێ

هەرچی هەم بێ شك سەگی ئاسانەکە تۆم تۆبەبێ/دیوانی حەمدی، ٣٩٢

لەبەرئەوەی سەگەکەی یارانی ئەشکەفت چووەتە بەهەشتەوە، بۆیە ئەم بیرۆکەیە گەیشتووەتە شاعیران و خۆزگەیان بەو سەگە خواستووە، موخلیس و حەمدی هەردووکیان خۆیان بە سەگی بەر دەرگای پێغەمبەر(ص) دەزانن، کەواتە یارانی ئەشکەفت بە (محمد-ص) گۆڕدرایەوە چونکە ئەویش بەهەشتییە.

# موخلیس و کەمالی

موخلیس:

ئەوا دەستی لەنێو دەستی نیگاری خۆیەتی هەرکەس

منی بێکەس نەبێ دەستم خراوە دەست غەمان دیسان

کەمالی:

ئەوا جەژنە هەموو کەس دەس دەس لەمل یاران بەدڵشادی

بەتەنیا یارەکەی بێ رەحمەکەم دەستم لەمل ناکا/دیوانی کەمالی، ٢٨

هەردووکیان دوورن لە یار وخەڵکی لەخۆشی و شادین، لەرووی واتاوە پێك دەچن و لەسەرهەمان کێشیشن کە بەحری هەزەجی هەشت هەنگاوییە.

موخلیس:

میحرابی ئەبرۆی تۆم هەبێ، باروو لەقیبلە هەرنەبێ

دینم بە عیشقت گۆڕیەوە، هەرچی دەبێتن بابێ

کەمالی:

لە قیبلە رووی بەجاری وەرگەڕان بێ ئیختیار ئەمڕۆ

کەزاهید رووی نیگاری نازەنینی دی لەمیحرابا/دیوانی کەمالی، ٤٠

هەردووکیان دینیان بە عەشقی یار گۆڕیوەتەوە، کەواتە یارەکە خودایە، چونکە مەبەست لە دین چوونە بەهەشتە بۆ دینی یار کە خودایە.

موخلیس:

موخلیسی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن

خوونی گەش بۆ رۆژی دەعوا شاهید و نیشانەمە

کەمالی:

تیرە بارانی کە کردم یار بە برژانگی گوتی:

ئەم شەهیدی عەشقە بۆ مەحشەر جلی خوێنین ئەبا

/دیوانی کەمالی، ٦١

موخلیس:

عەقڵ و دین مەنزەری عاشق نییە موخلیس کەم و زۆر

سەیری سەنعانی بە زوننارەوە حەیران دەگەڕا

کەمالی:

کە دیم زوننار زولف و پەرچەمی وەك شێخەکەی سەنعان

قبووڵی مەزهەبی تەرساوو تەرکی عەقڵ و دینم کرد

/دیوانی کەمالی، ٦٦

موخلیس:

لەرووی روخسار و واتاوە کاریگەری بەیتەکەی کەمالی بەسەرەوەیە، ئەم وشانە (عەقل، دین، سەنعانی، زوننار) لە هەردوو بەیتەکە هەن و لەلایەن واتاشەوە هەردووکیان وازیان لە عەقڵ و دین هێناوە وە بەرەو مەزهەبی تەرسا (مەسیحی) چوو ئەو دینی کچەکەیان قەبووڵ کردووە.

موخلیس:

پێی ناکرێ، دەست هەڵگرێ موخلیس لە مەحەببەت

تا پیر دەبێ هەر دێتەوە سەر دەوری منالی

کەمالی:

لەحەفتا تێپەڕیوم و وا ئەزانن پیر و داماوم

لە سایەی عەشقەوە واتازە مشغوولی گڕوگاڵم/دیوانی کەمالی، ٧٤

ئەو عەشقەی موخلیس و کەمالی هەڵیان گرتووە تەمەن و پیربوون نازانێ و هەردەڵێی تازە پێیان خستۆتە مەیدانی عەشقەوە و لە گڕوگاڵدان. کەواتە مادام عەشقی عاشقەکە پیربوونی بۆ نییە، دەبێ مەشووقیش کە خودایە پیربوون نەزانێ. موخلیس هەمان واتای بەیتەکەی کەمالی دووبارە کردۆتەوە.

موخلیس:

ئەو کەسانەی زەرگ و شەری لێ دەدەن

بابوێرن خۆ لەدینی حەق بدەن

ئەو کەسانەی زەرگ و شەرلێدان دەکەن

دین بەخێوکردن ئەگەر ئازان، دەکەن

کەمالی:

نەگبەتی و بێ عەقڵی داوێن گیری ئەم کوردانەیە

بۆیە تازە حەز لە زەرگ و تەپڵ و دەف لێدان ئەکەن

/دیوانی کەمالی، ٩٢

هەردووکیان دژی زەرگ و شمشێر لێدانی دەروێشەکانی قادرین، چونکە بیدعەیە و لەسەردەمی عەبدولقادری گەیلانی نەبووە، موخلیس وەکو نەقشبەندییەك باوەڕی پێی نییە و کەمالیش هەمان بۆچوونی هەیە.

موخلیس:

میحراب و تاقی ئەبرۆت مەعبەدی ئەهلی عیشقە

پێی خۆشە دڵ نوێژی لەو جێیە دابەستی/دەستنووس، ٢

کەمالی:

شێت نییە روو کاتە تاقی گڵ (کەمالی) بۆ نوێژ

رووی نیازی خۆی لەمیحراب و دوو ئەبرۆ کردووە

/دیوانی کەمالی/ ١٢٠

واتای هەردوو بەیتەکان لەتاکە خاڵێك یەك دەگرنەوە کە ئەوانە لەنوێژیاندا رووله تاقی برۆی یار دەکەن نەك تاقی گڵ و میحراب.

موخلیس:

گۆی سەرم پێی ناکرێ بیداتە بەر شەق هیچ کەسێك

چونکە گۆی مەیدانی عیشق و دەست و چەوگانی تووە

کەمالی:

**سەری من چاترە بەخوا لە فتبۆلّ بیدەرە بەر شەق**

**هەتا گو بۆم ببێتە باعیسی فەخرو سەرئەفرازی/دیوانی کەمالی، ١٢٩**

سەری هەردووکیان گۆی مەیدانی عەشقە و لەیار زیاتر کەس ناتوانێ بیداتە بەر شەق. لیێرەدا کەس ناتوانێ شەق لەسەری موخلیس هەڵ بدا چونکە لەمەیدانی عەشقی راستیدا تاکە سوارە، بەلاّم لای کەمالی پلەیەك نزمترە و حەز دەکات بیدەنە بەر شەق لەجیاتی تۆپ بۆ ئەوەی بۆی ببێتەمایەی شانازی. کەوابوو کەمالی پلەیەکی ماوە تاکو بگاتە پایەی موخلیس لە عەشقدا.

# موخلیس و بێخود

موخلیس:

حەز دەکەی وەك چوویە (تەقتەق)تەق نەکەی

تا لەوێ جێگا بە لەقلەق لەق نەکەی

بێخود:

گەرەکتە گەر نەکەی وەختێ کەچوویە شاری (تەقتەق)تەق

دەخیلت بم نەکەی قەت جێ بەتەیری (حاجی لەقلەق)

لەق/دیوانی بێخود، ١٥٧

موخلیس بەتەواوی چاولێکەری بەیتەکەی بێخودی کردۆتەوە و لەرووی روخسارو واتاوە پێی کاریگەر بووە، ئەم کاریگەریەش گومانی تێدا نییە، چونکە موخلیس خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا ناوی بێخودی هێناوە کە کاریگەریی بەسەریەوە هەبووە.

موخلیس:

وا لەدەست دەردی جودایی هەر بەناو ماوە دڵم

گەر خودا چارم نەکا، مەعلوومە فەوتاوە دڵم

بێخود:

مەعلووم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە

وام زانی کەفەوتاوە، نەفەوتاوە دڵی من /دیوانی بێخود، ٦٧

هەردووکیان باس فەوتانی دڵ دەکەن لەبەر دوور کەوتنەوە لە یار، لای موخلیس فەوتاوە لەبەر جودایی، بەڵام لای بێخود نەفەوتاوە چونکە چووەتە خزمەتی یار (پێغەمبەر-ص) لە مەدینە.

موخلیس:

چونکی بیماری خەدەنگی لێو عەقیقی یەمەنم

فەرموو بنوارە هەناو پڕ لە خوێناوە دڵم

بێخود

یا بۆ جگەری کون کون و سەد پارە کراوی

دایم غەم و بێداری یو خوێناوە دڵی من/ دیوانی بێخود/ ٦٧

لەرووی واتاوە هەردوو بەیتەکان پێك دەچن، بەڵام مەرج نییە کاریگەریی بێخودی لەسەر بێت.

# موخلیس و حەزین (*)

موخلیس:

فەزڵی سەحبی تۆ لەگەڵ ئەسحابی کەهفان لێك جودان

من موحیبی سەحبی تۆمە و سەگ موحیب بوو بۆ ئەوان

حەزین:

چۆن سەگی ئەسحابی کەهفان بچتە نێو قەسری جینان

من سەگی ئەسحابی تۆ ئەحمە قسووری عالیات /گۆڤاری

هەتاو، ژمارە:٧١، ساڵی ١٩٥٦، ل١١

هەردووکیان باسی یەك بابەت دەکەن و خۆیان کردۆتە سەگی یارانی پێغەمبەرو (ص) پرسیار دەکەن: چۆن سەگی یارانی ئەشکەفت بچێتە بەهەشتەوە و ئەوان نەچن؟ ئەم بیرۆکەیە زۆر کۆنە، بەڵام موخلیس مەسەلەی پرسیارەکەی لە (حەزین) وەرگرتووە و پێیان وایە ئەوان زیاتر شایانی چوونە بەهەشتن.

موخلیس:

خۆشترین چشتە لە دونیا سەربەخۆیی موخلیسا

بێ لەدین، دونیا هەمووی پێشکێشی کوردستان دەکەم

(*) حەزین: ناز ناوی (ملامحمدامین)ی سوێرییە و لە گوندی سوێریی سەربە ناحیەی گوێڕ لە ساڵی١٩٠٥ع لەدایکبووە، لە ١٩٤٢ع لەلای مەلا ئەفەندی ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە، مەلایەکی زاناو لە خواترس بووە، لە ساڵی١٩٦٣ع لە ناحیەی دووبز(دبس) وەفاتی کردووەو گۆڕەکەی لەوێیە. ئەم زانیاریەم لە مەلا محەممەدی کوڕی وەرگرت.

حەزین:

چم لەسەعیی میللیە بۆ سەرکەوتن

هەرزەمانی دینی خوا مەقسەد نەبی  دەستنووسی مەلا

تاهیری بەحرکەیی

هەردووکیان دین و دەوڵەتیان بەیەکەوە دەوێ، ئەویش لەکاتی خۆی نەحمەدی خانی داوای کردووە و گوتوویەتی (تەکمیل دکرن مە دین و دەوڵەت)، کەواتە هەردووکیان دەوڵەتێکیان بۆ کورد ناوێ گەر ئیسلام لەناو ببات، بەتایبەتی حەزین خۆی دوور دەگرێ لەو خەباتەی کە بەرژەوەندیی ئاینی ئیسلامی تێدا نەبێت و ببێتە هۆی گزبوونی.

# بەشی سێیەم

## ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی
## هەندێ لە شیعرەکانی موخلیس

- شیعری سۆفیانە
- پایەی موخلیس لە سۆفیگەریدا
- شیعری ئایینی
- شیعری دڵداری
- وەسفی سروشت و ژن
- شیعری نیشتمانی
- شیعری کۆمەلآیەتی
- شیعری لاواندنەوە
- شیعری ستایش
- دوو بەیتەکان
- تاك بەیتەکان

# ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی
# هەندێ لە شیعرەکانی موخلیس

موخلیس وەکو زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش سەردەمی خۆی لەزۆربەی بابەتە شیعریەکانی نووسیوە و ئەسپی خۆی تێدا تاو داوە و توانیویەتی جێ پەنجەی خۆی لەناو شاعیران بکاتەوە و ببێتە خاوەن دەنگی خۆی.

هەرچەندە موخلیس کاریگەریی شاعیرانی فارس و عەرەب و کوردی لەسەر بووە، بەلام ئەمە لە پلە و پایەی کەم ناکاتەوە و شیعرەکانی هێندە زۆرن ئەوانەی کاریگەریی شاعیرانی پێوە دیارە ڕێژەیەکی زۆر کەمن. ئێستاش لەلاپەڕەکانی دادێ لەسەر بابەتە شیعرییەکانی دەدوێین.

# شیعری سۆفیانه

ئەگەر بەوردی سەیری ژیانی موخلیس بکەین، دەبینین هەر لە زووەوە - بە پێچەوانەی زۆربەی مەلایەکانی سەدرەمی خۆی - خۆی خستۆتە ژێر باڵی تەریقەتی نەقشبەندییەوە، چونکە بە ڕای ئەو تەریقەت و شەریعەت یەکن و ئەوانەی لایان وایە کە جیان، نەزانن:

هەرکەسێ وا تێ بگا شەرع و تەریقەت لێك جودان
خۆی بە ئینسان چۆن دەزانێ؟ با بچێتە ناو کەران

باب و باپیرانی موخلیس وادیارە سەر بەڕێبازی قادری بوونە و لەشیعرێکدا ستایشی کاك ئەحمەدی شێخ دەکا و لەکۆتاییدا ڕوونی دەکاتەوە کەهەتاکو ئیزنی وەرنەگرتووە نەچووەتە ژێر سایەی تەریقەتی نەقشبەندییەوە، ئەمەش شیعرەکەیە:

باب و باپیرم کەوا حەلقە بەگۆشی تۆ بوون
هەروەکو هەوری بەهار بارێوە لوتفت بۆ ئەوان
ئەو وەزیفەی تۆ بەوانت داوە بۆ ئەو هاتووم
چونکە میراتی چکەس نادرێ بەغەیری واریسان
بابفەوتێم گەر منیش لامدا لەسەر ڕێگەی وەفا
بابڵێن ئەوجا بەڕاستی تیرەیەکی بێ وەفان
ئێمە مەشهوورین بە کۆڵەی حەزرەتی کاك ئەحمەدی
مەحرەمم مەمکە بە مەحرووم هەروەکو نامەحرەمان
تاکو ئیزنی وەرنەگرت (موخلیس) لەکاك ئەحمەد(*) نەچوو
بۆ چ لایێ چاو بگێڕیتن لەشێخ و مورشیدان

---

(*) کاك ئەحمەدی شێخ لە١٢٠٨ك لەدایکبووەو لە١٣٠٥ك مردووە. تاریخ. ڕەنگە ئیزن وەرگرتنەکەی موخلیس بەخەون بووبێ چونکە جیاوازیی ژیانیان گەلێ زۆرە.

کەوابوو باب و باپیری موخلیس و مامەکەی کەناوی مەلا نەبووبەکربوە سەر بە ڕێبازی قادری بوون، بەڵام کە موخلیس ئیزنی وەرگرت بووە سۆفیەکی نەقشبەندی و شێخ مستەفای هەرشەمی دەکاتە رابەری خۆی و لەساڵی ١٩٤٤ بە شیعرێك ستایشی شێخ مستەفا دەکا و دەیکاتە غەوسی گەیلانی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە موخلیس جیاوازی نەکردووە لەنێوان هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی چونکە هەردووکیان سەر بە شەریعەتن و لەچەند جیاوازییەکی رووکەشی بەولاوە جیاوازییان نییە و کاتی خۆشی ((مەولانا خالیدی نەقشبەندی کە چووە هیند بۆ لای شێخ عوبەیدوڵلای دەهلەوی جگە لە تەریقەتی نەقشبەندی مۆڵەتی ڕێبازی قادریشی وەرگرتووە))[1]، موخلیس لەم رووەوە دەڵێت:

ع ئیکسیرێکە گەر کەسێ دەستی گیربێ لەدامانی
کەمالی دین و دونیا (ذوالجناحین) میسلی وی کانی
گوڵی گوڵزاری هەرشەم هەربمێنێ بەشقی یەزدانی
لەژێر چەرخی فەلەك قوربان ئەتوو ئەمڕۆکە سوڵتانی
لەنەشری دین وەلی عەهدی لە جێگەی غەوسی گەیلانی
لەژێر تاریکی ئەم عەسرە وەکو خورشیدی تابانی

شێخ مستەفا کە دەزانێ موخلیس زۆری لەباردا هەیە و مەلەوانێکی کارامەی دەریای سۆفیگەرییە و لەهەردوو زانستی شەریعەت و حەقیقەت پاراوە، ئیجازەی تایبەتی ڕێبازی نەقشبەندی پێ دەبەخشێت.

موخلیس میانەی لەگەڵ شێخ مستەفا خۆشبووە و گەلێ غەزەلی بەسەر شێخدا هەڵگوتووە و خۆشەویستی و دڵسۆزی خۆی بۆ دەربڕیوە. موخلیس لەو نەخۆشییەی کەپێی دەمرێت بە غەزەلێ ستایشی شێخ مستەفا دەکا و دەیکاتە جێگری پێغەمبەر (ص)، چونکە هەروەکو لە فەرموودەدا هاتووە ((العلماء ورثە الانبیاء))[2]، - هەروەها روونی دەکاتەوە کەڕێبازەکەی شێخ لەگەڵ شەریعەت یەکە و بیدعەی تێدا نییە و ئەوەی پەیڕەوی بکات بەهرەمەند دەبێت:

---

(١) تأريخ السليمانيه وأنحائها، ص ٢١٩.

(٢) النجم الزاهر، نكتل يونس كشمولة، ص ٤٩.

ئەو کەسەی ئەمڕۆ بەراستی نائیبی پێغەمبەرە[1]
دوور دیارە تاجی نەقشی نەقشبەندی لەسەرە
بیدعەتی تێدا نییە ئەو ڕێی کە ئەو پێدا دەچێ
ڕێیەکی ڕاست و بەرینە بێ خلیسك و خەتەرە
شارەزای ڕێ وابووە ترست نەبێ گەر بچیە دووی
بەس لەرێ ڕۆیشتنت وەك ئەو بەراستی هونەرە
ڕۆژ و شەو ئەو عالەمە دێن و دەچن بۆ خزمەتی
هەرچی دێتن گزە دێ، دەچتەوە کەیفی لەبەرە

کە لەپێشەوە گوتم موخلیس (بەپێچەوانەی زۆربەری مەلایەکانی سەردەمی خۆی) ڕێگای سۆفیەتی گرت، چونکە مەلایەکان پەیرەوی ڕوالەت (ظاهر) دەکەن کە شەرعە و سۆفیەکان بەرەو دەروون (باطن) دەچن کەجیهانی گیان و غەیبە، جا دەبینین موخلیس بە ئاشکرا بڕیار دەدات کە هەرکە لە مەدرەسە بووە دلێکی وشك و وێران و تاریکی هەبووە و بەروالەت لەشت گەیشتووە و قووڵ نەبۆتەوە و بەناخیاندا نەچووە.

بێگومان سۆفی هەتا دەروونی خۆی لە چڵکی دونیا پەروەری پاك نەکاتەوە، ناتوانێ هەنگاو بۆ لایەنی کەشف و پێشبینی بهاوێ، موخلیس بەزار و دڵ وازی لەدونیا پەروەری هێناوە و خۆی لە داوی نەفس پاراستووە، ئەمەش وەکو قۆناغی سەرەتای سۆفی بوونەکەیەتی، لەم حاڵەتەدا سۆفی گرنگی بەدونیا نادا و خۆی بۆ سبەینێ ئامادە دەکات:

کە ئەمڕۆ یا سبەی هەرکەس سەرین و پێخەفی خاك بێ
چ لازم بۆ فەلەك بڕوا لەبەرزی، تاقی هەیوانی

موخلیس ڕووی دەمی لەمرۆڤە دوو ڕوو و زاهیدە درۆزنەکان دەکات چونکە سەرقۆزی بن ئالۆزن نە بەکەڵکی دونیا دێن و نەبە کەڵکی ئایین:

---

(١) التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول، ج١، ص٦٣.

واعیز کە دوێنێ مەی سەرکۆنە دەکرد خۆی

ئەوڕۆکە ئەوا مەی بە عەمامە دەکڕیتن

زاهید کە لە بۆمەجلیسی مەی کارتی درابێ

سەیری لە خەمی خۆشی چاوان هەڵ ئەپەڕیتن

ئــەمجارە مــوخلیس گلــەیی لــەو خەتیبانــە دەکـات کــە هــەر قـسەیان هەیــە و بــێ کردەوەن، بۆیە دەیەوێ لە خانەقا بمرێ و چاوی بەو جۆرە خەتیبانە نەکەوێت:

لەمەیخانە دەبا بمرم نەوەك وەك ئەو خەتیبانە

لەسەر مینبەر سوراحیی مەی لەژێر جوببە و کەوابیتن

موخلیس بەرەو عەشقە خواییەکە چووە و گـوێی لـە پـەلاری ئـەملاو ئـەولا نییـەو داوا لەخۆی دەکات کە واز لە عەشق و کۆڕی خانەقا نەهێنێ و تووشی ڕیابـازی نـەبێت، ئەو عەشقەی موخلیس ناوی هێناوە عەشـقی خواییـە و مەیخانەکـەش خانـەقای پـیری تەریقەتە کە پێکی گیانیی لێ دەنۆشێ:

تەرکی عیشق و تەرکی مەیخانەکە مەکە

تازە با تووشی ڕیاکاری نەبین

مـوخلیس کـەوازی لـەجیهان هێنـاوە و ڕەخنـەی لەمـەلا و زاهیـدە نارێکـەکان گرتـووە ، ئینجا بـەرەو بارەگـای رابـەری سـۆفیگەری دەڕواو و بـۆی دەبێتـە چـرایێك و جیهانی واتای بۆ روون دەکاتەوە و دەیگەنێتە جاهو شکۆمەندی و لەرەنگی دوو ڕەنگـی و ریابازی رزگاری دەکات:

ناوونیشانت نەوێ تا بارەگای پیرۆزی یار

ڕووی نەدامێ یار هەتاکو ناوونیشانم نەبوو

گەهـ لەمزگەوتان خەریك بووم زیکر و تەهلیلەم دەکرد

گەهـ لە مەیخانە شەراب و لاوك و حەیرانم هەبوو

ڕەنگی دوو ڕەنگیم لەمەیخانە بەمەی شوشت ئافەرین

مورشیدێکی ناسیح و هیممەتی مەردانم هەبوو

پێم لەنێو مەیخانە دانا گەیمە نێو جاه و جەلال

تا لە نێو مەدرەسە بووم قەلبێکی وێرانم هەبوو

موخلیس کە ڕێگەی نەقشبەندی لە سۆفیگەری گرتووە بەشتێکی ئەزەلیی دادەنێ و ناتوانێ دەست بەرداری بێت هەرچەندە ئەم و ئەو گلەیی لێ بکەن و سەرکۆنەی بکەن:

حەلقەیی پیری موغانم لە ئەزەل

کردەگوێ چۆن دەبێ داینێم بەقسان

خاکی بەرپێت بخە سەر توربەتی من

دەبتە جێگەی سەری ڕەندانی جیهان

لەشوێنێکی دیکەدا ڕوونی دەکاتەوە کەهەر کە شەیتان لە ئەزەل دیتی کەوا موخلیس خاوەنی پلەو پایەیەکی بەرزە لەماقەمەکانی سۆفیانەدا ڕەشکی پێ برد و دەیەها داوی بۆ نایەوە تا لەخشتەی ببا و هەوڵ و کۆششەکەی بۆ گەیشتنە بارەگای بوون (وجود) بەفیڕۆ بڕوات، بەڵام شاعیر گوێی بەم فێڵانە نابزوێ و پیری تەریقەت فتوای حەڵاڵبوونی مەیی سۆفیانەی بۆ داوە، تازە پێویست ناکات پرس بە مەلایەکی شەریعەت زان بکات، چونکە شێخەکەی ئەو هەم شەریعەت ناسە و هەم تەریقەت زان:

کە ڕەقیب جاهو جەلالی منی دیت ڕۆژی ئەزەل

گوتی: ئاخر دەبێ من تووشی بەڵایێکی بکەم

قەتعی ڕێگەی عەدەمم کرد بەهەزار جەور و جەفا

تا لە ئیقلیمی وجوود سەیر و سەفایێکی بکەم

ساقیا مەی کە حەڵاڵ بێ بە قسەی پیری موغان

چ لزووم تازە بچم پرسی مەلایێکی بکەم

وادیاره موخلیس لەمەقامەکانی سۆفیگەری گەیشتۆتە مەقامی فەقر(*)، ئەو مەقامەی کەبەرزترین تاجی سەربەرزیی شاعیره، بۆیە بە پایەی پاشا و وەزیری ناگۆڕێتەوە:

گەر لەگەڵ فەقر و گەدایی عیزەت و جاهم هەبی

بۆچی خۆم تووشی غەمی کۆشك و سەراو سالۆن بکەم

هەر لەم بارەیەوە دەڵێ:

کەتاجی عیزەتی فەقرم لەسەرنا

قسەی ناکەم لەگەڵ شاه و وەزیران

موخلیس دەبێتە شاگردێکی دڵسۆزی مەیخانەی عەشقی خوایی و مەستی شەرابی پیری موغان دەبێت و گوێ ناداتە فتوای مەلایەکانی رووگەش بین، هەروەها مزگەفت بەجێ دێڵی و بەرەو مەیخانە (خانەقا) دەڕوا کەناوی ناوە (بیت الامان)، مەبست لە مزگەفت دەروچوون ووازهێنانە لەوانە گوتنەوەی فەقێیان و پێش نوێژیکردن و مەلایەتی و چوونە بەرەو خانەقای شێخ و جێبەجێکردنی رەوشەکانی سۆفیگەریە. لەم بەیتەدا شاعیر لاف پاشایەتی لێدەدا چونکە گەدای سوڵتانی عەشقە و بە کۆشکی قەیسەری ناگۆڕێتەوە:

من گەدای سوڵتانی عیشقم لافی شاهی لێ دەدەم

بەردەری مەیخانە جێم بێ، چم لەقەسری قەیسەری

هەر وەها دەڵێ:

لە مەیخانە ئەگەر مەرگم نەسیب بی

شەهیدی زاویەی (بیت الامان)م

* * * *

---

(*) فەقر: مەقامێکی پیرۆزەو بەسۆفیەکان دەگوترێ هەژارەکان، بەندە تەنیا پێویستیی بەخودا هەیە (واللةالغني وانتم الفقراء)، فەقر نەبوونی پێویستییە، فەقر هەر نەبوونی دەوڵەمەندی نییە بەڵکو گومکردنی ئارەزووی دەوڵەمەندیشە. معجم مصطلحات الصوفية، د. سعاد الحكيم، ص۲۰۷.

دڵ لە مزگەوت دەرچوو تووشی عوشرەتی مەیخانە بوو
یانی لەو سەیر و سەفایە نووری ئیمانم دەوێ

دوای ئەوەی موخلیس پشتی لەجیهان کرد و تانەی لەریاکارەکاندا و مزگەفت و مەدرەسەی بە جێهێشت و لەخانەقای پیری موغان نۆقرەی گرت و داورایەوە، دەبینین لەناو بۆتەی عەشقی خوایی دەتوێتەوە و وای لێدێت کەنووری خوا لە هەموو شوێنێ دەبینێ ((الله نور السماوات و الارض) النور/٣٥، هەموو شوێنێ بۆ ئەو دەبێتە کێوی توور چونکە خوای لێ دەرکەوتووە، پاراستر بڵێین نووری خوای لێ دەرکەوتووە:

لە هەرجێگا تەجەللا گەر بکا یار
لەبۆ موخلیس دەبێتە کێوی توورم

ئەوەی پێی لە گۆڕەپانی ئەم عەشقە خواییەنا، نە دونیای دێتە یاد و نە رۆژی دوایی چونکە وێڵی بینینی جوانیی یاری حەقیقیە و هیچ عەشقێکی دیکەی بەدڵدا نایێ:

با ئەوەی مەی نۆش دەکات رازی نیهانی تێ بگا
هیچ نەبێ با وابکا مەعنای نەزانی تێ بگا
نابی مەیلی دوو جیهان بچتە دڵی عاشق چ دەم
غەیری عیشقی توو دەبی باقی بە فانی تێ بگا

ئالێرەدا موخلیس بەرەو خۆشەویستی خوایی چووەو لەو عەشقە زێتر هیچی لە دڵدا نییە و هەر ئەوەی مەبەستە، هەروەك رابیعەی عەدەوییە گوتوێتی((الهی ما عبدتك خوفا من نارك و لاگمعا فی جنتك بل عبدتك محبه فیك))الفلسفه الصوفیه فی الاسلام،د.عبد القادرمحمود،ص٢١٧

# پایەی موخلیس لە سۆفیگەریدا

موخلیس وەکو سۆفییەکی نەقشبەندی لەچوارچێوەی شەریعەت بووە و پەیوەند بی زۆر خۆش بووەلەگەڵ رابەرەکەی، لە زۆر جێگا سەرزەنشتی زاهید و سۆفی و کۆلکە مەلایەکان دەکات، بەتایبەتی ئەوانەی کە رواڵەت بینن و چاوی دڵیان کوێرە.

موخلیس لە زانستی سۆفیگەریشدا شارەزا بووە و کۆمەڵێ وشە و زاراوە و حاڵ و مەقامەکانی سۆفیانەی لە شیعرەکانیدا بە کارهێناوە و جاروبارێش پەلی هاویشتووە بۆ هەندێ لایەنی سۆفیگەریی فەلسەفی، بەڵام لەم لایەنانە لە چوارچێوە ئیسلامییەکە دەرنەچووە و تەنیا چەند ئاماژەیەکی پێیان کردووە. ئەمەش شارەزایی موخلیس دەسەلمێنێ لەو بوارانەدا، وا لەخوارەوە ئاماژە بە چەند لایەنێکی سۆفیانەی فەلسەفی دەکەین کە موخلیس بۆیان چووە، بۆ نموونە:

١- **حلوول:** بەگشتی بریتییە لەوە کە گیانی خوا بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوەو مرۆڤەکە ببێتە بەشێك لە خودا. فەنا لای بەستامی بووە هۆی ئەوەی کەداوای یەکبوون لەگەڵ خودا بکات، بەڵام لای حەللاج گەیاندیە حلوول. هەرکە فەنا بەسەر حەللاجدا زاڵ بوو هەندێ گوتەی شەتەحاتی بەسەر زاردا هات و گوتە بەناوبانگەکەی (انا الحق)ی گوت و هەروەها لەم دوو بەیتە شیعرەدا دەڵێت:

انا من اهوی ومن اهوی انا
نحن روحان حللنا بدنا
فاذا ابصرتني ابصرتة
واذا ابصرتة ابصرتنا[1]

ئەم حلوولەی حەللاج داوای دەکات راستەقینە نییە، چونکە لەحاڵەتی فەنا و بێ ئاگاییدا روودەدات و سۆفی خۆی وا هەست دەکات.

---

(١) مدخل الى التصوف الاسلامي، د. ابو الوفا التفتازاني، ص١٥١.

موخلیس له بەیتە شیعرێکدا ئاماژەی بەگوتەکەی حەللاج (انا الحق) کردووە و پێی وایە ئەوەی ئەم گوتەیە ببیتە نەقشی خوێنی نیشانەی راستی خۆشەویستیتی لەگەڵ خودا، چونکە خۆشەویستی خودایی قوول بوونەوە و توانەوەی تێدایە و سۆفی دەگەیێنێتە مەقامی فەنا و پەیوەندی لەدەوروبەری دەپچڕێ، بۆیە نابێ گوێ بداتە قسەو قسەلۆکی بەدکاران:

لەیاری بێ غەشە ئەو کەس (انا الحق) نەقشی خینی بی
حیکایەت زۆر گوێ مەگرە لە هەرزەگۆیی بەدکاران

٢- یەکێتی ئاینەکان: یەکێتی ئاینەکان بیرۆکەیکی کۆنە و لەزووەوە هەندێ لەسۆفی و زانایەکان رایان گەیاندووە کە مەبەستی هەموو ئاینەکان گەرانەبەشوێن خوادا و گەیشتنە پێی، بۆیە پێیان وایە لەهەموو شوێنە پیرۆزەکان خودا دەپەرستریێ، لەم بارەیەوە (باباتاهیری هەمەدانی) دەڵێ:

کەنیشت و کەعبە و بتخانە و دە یر
سەرایی خالی ئەز دولبەر نەزوونەند[1]

ئیبن عەرەبی یەکێك بووە لە و سۆفیانەی کە باوەڕی بە یەکێتی ئاینەکان هەبووە و بۆیە لەم دوو بەیتەدا دڵی هەموو شێوەیەکی پێوە دیارە و دەمێ دەبێتە دێری مەسیحیەکان و ماوەیەك دەبێتە بتخانە و تاوێکی دی دەبێتە کەعبەی تەوافکەر و هەندێ جاریش دەبێتە لەوحەکانی تەورات و لاپەڕەکانی قورئان:

لقد حار قابلاً كل صورة
فمرعى لغزلان و دير رهبان
و بيت لاوثان و كعبه طائف
والواح توراة ومصحف قرآن[2]

یەکێتی ئاینەکان بەگشتی بەرەو دوو لایەن دەڕوات:

---

(١) دیوانی بابا تاهیری عوریان، وەحیدی دەستگردی، ل ٦.
(٢) ترجمان الاشواق، ابن عربی، ص ٤٣.

١- یەکێتی ئاینەکانی ئیسلامی: پێی وایە کە هەموو ئاینەکان لەخواوەن و پێغەمبەرەکان یەك لەداوی یەك نێردراون و هەر ئاینێك کە دێت ئەوی دیکە دەسڕێتەوە.

٢- یەکێتی ئاینەکانی فەلسەفی: پێی وایە هەموو ئاینەکان یەکن و جیاوازی لەنێوانیان نییە و ئەمەیان لەگەڵ ئیسلام ناگونجێت.

بە بۆچوونی من شاعیرە کوردەکان (سۆفیەکان) بەگشتی لەگەڵ یەکێتی ئاینی ئیسلامین و کە ناوی شوێنە پیرۆزەکانی وەکو دێر و کەنیسە دێنن مەبەست ئەوەیە خوایان تێدا دەپەرسترێ و شوێنی پیرۆزن.

موخلیس لە چەند بەیتێکدا ئاماژە بەهەندێ شوێنی پیرۆزی جوولەکە و مەسیحی دەکا و پێی وایە ئەو شوێنانە هەموویان خوایان تێدا دەپەرسترێ و خۆشەویستەکانی خوا لەو شوێنانە نۆقرە دەگرن:

مەسجید و دێر و کلێسا هەموو جێی عاشقییە

چی هەیە نەقش و نیگار و دەرو دیواری ئەیە

لەم بەیتەشدا موخلیس روونی دەکاتەوە کەخودا لەو شوێنە پیرۆزانە هەیە، بۆیە شاعیر رووی تێیان دەکا و خوایان تێدا دەپەرستێ، نەك هەر لەو شوێنانە بەڵکو ئامادەیە لەهەموو شوێنێ خودا بپەرستێ، چونکە خودا لە هەموو شوێنێکە ((اینما تولوا فثم وجة الله)) البقرە/١١٥:

روو لە دێر و کلێسا کە دەکەم تۆ سەبەبی

لەهەموو شوێنەوە گەر تۆ نەپەرستم چ بکەم

لەمەودوا لە چەند غەزەلێکی موخلیس دەدوێین کە لە چوارچێوەی وەسفی سۆفیگەری و سۆفیگەریدانە و هەوڵ دەدەین لایەنەکانی سۆفیگەرییان لێ دەستنیشان بکەین.

# سەنعانی[1]

دولبەرم دیت لەچەمان مەست و خەرامان دەگەڕا
جامی مەی پێبوو لە دوو مەجلیسی ڕەندان دەگەڕا[2]
دیدە شەو هەروەکو دەریا دوڕو مەرجانی ڕژاند
بۆیە دولبەر وەکو غەواس لەکەناران دەگەڕا[3]
دڵێ ونبووم کە گەڕام تا سەرو سۆراغی بکەم
لە بیابانی خەتام دیت لە غەزالان دەگەڕا[4]
ئەوی زاهید بوو دوێنێ کە نواڕیم بە دزی
عیشقی دونیای لەسەری دابوو پەرێشان دەگەڕا
عەقڵ و دین مەنزەری عاشق نییە (موخلیس) کەم و زۆر
سەیری سەنعانی بەزوننارەوە حەیران دەگەڕا[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن، فعلاتن، فعلاتن، فعلن. لەدەستنووسی (أ.ر)یە.

لەم غەزەلەدا موخلیس هێشتا لەسەرەتای ڕێگای سۆفیەتیدایە و دڵی لەسەر ئەو بەرنامەیە نەچەسپیوە و هێشتا بەتەواوی ڕابەری خۆی دەستنیشان نەکردووە، چونکە دڵەکەی وێڵە و کوردستانی بەجێهێشتووەو گەیشتووەتە وڵاتی خەتاو خوتەنی تورکستانی چین و بەدوای ڕابەردا دەگەڕێ.

کەواتە موخلیس نەك هەر خۆی هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ڕاستییە بەڵکو زاهیدەکانی سەردەمی خۆشی بە ڕواڵەت زاهیدن و لە ناخەوە هێشتا پەیوەندییان بە جیهان ویستییەوە ماوە، یاخود سەنعان ئاسا لەنێوان عەشقی مەجازی و حەقیقی گیریان خواردووە و سەریان سوڕماوە و بەلایەکدا نەکەوتوون.

(٢) خەرامان: ڕۆیشتنی بەلەنجەولار. لەدوو: لەشوێن. (لەدوای)

(٣) دوڕ: بەردێکی بەنرخە (مرواری گەورە). مەرجان: مرواری بچووك لەنێوان (دەریا دوڕ و مەرجان)دا گونجان هەیە.

(٤) سۆراغ کردن: گەڕان بەدوای شتێکدا. خەتا: ناوی کۆنی وڵاتی چینە کە بە میسك بەناوبانگ بوو.

(٥) سەنعانی: شێخی سەنعان کە خاوەن (٥٠٠) مورید بووە و دڵی چووەتە کچە گاورێك و چووەتە سەر دینی ئەو و وازی لە ئیسلامەتی هێناوە و بووەتە بەرازەوان پاشان هاتۆتەوە سەر ئاینی ئیسلام.

زوننار: پشتێنی قەشەکانە.

واتا: عەشق پەردەی بۆ نییە و عەقڵ و دین نایگرێتەوە، هەروەکو شێخی سەنعان کە عەشقی کچە مەسیحییەك پەڕییە دڵی و وازی لە عەقڵ و ئاین هێنا.

# (سەبا - سبأ)[1]

نەسیمی بای شەماڵ بابێ لە ئیقلیمی وەفاداران

لە پایتەختی (سەبا) هودهود چ بینێ چاکە بۆ یاران[2]

لەبازاڕی دوڕو گەوهەر فرۆشان ساغی مەرغووبە

نەماوە قیمەتی ئەمما لەبازاڕی ریاکاران[3]

هەزار گوڵ وا لەباغیدابە ڕوو سۆری دەغومرێتن

کەچی هیچ بولبولێ نابێ جریکەی بێ لەسەرداران[4]

بەجامی زەڕنیگار ساقی وەرە پەندێ لەمن ببیێ

سەحەرگاهان بکە پەرهیز لە تیری دڵ برینداران[5]

لەبۆ سوڵتانی من نابێ لەپەردەی کیبریا دەربێ

کە گول دە رهات لەپەردەی خۆی بووە مەنزووری ئەغیاران[6]

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی موسەببەغە: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان.

(٢) سەبا: سەبەو پایتەختی بەلقیس بوو لە یەمەن ((فمكث غير بعيد فقال احطت بما لم تحط به و جئتك من سبأ بنبأ يقين)) النمل/٢٢. ئاماژەیە بۆ چیرۆکی حەزرەتی سلێمان و بەلقیس ((وتفقد الطير فقال مالي لا أرى الهدهد أم كان من الغائبين)) النمل/ ٢٠.

(٣) واتا: موخلیس ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەبازاڕی سۆفیگەری پێویستی بە مرۆڤی ڕاستگۆیە و وەکو بازاڕی دوڕ و گەوهەر فرۆشتنە، بەڵام ئێستا ڕیاباز هێندە زۆر بوونە نرخی ئەو بازاڕەیان لەهێشتووە و ساغی بەدەست ناکەوێت.

(٤) سۆر: سوور. دەغومرێتن: خۆی ئارایشت دەدا.

واتا: شاعیر پێی وایە شێخی تەریقەت لە خانەقادا زۆرن و هێندە جوان و ڕێك و پێکن، کەچی هیچ موریدێ یان سۆفیێ دیار نییە بێتە خزمەتیان و سلووك وەرگرن.

(٥) ببیێ: ببیستە. سەحەرگاهان: سەحەر: سەحەر + گاه (کاتە) + ان (کۆ)– کاتی بەیانیان. بکە پەرهیز: خۆت بپارێزە. زەڕنیگار: زێڕین.

(٦) سوڵتان: پیر، شێخ. کیبریا: زاراوەیەکی سۆفیەتییە لە هەموو گەورەیەك گەورەتر. تەسەوف چیە، ل ٣١٤. مەنزوور: بەرچاو، مەبەست.

واتا: شێخی تەریقەت باخۆی بە هەموو کەسێ نیشان نەدا بەتایبەتی ناحەزەکان چونکە گوڵ تا خونچەیە کەس نایبینێ، کە پشکووت هەموو چاوێك بەدیی دەکات هەتا چاوی ناحەزیش. وادیارە موخلیس پێی ناخۆشە کە ڕابەرەکەی خۆی بە هەموو کەسێ نیشان بدات، چونکە هەموو کەسێ شایانی ئەوە یان نییە کەڕابەرەکەی بەدی بکەن.

**لەبابەت عیشقەوە مەدویٚ لەگەڵ ناجسنی هەم عەسرت**

**گرێیٚ دڵ بۆ کەسیٚ دەرخە خەبەرداربیٚ لە ئەسراران**[1]

**بەهارە خۆش بەهارێکە دەمی چوونی قەراج واهات**

**بەجێمای بۆچی دانیشتووی تەماشا کۆچ و کۆچباران**[2]

**لەیاری بێغەشە ئەو کەس (انا الحق) نەقشی خینی بی**

**حیکایەت زۆر گویٚ مەگرە لەهەرزەگۆیی بەدکاران**[3]

**لەسایەی هیمەتی پیری موغان (موخلیس) تەمای وایە**

**بەخۆشی رابوێریتن لەگەڵ سەرخۆش و هۆشیاران**[4]

---

(١) **ناجنس**: بەدناکار، ناکەس.

**واتا**: ئەوەی ئاگای لە جیهانی عەشقی خوایی نییە تۆ لە گەڵی مەدویٚ و گرێی دڵی خۆتی بۆ مەکەوە، چونکە گەڵیٚ کەسی وا هەن ئاگایان لە بنج و بنەوانی سۆفیگەرییەوە نییە و تەقە بە تاریکییەوە دەنێن. عەشقی سۆفیانە پڕە لە نهێنی و مەلەوانی خۆی گەرەکە.

(٢) **قەراج**: دەشتێکی پان بەرینە، لە چیای قەرەچوغەوە دەست پێدەکا تادەگاتە جزیرەی موسڵ و دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای هەولێرەوە.

(٣) ئەنەل حەق (أنا الحق): گوتە بەناوبانگەکەی مەنسووری حەللاجە و لەسەر ئەم گوتەیە لە ٣١٠ك لە سێدارەدرا. گبقات الاولیاو، ص ١٨٧

هەرزەگۆیی: قسەی هەرزەکارانە. خین: خوێن.

**واتا**: ئەو کەسەی (انا الحق) نەخشی خوێنی بێت، واتا خودا لە خوێنیدا توابێتەوە لەیارەکەی (خودا) بیٚ غەشە و ئەوانەی لەحاڵەتەکانی سۆفیانە ناگەن هەرزەگۆن و نابیٚ گوێیان لیٚ بگیرێت.

(٤) سەرخۆشی (سکر): زاراوەیەکی سۆفیانەیە و بەواتای دەست هەڵگرتن دێت لەکۆلی دیار و نادیار و رووکردنە حەقە و نووری عەقل لەناونووری خودی خوایی دەتوێتەوە. فرهنگ اصگلاحات عرفانی، ٤٦٨.

**هۆشیاری (صحو)**: لەزاراوەی سۆفیانەدا گەڕانەوە بۆ هەستییە لەدوای مەستی. ئەوەی مەستیی بە حەق بێت هۆشیاریشی بە حەقە. فرهنگ اصگلاحات عرفانی، ٥٢٧

**واتا**: موخلیس لەسایەی رابەری تەریقەتەوە دەیەویٚ کاتێکی خۆش لەگەڵ مەست و هۆشیارانی رێبازی سۆفیانە بەسەربەرێت.

# ( زمان و زەمان)[1]

ئەو کەسانەی مەردی مەیدانی خودان
بێ سوپا و بێ تەخت و بێ تاج پادشان[2]
ئاشنای ئەهلی هەوەس نینە بەدڵ
هەروەکو ئەهلی سەما هەر لەسەمان[3]
سینە پاکن لە هەوای ئەهلی هەوا
گەرچی خاکینە بەدڵ عەرشی خودان[4]
بێ (لم) و (کیف) لەگەڵ مەولا دە ڕۆن
ملکەچی ئەمر ن و رازی بە قەزان[5]

---

(١) **لە بەحری رەمەلی شەشی مەقسوورە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.
ئەم غەزەلە لە رۆژنامەی هاوکاری، ساڵی ١٩٨٨/١/٧ ژمارە ٩٣٨، ل ٧ نیازی حەمە عەزیز بەناونیشانی (دۆزینەوەی شیعرێکی مەلا خەلیلی موخلیس) بلاوکراوەتەوە.

(٢) ئەوانەی سەر بە جیهانی عەشقی خوداین دوورن لە بگرە و بەردەی دونیا، هەر ئەوانە پاشای راستەقینەن، ئەمانەش چینی سۆفیەکانن. لەنێوان (سوپا و تەخت و تاج و پاشا)دا گونجان هەیە.

(٣) **ئەهلی هەوەس:** دونیا پەرست. سەما: ئاسمان، هەڵپەڕین. لەنێوان (سەما و سەما)دا رەگەزدۆزیی تەواو هەیە.

(٤) **هەوا:** لووت بەرزی، فیز. خاکی: بۆر، نزم، بێ فیز.
**واتا:** دونیا پەرست نین و بەڕواڵەت خاکی و نزمن، بەڵام دڵیان بووەتە عەرشی خودا و خودای لێیە. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ص): ((قلب المؤمن عرش الرحمن)) دیوانی مەحوی، ل ٤٣٨
لەنێوان (هەوا و هەوا)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە.
**عەرش:** ئەو تەنەیە کە گەمارۆی هەموو تەنەکانی داوە و ناوی لێنراوە عەرش لەبەر بەرزییەکەی یان بۆ چواندنی بە کورسی پاشا کە لەوێوە دەسەڵاتی بەسەر جێبەجێکردنی فەرمانەکانیدا دەبێت، نەوێنەی هەیە نە تەن. التعریفات، الجرجاني، ٨٦.

(٥) **لم:** لم فعلت هذا؟ کیف: کیف فعلت هذا؟ ئاماژەیەبەم ئایەتە ((لا یسال عما یفعل و هم یسالون)) الانبیاء/ ٢٣.
**واتا:** ئەو جۆرە کەسانە (سۆفیانە) لەگەڵ خودا گونجاون وباوەڕیان بە هەموو فەرمانێکی هەیە و بە قەزاو قەدەری خوا قایلن و گەیشتوونەتە مەقامی تەوەکول. هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە (الایمان ان تؤمن بالله و بملائکتة و کتبة و رسلة و بالیوم الاخر و بالقدر خیرة و شرة) التاج، ج١، الشیخ منصور علي ناصق، ص٢٥.

تابلێی بەرزن و عالی هیمەتن
بۆ هەموو کەس هەلگری باری بەڵان[1]

سوودی بوونیان بە بەدانیش دەبڕێ
بوونی گوڵ خۆشییە بۆ دڕکی گوڵان[2]

ئێوە باری هەر لەگەڵ وان بگرن
تابلێێ وا بە حقووق و بەوەفان

هەرکەسێکی ئەو کەسانەی خۆشبوێ
دوور دەبیتن سەر و ماڵی لە زیان

باسی عیشق و دولبەران ئەورۆ مەکەن
با نەکەونە بەر دەمی بێ ئەدەبان[3]

هەرچی ئەورۆ حەق بڵێ دەڕوا سەری
(موخلیسا) بگرە زمانت لە زەمان[4]

---

(١) ئاماژەیە بەم فەرموودەیە (المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضة بعضا) دلیل الفالحین، محمد بن علان، ص٣.

(٢) دەبڕێ: دەگات. واتا: وەکو گوڵ وان، چونکە گوڵ درکەکانی دەورووپشتی خۆشی خۆشەویست دەکات، ئاوا سوودیان بۆ مرۆڤی بەدیش هەیە، هەروەك لەم پێناسەیەی سۆفیگەریدا هاتووە (الصوفي کالارض یطؤها البروالفاجر) فی التصوف الاسلامی وتاریخة، نیکولسن، ص٣٢

(٣) واتا: گرێی دڵێ خۆتان لای ئەو بێئەدەبانە مەکەنەوە و باسی سۆفیەتیان لا مەکەن، چونکە شایانی ئەوەنین.

(٤) لێردا موخلیس گۆشەگیری گەرەکە و جۆرە رەشبینیەکی نواندووە کە نە دەبایە وابێ، چونکە ئەوەی مەردی مەیدانی خواپەرستی بێ و رازی بێ بە قەزا نابێ لەچوونی سەری بترسێ و دەبێ فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکا، ((کنتم خیر امة اخرجت للناس تأمرون بالمعروف و تنهون عن المنکر و تؤمنون بالله)) آل عمران/ ١١٠. هەروەها ئاماژەیە بەم ئایەتە ((قل هل من شرکالکم من یهدي الی الحق، قل الله یهدي للحق، افمن یهدي الی الحق احق ان یتبع أمن لایهدي الا أن یهدي فمالکم کیف تحکمون)) یونس/ ٣٥.

# (خدری زندە)[1]

مەی ئەگەر ئاوی حەیات و ساقی خدری زندەبی

چۆن عەقڵ بڕوا دەکا دڵ ئارەزووی تەوبەی هەبی[2]

بەر لە خەڵوەت زاهیدا سەیرێکی مەیخانە بکە

گوڵ لە باغا ناڕوێ تا خاکەکەی تێر ئاو نەبی[3]

بۆ خەریک نابی بە ڕاو ئەی تازە لاوی کە چ کوڵاھ

تۆ کە بازێکی وەها سووک و لە ڕاو خۆشت هەبی[4]

گۆڵ چنین لەو باغە لام وایە بە توو قەت ناکرێ

هەرچی گوڵ چین بی دەبی ترسی لەخار و مار نەبی

---

(١) لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
لەدەستنووسی (م. خ)یە.

(٢) واتا: موخلیس دەیەوێ لە مزگەوتەوە بەرەو خانەقا بڕوا و ئەو پێکەی لەوێ بەدەستی دەکەوێ دەیکاتە ئاوی ژیان و بەدەستی خدری زندە (شێخ مستەفا) وەری دەگرێ، کەواتە لەگەر حاڵ وابێ چۆن دەکرێ لەڕواو پەشێمان بێتەوە؟!

(٣) خەڵوەت: بریتییە لەگۆشەگیری، دواندنێکی نهێنییە لەگەڵ خودا بە جۆرێ کە کەس لە واتا و حەقیقەتی نەگات و بواری پێ نەدرێ. بەڵام شێوەی خەڵوەت دابڕانە لەخەڵکی. فرهنگ اصطلاحات عرفاني ابن عربي، ص٢٦٣. مەیخانە: مەبەست لێی خانەقای سۆفیانەیە.

واتا: هەتا دڵ و دەروون لەکینە پاك نەکرێتەوە مرۆڤ نابێتە زاهید و کەڵکی گۆشەگیری نییە، هەروەکو گوڵ تاخاکی تێر ئاو نەبێ شین نابێت.

(٤) کە چ کولاھ: کڵاو لار. باز: مەبەستی پیری تەریقەتە.

واتا: موخلیس لەرێگەی باز و راوەوە ئاماژە بە سلووکی (ئاکاری) سۆفیانە دەکا و پێی وایە شێخەکەی زۆر چوست و چاپووکە و بەخێرایی رێبوار پێدەگەیەنێ.

لەو شوێنەی کەگەدا جاه و جەلال وەردەگرن

گەر دڵا تۆ لە گەدایی یەکەمین بی چ دەبی[1]

گەر ئەتو تالیبی یاری لە سەروماڵ وەرە دەر

یار ئەگەر بوو بە سەیار، یار کە نەبوو، با چ نەبی[2]

(موخلیسا) تۆ لە ویساڵ و لە فیراق وەك دەدوێی

هەر بە ئاداب بدوێ سوودی نییە بێ ئەدەبی[3]

---

(١) گەدا: لە ئەدەبیاتی سۆفیانەدا بە کەسێ دەگوترێ کە گەدای دەرکەوتنەکانی خوایی و گەدای بەرەو خواو گەدای فەیزە باقییەکانی حەقە. فرهنگ اصطلاحات عرفاني، ص ٦٧٨.

جەلال: بریتیە لە سیفەتی قەهر و قینی خودایی، سیفەتە نادیارەکان پێیان دەگوترێ جەلال و دیارەکانیش جەمال. جلال دیارخستنی گەورەیی ئولـەرە بەپێی زیادبوونی خواستی عاشق. فرهنط اصطلاحاتي عرفاني ابن عربي، ص ١٩٤.

واتا: موخلیس دەیەوێ دڵەکەی لەوگەدایالەبێت کە پلە و پایەی سۆفیانە و شکۆمەندی خوایی وەربگرێت و بگاتە ئەوجوانیە خواییەی کە لە رێگەی جەلالـەوە بۆی دەردەکەوێ.

(٢) واتا: ئەو سۆفیەی خودای بوێ دەبێ لەسەر و ماڵی خۆی خۆشبێ و بەختی بکات، چونکە ئەگەر سۆفی گەیشتە خوا پێویستی بە هیچ نابێ و ئەگەر خواشی بۆ نەبوو هیچ شتێکی بۆ نابێت و بەکەڵکی نایەت.

(٣) لەنێوان (ویسال وفیراق، بە ئاداب و بێ ئەدەبی)دا دژیەك هەیە.

واتا: موخلیس داوا لەخۆی دەکات کە بە ئەدەبەوە لە ویسال و فیراق بدوێت. مەبەست لە.ویساڵ حاڵەتی کۆیە (جمع) لەگەڵ خوادا و فیراق حاڵەتی جیابوونەوەیە (تفرقە).

# گرژینەوە[1]

تا لەرێگەی عاشقی سەردانەنێی سەرناکەوی
دە ست و بردی گەر نەکەی ڕێت ئاخری بەرناکەوی[2]
گەوهەری عیشق و تەبیعەت پەروەری ڕێك ناکەون
گوڵ لەجێگای شۆرەکات قەت ناروێ و هەر ناکەوی[3]
هەرچی ئەوڕۆ مەستی بادەی چاوی دڵداری نەبی
قەت سبەی لێوی بەبادەی ئاوی کەوسەر ناکەوی
تا هەناسەم پێی نەگا نا پشکوێ لێوی نیگار
غونچە تا بای لێ نەدا گرژینەوەی دەرناکەوی[4]
(موخلیسا) تا گەرمە بازاڕی مەتاعی عاشقان
فرسەتە ئەوڕۆ سبەی بەڵکو وەها هەر ناکەوی[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) واتا: ئەو عەشقەی کە موخلیص دەیەوێ سەری خۆی بەقوربانی بکات عەشقی خوایە، بۆیە دەیەوێ دەست و برد بکات نەخۆ لەدوایی ڕێگەی لێ بگیرێ و نەیگاتێ. لێرەدا شاعیر چاولێکەری مەحوی کردووە و هەمان بۆچوونی ئەوی هەیە، مەحوی دەڵێ:

تا لەبووری تۆ لەسەر ڕێ ئاخەیە مەیدانی عیشق
سەر لەپێشی پێ دەبێ لەم ڕێگەدا نێی ئەو وەلا / ل ٢٩

(٣) شۆرەکات: زەوی بەخوێ. هەرناکەوی: گەورە نابی، ناڕوێ.

واتا: عەشقی خوا و دونیاپەرستی بەیەکەوە ناگونجێن و دەبێ یەکێکیان قوربانیی ئەوی دیکەیان بکرێت. لێرەدا پێچە و بەخشی ڕێك هەیە لەنێوان (عیشق و تەبیعەت پەروەری) لەگەڵ (گوڵ و شۆرەکات)دا، واتا: عیشق و گوڵ تەبیعەت و شۆرەکات.

(٤) نیگار: یار، ڕابەری تەریقەت. گرژینەوە: زەردەخەنە.

(٥) مەتاع: کەل و پەل. هەرناکەوی: ڕێك ناکەوی.

واتا: وادیارە بازاڕی عەشقی سۆفیانەی موخلیس لە گەرم و گوڕی دایە و بە برەوە، بۆیە داوا لە خۆی دەکات کە کڕیاری ئەو بازارە بێ، نەخۆ دوایی لەکیسی بچێ و بۆی ڕێك نەکەوێتەوە.

# شیعری ئایینی

ئەدەبیاتی کوردی بە شیعری ئاینی دەستی پێکردووە و بابا تاهیری هەمەدانی گەلێ لە دوو بەیتەکانی بەرەو ئەم لایەنە دەچن و نزا و پاڕانەوە و خۆ بەگوناهبارزانین لە توێی دوو بەیتەکانی هەڵدەقوڵێن. بۆ نموونە لەم دووبەیتەی خوارەوەدا خۆی زۆر بە تاوانبار دەزانێ و گوناهەکانی لە گەڵای داران و دڵۆپی باران زۆرترن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە بەزەیی خودا بێ ئومێد نابێ و بەتەمای رەحمەتی یەزدانە:

مو ئەز (قالوا بلی) تەشویش دیرم

گونەهـ ئەز بەرگ و باروون بیش دیرم

ئەگەر (لاتقنطوا) دەستم نەگیرەد

مو ئەز (یاویلتا) ئەندیش دیرم[1]

لەدوای ئەمیش ئەدەبیاتی گۆران بە ئەهلی حەق و ئیسلامەوە، بە شیعر و پەخشانەوە هەموویان لەرووی ناوەرۆکەوە ئاینین و هەر یەکە بە پێی بیروباوەری مەزهەبی خۆی کۆمەڵێ شیعر و پەخشانی ئاینییان بەجێهێشتووە، بەتایبەتی ئەدەبیاتی ئەهلی حەق و شیعە سەرتاپای ئاینین و هەندێکیشی بەرەو لایەنی سۆفیانە چووە.

هەروەها ئەدەبیاتی کرمانجی ژووروو هەر لەفەقێ تەیران و مەلای جزیریەوە تاوەکو ئەحمەدی خانی و شێخ نوورەدینی بریفکانی هەموویان بەشێك لە شیعرەکانیان ئاینی بووە و بیر و باوەری خۆیانیان تیدا دەربڕیوە، بۆ نموونە مەلای جزیری لە ستایشی پێغەمبەردا (ص) دەڵێ:

ئیسمی تەیە مەکتووب د دیوانی قیدەمدا

حەرفەك قەلەمی عیلم بتەقویم رەقەمدا[2]

---

(١) دیوانی باباتاهیری عوریان، ل ١٦.

(٢) العقد الجوهری فی شرح دیوان الجزری ، ب١، ل١١.

شاعیرانی کرمانجی خوارووش بەهەمان شێوەی ئەوانی دیکە ئەسپی خۆیان لەم بوارەدا تاوداوە و ئەم لایەنەیان فەرامۆش نەکردووە و پێشەنگیان نالی بووە و هەردوو قەسیدەی (ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی مونەوەرە) و (ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتاکەی حیرسی وێرانە)[1]، بوونەتە سەر مەشقی شاعیرەکانی سەردەمی خۆی و دوای خۆی.

موخلیسیش لە شیعری ئاینیدا پلەوپایەیەکی شایانی بۆ خۆی وەدەستهێناوە و کۆمەڵێ غەزەل و قەسیدەی بۆ ئەم بوارە داناوە و بە زمانێکی ڕەوان و سادە و هونەری بەیتەکانی داڕشتووە و ئاماژەی بەوەرگرتنەکان (اقتباس) کردووە.

شیعرە ئاینیەکانی موخلیس بە گشتی لە چوار بابەت دەخولێنەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

1) **گەورەیی خودا:** شاعیر لەم غەزەلەدا باسی دروستکردن و ئەندازەی گەردوون دەکا و سەری سوڕماوە لە وردەکارییەکانی و ئەم وردەکارییە بەگیان و بێ گیان و مرۆڤ و باڵندەی گرتۆتەوە و پاشان باسی نهێنییەکانی شەو دەکات کەکاتی دەرکەوتنی نووری خواییە:

ڕۆژ و شەو بنوارە ئاساری خودا[2]

چۆنە نەقشی نووکی پەرگاری خودا[3]

هەندەسەی کەونی بەتەرزێ گرتووە

جوملە ڕەنگین هاتووە کاری خودا[4]

---

(1) دیوانی نالی، مودەریس، ل ٤٨٢،٤١٥.

(2) ئەم غەزەلە لە بەحری ڕەمەلی شەشی مەحزووفە و ئەمەش تەفعیلەکەیەتی:
فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(3) ئەم بەیتە ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿افلا ینظرون الی الابل کیف خلقت و الی السماء کیف رفعت و الی الجبال کیف نصبت و الی الارض کیف سطحت﴾ الغاشیه/ ١٧-٢٠

(4) ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿افلم ینظروا الي السماء فوقهم کیف بنیناها و زیناها و مالها من فروج و الارض مددناها و القینا فیها رواسي و انبتنا فیها من کل زوج بهیض تبصرة و ذکری لکل عبد منیب﴾ ق/٦-٨

**سەیری بولبول کەکە بۆنی گوڵ دەکا**

**چۆن دەکا ئیزهاری ئەسراری خودا**

**سۆزی پەروانە لە رۆژ دەرناکەوێ**

**شەو نەبێ نابینێ ئەنواری خودا**

**غەرقی نێو بەحری هەوا هەر تینووە[1]**

**تا دەگا چاوی بە دیداری خودا[2]**

**موخلیسا خۆت ناگەیە کۆی دولبەرت[3]**

**دەست بگەینە دامەنی یاری خودا**

---

(١) هەوا: عەشق

واتا: ئەوەی لەدەریای عەشقی خوادا نقوم بێ هەر تینووە تاچاوی بەزالی خودا دەکەوێ، هەروەکو حەزرەتی موسا کە تینووی دیداری خوا بوو ﴿ولما جاء موسی لمیقاتنا و کلمة ربة قال رب ارني انظر الیك قال لن تراني و لکن انظر الی الجبل فان استقر مکانة فسوف تراني فلما تجلی ربة للجبل جعلة دکاً و خر موسی صعقاً فلما افاق قال سبحانك تبت الیك وانا اول المؤمنین﴾ الاعراف/ ١٤٣

(٢) لەنێوان (تیمار و بیمار)دا رەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

(٣) کۆی دولبەر: مەبەستی بارەگای خوایە.

واتا: موخلیس تۆ وەکو حەزرەتی مووسا نیت نووری خودا لەکێوی توور ببینی، دەسا دەست بگەینە دامێنی خۆشەویستی خوا (کە پێغەمبەرە یان پیری تەریقەتە) بەڵکو تۆزێکت لە فەیزی خوا بەرکەوێ.

# (رۆژه رەش)[1]

بەر لەپەیدابوونی عالەم عاشقی خۆیبوو خودا

جۆشی عیشقی خۆی لەخۆی ویست خۆی بەخۆی پیشان بدا[2]

---

(۱) ئەم شیعره لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە و تەفعیلەکەی فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(۲) ئەم شیعره بەگشتی باسی خودی خوایەتی دەکات پێش پەیدابوونی گەردوون و مرۆڤ کە خودا وەکو گەنجینەیەکی شاراوە بووە و حەزی کرد خۆی دەربخات، بۆیە مرۆڤی خولقاند تاکو بناسرێت (کنت کنزا مخفیا فخلقت الخلق کی اعرف). خودا لە ئەزەلدا سەیری خۆی کرد و خۆی خۆشویست، ئەمەش جۆرە دەرکەوتنێکی خودی خوایی بوو:

پێش ئەوەی خودا گەردوون بخولقێنێ خۆی بۆ خۆی دەرخست و هەندێ وتوێژی بێ دەنگ و پیتی لەگەڵ خۆی کرد، خۆی لە خۆیدا بینی، لە ئەزەل سەیر خۆی کرد و خۆی خۆشویست، ئەمەش دەرکەوتنێکی خودی خوایی بوو لەشێوەی ئەڤینێکی پاك و دوور لە هەموو وەسفێ، ئەم خۆشویستیە بووە هۆی پەیدابوونی بوون و زۆری لە بووندا. پاشان خوا ویستی ئەم خۆشەویستیە خودیەی خۆی لە شێوەیەکی دەرەکی ببینێ و بیدوێنێ. سەیری ئەزەلی کرد و لەعەدەم وێنەیەکی لەنەفسی خۆی دەرهێنا کە هەموو سیفەت و ناوەکانی ئەوی هەبوو، ئەویش ئادەم بوو کە هەتاهەتایە کردیە شێوەی خۆی، هەرکە بەمجۆرە خودا ئادەمی خولقاند بە گەورە و مەزن شکۆداری زانی و بۆ خۆی هەڵبیژارد، جا بەو پێیەی کە حەق لەشێوەی ئەودا دەرکەوتووە ئەو ئەوە. (الطواسین، الحلاج، ماسینیون، پاریس ۱۹۱۳، ص ۱۲۹).

مەلای جزیریش لە دیوانەکەیدا هەمان بیروباوەری حەللاجی دووبارە کردۆتەوە و پێی وایە کە جوانی و خۆشەویستی سەرەتا یەکبوون و پاشان لێك جودا بوونەوە بە فەرمانی خودا، جوانییەکە چووە ناو لەش و لاری جوانان و خۆشەویستییەکەش چووە ناو دڵی عاشقانی خودا:

حوسن و حوب زاتی قەدیمن لێ جودابوون لەو ژیەك

لێ لها لیسمێ حدوسێ حیکمەت و تەفسیل وە بوو

یەك د زاتێ سورشرینان بو جەمال و حوسن و سور

یەك د قەلبێ لەهلی دل نار و جەلال و جەزبە بوو

(العقد الجوهری فی شرح دیوان الجزری، ص ۶۱۵ – ۶۱۶

چاوی خۆی گێڕا چ ناوێنەی بەبەرچاوی نەکەوت
خۆی هەتا تێدا ببینێ و تێر تەماشای خۆی بکا
ڕووی لە ئیقلیمی عەدەم کرد کردیە ئیقلیمی وجوود
بوونی دەرخست بە نەقش و هەندەسەی ئەرز و سەما
خۆزی چاوێکت دەبوو دە تد پت چ نازێکی دەکرد
حوسنی خۆی وەك دیت لە ئەینۆکی وجوودی ماسیوا
هەرکەسێ لەو ڕۆژەدا عیشقێکی پەیدا کردبێ
چۆن دەتانی لێرە ئەوڕۆ تەرکی ئەو عیشقە بکا[1]
ساقیا جامێکی بینە بە خسووسی لەسەحەر
تابتانم ئەسەری مەستی بگەینم بە سەما
دوورە لەو ڕۆژە ڕەشە کەسبی فەزائیل بکرێ
خینە دەڕوا لەزەمین و سەرە دەڕوا لە حەوا
تۆ بەبێ غەم کە نەبی هەر غەمی یاران بکە غەم
بەلکو دەریای کەرەمی دێ فەیەزانێکی دەکا

---

(١) موخلیس هەروەکو جزیری پێی وایە کە عەشق ئەزەلیە و لەڕۆژی (قالوا بلی)وە پەیدا بووە، واتا: گیانەکان لەو ڕۆژەوە وەلامی خۆشەویستیان داوەتەوە و پاشان کە ئەو گیانە هاتۆە ناو لەشی مرۆڤەوە ئەڤینەکەی تێدا بەرجەستە بووە.

بەم پێیە موخلیس دەیەوێ لەسایەی دەرکەوتنی خوایی و خولقاندنی گەردوون مەزنیی خودا دەربخا، چ لەڕووی ئەزەلی بوونی عەشقی خوایی یاخود لە ڕووی دروستکردن و ئەندازەگرتنی زەوی وئاسمان و لەستێرەکان بەشێوەیەکی نایاب و ڕێك و پێك.

٢) نەعتی پێغەمبەر (ص): ئەو شیعرانەیە کە شاعیران ستایشی پێغەمبەری (ص) پێ دەکەن، یاخود داوای شەفاعەت و نزا و پاڕانەوەیە لێی. ئەمەو دەرخستنی موعجیزەکانیەتی کە لە ژیانیدا روویان داوە.

موخلیس لەم رووەوە گەلی غەزەل و قەسیدەی هۆنیوەتەوە، هەر بۆ نموونە ئاماژە بە هەندێکیان دەکرێت.

## مستەفا[١]

دڵ کە وەك مەجنوونە ئەورۆ ئارەزووی لەیلا دەکا
هەروەکو وەحشی دەسووڕێ حەز لە جێی سەحرا دەکا[٢]

مەی ئەگەر ئاوی حەیات و گەر خزر بێ ساقی من
بۆچی لەو فەیزە بەدە ربم من نەبم {کێ[٣]} وادەکا

من لە رەغمی خەسمەکەی خۆم هەر دەڵێم یا مستەفا
هەر بەڵایێ دێ بەخێربێ چی دەکات هەر خوا دەکات[٤]

تۆ حیجازی و من عیراقی لێکتری دوورین بەجێ
دڵ لەدەرگای بارەگای تۆ رۆژ و شەو ئاوا دەکا

چونکە (سبحان الذي اسرى) لەبۆ فەزلی تووە
تازە (موخلیس) دێت و کەشفی حیکمەتی ئیسرا دەکا[٥]

---

(١) لەم غەزەلە لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) شاعیر کە عاشقە خۆی کردۆتە مەجنوون و مەعشووقەکەی کە پێغەمبەرە (ص) بە لەیلا ناوی هێناوە. زۆر جاران شاعیرانی کلاسیزمی بەتایبەتی سۆفیەکان لەیلا دەکەنە رەمزی خودا و پێغەمبەر و شێخی تەریقەت، جا ئەگەر توێژەر {خوێنەر} ئاگاداری هەموو شیعرەکە نەبێت وا تێدەگات کەمەبەست لە لەیلا کچێکی تایبەتە.

(٣) لەدەستنووسی شاعیر نووسراوە (کوێ).

(٤) واتا: من لە رقی ناحەزەکەی خۆم (جا کەسێ بی یا نەفسی خۆی بێت، چونکە نەفسیش بە دوژمن دادەنرێت) هەر هاواری پێغەمبەر (ص) دەکەم و هەر چیم بەسەردێ هەر لەخواوەیە، ئەمەش ئیشارەتە بەم ئایەتە ﴿اینما تکونوا یدرککم الموت ولو کنتم فی بروج میشدة وان تصبهم حسنة یقولوا هذه من عند الله وان تصبهم سیئة یقولوا هذه من عندك قل کل من عند الله فمال هؤلاء القوم لا یکادون یفقهون حدیثا﴾ النساو/ ٧٨

(٥) موخلیس ئاماژە بەشەو رۆیین و چوونە ئاسمانی پێغەمبەر (ص) دەکا و گەورەیی ئەو لەلای خودا دەستنیشان دەکات، ئینجا نیمچە گلەییەك لەخۆی دەکات کە بە درەنگەوە باسی فەزل و حیکمەتی ئەو میعراجە دەکا و دەبوایە زۆر لە پێشتر ئەمەی بکردایە.

# مەدینە[1]

مانیل بە خەوم هەردەم
جارێ کە بە خدمەت گەم
لەو بەختە بەدە چ بکەم
نایێڵێ بنووم یەکدەم
سەرمەستی جەماڵی تۆم
مەفتوونی خەیاڵی تۆم[2]
موشتاقی ویساڵی تۆم
ئەی سەروی شەهی گوڵدەم
تەن خاکی بەری پێتە
دڵ مووورە لەسەر رێتە[3]
ئینعام و کەرەم جێتە
لوتفێ کە نەکەی چ بکەم[4]
دڵ خەستە و و ناشادم
وەك خەرمەنی بەربادم[5]
جارێ بگە فەریادم
ئەی فەخری بەنی ئادەم[6]

---

(١) لە بەحری هەزەجی چواری لەخرەبە: مفعول مفاعیل. ئەم شیعرە لەسەر شێوەی دوو بەیتییە و بە حەفت دوو بەیتی غەزەلێکی پێکهێناوە.

(٢) مەفتوون: شەیدا، شێت

(٣) موور: مێروولە، مێروستان

(٤) ئینعام: کۆی (نعمە)ە بە واتا: چاکە.

(٥) خەستە: نەخۆش، خەرمەن: خەرمان، جۆخین، باد: با

(٦) فەریاد: هانا، هاوار

گەر بادی سەباری خۆشڕەو

بۆنێ لە مەدینەی ئەو

بێنێ کە لە بۆم ئەوشەو

سەر بێ کە بڵێ ئەیدەم

من عەبد و غوڵامی تۆم

لەو قاپییە قەت ناڕۆم

کام قوڕ بکەمە سەرخۆم

دەست کە لە تۆ بەردەم

(موخلیس) بە زمان یاری

ئەمما لە دڵان ماری[1]

لوتفێکی بکە باری

تا هەردوو موافیق کەم[2]

---

(١) لەنێوان (یاری، ماری، باری) ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە
باری: خودا، یەکێکە لە سیفەتەکانی خودا.

(٢) هەردوو: مەبەست یارو مارە: موخلیس هێشتا دڵی پەیوەندی بە جیهان ویستییەوە ماوە و داوا لەخودا دەکات کە بەسۆزی خۆی یار و مار بگونجێنێ و بەرەو ئەڤینی بێگەردی پێغەمبەری ببات.

# میرگی گوڵان[1]

دڵ کە جێی عەکسی گوڵی رووتە کە خاکی کەتە بان
سەیری قەبرم لەبەهار چۆن دەبتە میرگی گوڵان[2]
قەت لەبەینی دووڕووان نابێ کە دووڕوویی بکەی
شاری دووڕوویی نەدیتراوە کە تۆی بێتە ڕووان[3]
سەیری ئەو چەرخەیە ناکەی کە چ تەبعێکی هەیە
دەوڵەتی داوە بەکەر، نیعمەتی داوە بەسەگان[4]
چییە سووچی من و بولبول، چییە ئەو کارە دەکەی
وەسوەسە و ئیفکی رەقیب و رەشەبای فەسڵی خەزان[5]
(موخلیسا) ناگەیە مەقسوود، لەوەتەن نەچیە دە رێ
نەگەیە مەدینەی یار و قەدە رێ نەبیە شوان[6]

---

(۱) ئەم شیعرە لە بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوورە: فاعلاتن، فعلاتن، فعلاتن، فعلان. ئەم غەزەلە تەنیا بەیتی یەکەم و پێنجەمی پەیوەندی بە ستایشەوە هەیە و بەیتەکانی دیکە یەکێتی بابەتیان پێوە دیار نییە.

(۲) واتا: دڵ جێگای ئەو شوێنەیە کە عەکسی رووی وەکو گوڵی تۆی لێ دەدات. واتا: دڵ کە لەبەر جوانیی رووت بەرووداکەوتووە و خۆڵی بەسەردا کراوە، سەیری گۆڕم بکە لە بەهاردا چۆن گوڵی لەسەر دەڕوێت بە تەئسیری ئەو گوڵەی کە گڵی خستە سەر دڵم.

(۳) دووڕووان: دوو کەسان. لەنێوان دووڕووان و دووڕوویی رەگەزدۆزی ناتەواو هەیە.

(٤) لێرەدا موخلیس رووی رەخنەی لەزەمانە دەکات و سەری لە کردە وەکانی سوڕ دەمێنێ کە هێندە دونیا پەروەرە، هەر لەم بارەوە بابا تاهیری هەمەدانی دەڵێ:

**لەگەر دەستم رەسەد بەر چەرخی گەردوون**
**لەز و پرسم کە ئین چوونەست و ئان چوون**
**یەکێرا دا دەیی سەد گۆنە نیعمەت**
**یەکێ را قورسی جۆ ئالوودە دەرخوون/دیوانی بابا تاهیری عوریان، ل۳۰**

(٥) ئیفك: بوختان، هەڵبەستە، ئاماژەیە بەو بوختانەی کە بە عائیشەخانی هاوسەری پێغەمبەر (ص)کرا ﴿ان الذین جاؤوا بالافك عصبة منكم لا تحسبوه شر لكم بل هو خير لكم﴾ النور/۱۱.

(٦) مەدینەی یار: یەسریب، مەدینەی پێغەمبەر (ص).

# قەسر و هەیوان[1]

ئەی دەری غاری موبارەك دڵ بەقوربانی تووە
یاری سەرتاپا لەتیفم موژدە میوانی تووە[2]
سێبەرت تیرکە بە بەرچاوی حەسوودانی مەخە
خدمەتی شاهانە ئەورۆکە لەسەرشانی تووە[3]
شاهی من یاخوا موبارەك بی سەفەرتان هەر سەحەر
دەست بڵند کردن و دوعام بۆ دەوڵەتی جانی تووە[4]
بوو بەجێ پێی تەختی ئەحکام و نیزامی تۆ زەمین
بۆ تەجەللا (قاب قوسین) قەسر و هەیوانی تووە[5]
مەحرەمت (روح الامین) بوو هەر کە چووی بۆ لامەکان
ئەزمی (سبحان الذي) بۆ عیزەتی شانی تووە[6]

---

(١) ئەم شیعرە لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە و تەفعیلەکەی بەم جۆرەیە: فاعلاتن، فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

(٢) غاری موبارەك: ئەشکەوتی پیرۆزی سەور/ یار: مەبەست لێی پێغەمبەرە (ص).

(٣) ئەور: چرێ.

(٤) لێرەدا وا دەردەکەوێ کە شەورۆیی پێغەمبەر (ص) سەحەر بووە، بەڵام (لەدوای نوێژی شێوان روویداوە و بۆ نوێژی بەیانی گەڕاوەتەوە ماڵەوە) قصص القران، محمد احمد جاد المولى، ص ٢٥٣.

(٥) تەجەللا: بەو نوورە خواییە دەگوترێ کە دەچێتە دەروونی سۆفییەوە. التعریفات، الجرجاني، ص١٤٦.

قاب قوسین: ئەوەندەی دوو کەوانە. ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿ثم دنا فتدلی فکان قاب قوسین أو أدنی﴾ النجم/ ٨-٩.

(٦) روح الامین: جوبرائیل/ لامەکان: ئەو دیو جیهانی هەستی.

سبحان الذي: ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿سبحان الذي اسری بعبدة لیلاً من المسجد الحرام ...﴾ الاسراء/١.

پەردەدار نازانێ لەو دیو چی هەیە فەرموو ئەتوو

بۆ تووە هەرچی هەبێ ئایاتی سوبحانی تووە[1]

ئەو شەوە کەون و مەکان عالەمی مولك و مەلەکووت

یەك بەیەك جوملە بە جوملە وا سەنا خوانی تووە[2]

هەر کەسێ عاشق بی ئەو شۆکە بە یادی دولبەری

قولقولی فرمێسکەکانی دور و مەرجانی تووە

تۆی ئەمەل هەرچەند دەچێنم حاسلاَتێکم نییە

موفلیسم ئەمما ئومێدم هەر بە خەرمانی تووە[3]

گۆی سەرم پێی ناگرێ بیداتە بەر شەق هیچ کەسێك

چونکە گۆی مەیدانی عیشق و دەست و چەوگانی تووە[4]

دەفعەیێ دەربێخە بۆ (موخلیس) گوڵی رووت بۆ نیشات

شەو لەنێو باغی خەیاڵ مورغی غەزەل خوانی تووە[5]

---

(١) **پەردەدار**: مەبەست جوبرائیلە/ **لەو دویو**: لە جیهانی واتایی

(٢) **کەون و مەکان**: گەردوون/ عالەمی مولك: جیهانی ماددی/ مەلەکووت: جیهانی غەیب و فریشتەکان.

(٣) **خەرمانی تووە**: مەبەست لە شەفاعەتی پێغەمبەرە (ص) بۆ موسڵمانەکان.

(٤) شاعیر لە عەشقی پێغەمبەردا (ص)تواوەتەوەو سەری خۆی کردۆتە گۆی مەیدانی عەشق و دەست و گۆچانی پێغەمبەر (ص)، بۆیە بە شانازییەوە دەڵێ: کەس ناتوانێ شەق لە گۆی سەری بدات.

(٥) **نیشات (نشاط)**: چالاکی/ **مورغ**: باڵندە/ غەزەلخوان: گۆرینده

# بیٚ ئەمەك[1]

دەتەوێتن بە موقیمی، چ مەدینە چ مەککە
راست ئەگەی هەستەوە تا دەچیە ئەوێندەر چ مەکە[2]
عاشقێکی کە لە مەعشووقە بەدوورکەوت قەدەرێ
کەمٍ و زۆر گەر گلەیی هاتەدەمی بیٚ ئەمەکە
نە بە ساڵ و نە بە مانگ و نەبە ڕۆژ نەبە شەو
نییە تێربوون لە ویساڵت هەموو لای من دەمەکە[3]
ئەوی برسیبی لەرێی عیشقەوە تێر نابی بە هیچ
هەموو دونیای بدەیێ، نابی بە دوو جەم جەمەکە
کە تەماشای دڵەکەی (موخلیس)ی کرد پیری موغان
خەبەری بوو چ ئیرادەی هەیە. فەرمووی: وەمەکە[4]

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن.
(٢) موقیم: ئەو کەسەی کە لە شوێنێکدا جێگیر بیٚ
مەعشووقەکەی موخلیس پێغەمبەرە (ص)، بۆیە حەز دەکا سەر لە گۆڕە پیرۆزەکەی بدات لە مەدینە، عەشقەکەی وەها تاوی سەندووە پێی وایە هەر چەندی لەوێ بمێنێتەوە لێی تێر نابێت وهێندە برسێی ئەو شوێنەیە کە بە هیچ شتێکی دونیایی ناگۆڕێتەوە. لە غەزەلەکەدا وا بەدەردەکەوێ کە موخلیس ویستوێتی واز لەماڵ و منداڵەکەی بهێنێ و بچێ لە مەدینە یان لە مەککە نیشتەجێ بێت، بەلام کە پیری موغانی (شێخ مستەفای هەرشەمی) سەیری دڵی موخلیسی کردووە زانیویەتی مەبەستی چیە، بۆیە پێی گوتووە واز بێنە و (وەمەکە). لەنێوان وشەی (چ مەککە و چ مەکە) رەگەز دۆزی تەواو هەیە.
(٣) دەمەکە: کاتێکە. لەنێوان (ساڵ و مانگ و ڕۆژ و شەو) گونجان هەیە.
(٤) وەمەکە: وامەکە. پیری موغان: گەورەی موغەکان، پیاوی ئاینی زەردەشتی. لەهەندێ شوێن بەواتای شێخی رێبازی سۆفیانە دێت و لەم بەیتەدا مەبەستی (شێخ مستەفای هەرشەمی نەقشبەندییە) کە شێخی شاعیر بووە.

# حوسێن و حەسەن[1]

**بۆیە ئەورۆ وا بەشووشم یار بەرمو روم پیکەنی**
**شەکر و چای پێدام بە کوڵم و زولفەکەی پڕ شکەنی[2]**
**کەوکەبی ئیقبالی من ئەوشۆکە دونیای کردە رۆژ**
**بەختەکەی خەوتووم لەخەودا زۆر بە شادی راچەنی[3]**
**شاپەری بازی عینایەت کەوتە سەرمان سێبەری**
**قسمەتی رۆژی ئەزەل کردییە نەسیبم دامەنی[4]**
**دوور نییە گەرچی زەعیفم یار ئەگەر لوتفی هەبی**
**قوومتی بازوویی عیشقم بێستوون گەر هەڵقەنی[5]**
**رووبەرووی لێوو روخی یارم چ قیمەتیان هەیە**
**شەوچراغ و دورو یاقوت و عەقیقی یەمەنی[6]**
**من کە سەیادی غەزالی حیجازیمە قەدیم**
**تازە ناکەومە دوو راوی ئاهووانی خوتەنی[7]**
**(موخلیسا) چەرخ و فەلەك ملکەچی تۆبی چ دەبی**
**تۆ سەگی قاپیەکەیی جەدی حوسێن حەسەنی[8]**

---

(١) **لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
(٢) **پڕشکەن:** چین چین. لێرەدا لەف و نەشری رێك هەیە لەنێوان (شەکر و چا) و (کوڵم و زولف)دا.
(٣) لە دەستنووسی (خ.د) ئەو شەوکە، (م.ك) ئەوشۆکەیە. کەوکەبی ئیقبال: ئەستێرەی بەخت.
(٤) **واتا:** لەئەزەلدا دامێنی یارم کە پێغەمبەرە(ص) بووە نەسیبی من و کەوتمە ژێر چاودێری ئەوەوە.
(٥) **بێستون:** ئەو شاخەیە کە فەرهاد لە پێناوی شیریندا هەڵیکەند.
(٦) **شەوچراغ:** چرای شەو. عەقیقی یەمەنی: بەردێکە بەنرخە و هەمە رەنگە و لەهەمووان بەنرختر رەنگی سوورە. گونجان هەیە لەنێوان (شەوچراغ و دوررو یاقووت و عەقیق)دا
(٧) دەستنووسی (م.خ) خەتەنی. دوو: شوێن. ئاهوو: ئاسك. خوتەن: ناوی کۆنی رۆژهەلاتی تورکستانی چینە کە بە ئاسکی موشك (میسك) بەناوبانگ بووە. غەزالی حیجازی: مەبەستی پێغەمبەرە (ص).
(٨) لێرەدا ئاماژەیە بۆ سەگی یارانی ئەشکەوت ﴿وتحسبهم ایقاظا وهم رقود و نقلبهم ذات الیمین و ذات الشمال و کلبهم باسط ذراعیة بالوصید لو اطلعت علیهم لولیت منهم فرارا و لملئت منهم رعبا﴾ الکهف ١٨.

**٢) ستایشکردنی خودا:** لەم جۆرە شیعرە شاعیر باسی خود و سیفەت و کردەوەکانی خودا دەکا و گەورەیی و مەزنیی داهێنانی خودا لە هەموو بوونەوەراندا دەردەخات و ئەوە نیشان دەدا کە خودا یەکە و هاوبەشی نییەو شایانی پەرستنە و کاروباری گەردوون بەدەست ئەوە.

لەم غەزەلەی خوارەوەدا (موخلیس) ستایش و سۆفیگەریی ناوێتەی یەکدی کردووە، لەلایەکەوە ئەوە روون دەکاتەوە کە گەردوون هەموو گەواهی مەزنیی خودا دەدەن و نیشانەی دەستی داهێنانی خوایین و بوونەوەران لەیادکردنەوەی خولقێنەریان دان. لەلایەکی دیکەوە مەیدانی بیروباوەڕەکان فراوان دەکات و بەرە و خاڵێکیان دەباتەوە کە خودایە و پەیڕەوانی ئاینەکان بەبێ جیاوازی لەدەرگای خودا وەستاون و بەتەمای دیاری و دیداری ئەون.

## کۆچبار[1]

دائیرەی گەون و مەکان جێ سەری پەرگاری تەیە
زینەتی ئە رز و سەما سەنعەت و ئاساری تەیە
جین و ئینسان و مەلەك جوملە نەباتات و جەماد
کائینات هەرچی هەیە پردەمی ئەزکاری تەیە[2]
عاشقی رۆژی ئەزەل گەبر و موسلمان و یەهوود
وا لەدەرگا بەتەمای خیلعەت و دیداری تەیە[3]
مەسجید و دێر و کلیسا هەموو جێی عاشقیە
چی هەیە نەقش و نیگار و دەرو دیواری تەیە[1]

---

(١) **رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە:** فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن
(٢) **کائینات:** بوونەوەرەکان/ ئەزکار: کۆی (ذکر)ە بە واتا: ویرد، نەریتێکی سۆفیەکانە، واتا: یادکردنەوەی خودا وەکو (سبحان الله). تەسەوف چیە؟، ئەمین نەقشبەندی، ل ٣٥٨.
(٣) **گەبر:** زەردەشتی. یاخود بەو عاریفە دەڵێن کە یەك رەنگە.

عاقڵ و شێت و نەزان بولبولی باغاتی تەنە

مەنزەرەی هەردوو جیهان گوڵشەن و گولزاری تەیە[2]

ئاگری قەهری تەیە دۆزەخە بۆ ئەهلی جەدەل

قەسری فیردەوسە سەرای مەحرەمی ئەسراری تەیە[3]

تاجی کەیخوسرەو و جامی جەم و باغاتی ئیرەم

نایەتە بەر دڵی عاشق هەموو ئەغیاری تەیە[4]

وەرە بۆ مەنزیلی رەندان چ خەتاێکی هەیە

تاق و هەیوانی حەرەم خانەی غەمباری تەیە[5]

---

(١) ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو هەوڵدانێکە لەلایەن شاعیرەوە بۆ ئەوەی ماوەی نێوان ئاینەکان تەسك بکاتەوە و بیسەلمێنی کە پەیرەوانی هەموو ئاینەکان بە زەردەشتی و جوولەکەو مەسیحی یەوە لەخاڵێکی گرنگ یەکدەگرنەوە ئەویش پەرستنی خودایە و داوای لێبووردنە لێی. شوێنەکانی خواپەرستی ئەو ئاینانە مزگەفت و دێر و کڵێسا هەموویان خوایان لێ دەپەرسترێ و خاڵی نین لە مەعشوقی حەقیقی.

ئەم جیاوازییەی کە ئێستا لەنێوان ئەم ئاینانە دەبینرێ شتێکی ئەزەلییە و بەویستی خوایە ﴿ولو شاء ربك لجعل الناس امة واحدة و لايزالون مختلفين﴾ هود ١١٨، ﴿وماكان الناس الا امة واحدة فاختلفوا و لولا كلمة سبقت من ربك لقضي بينهم فيما فيه يختلفون﴾ يونس ١٩.

(٢) تەنە: تۆنە. گوڵشەن: گوڵ + پاشگری (شەن)=شوێنی گوڵ. گولزار: گوڵ +زار= شوێنی گوڵ.

واتا: ئەو جیهانەی کە شاعیر دەیەوێ جیهانی مەستی خواییەو شالووری باغەکانیشی عاقڵ و شێت و نەزانەکانن ، شێت ونەزانەکانیش لە تێروانینی دونیاییەوە وان ،نەگینا لە تێروانینی جیهانی واتاییەوە حەق پەرست و عاشقانی خودان.

(٣) ئەهلی جەدەل: زانا و فەیلەسووفەکان، ئەوانی لەبوونی خوا دەدوێن و ناگەنە ئەنجام. فیردەوس: بەهەشت. باخ.

واتا: ئەوەی زۆر لەبوونی خوا بکۆڵێتەوە و بەرەو لارێ بڕوات خوا قینی لێ هەڵدەگرێت. ئەمە ئاماژەیە بەم فەرموودەیەی ئیمامی عەلی: (كثرة الجدال تورث الشك) عشرة الاف كلمة، الامام علي، النجف ص١٤.

(٤) باغاتی ئیرەم: ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿إرم ذات العماد﴾ الفجر ٧. گونجان هەیە لەنێوان (تاجی کەیخوسرەو و جامی جەم و باغاتی ئیرەم).

(٥) رەند: ئەو کەسەی گوێ نادات سامانی دونیا. خەتا: سووچ

**هەر کەسە وا لەجیهان بەیع و شیرائێکی دەکا**

**کێ دەزانی بە حەقیقەت هەموو بازاڕی تەیە[1]**

**شاهی پەردەی عەزەمەت جاری بەچاوێکی کەرەم**

**سەیری دوو دیدەیی عاشق بکە رووباری تەیە**

**(موخلیسا) خۆش بکە رێگەی سەفەرت بۆ دەمی خۆی**

**چونکی ئەو رێگەیە رێگەی تەوو کۆچباری تەیە[2]**

(١) واتا: هەموو هەڵس و کەوتی لەم جیهانەدا لەخواوەیە و گەر خوا بیەوێ هەموو کارێ روونادات. ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿....!لالە الخلق والامر﴾ اعراف ٥٤

(٢) واتا: خۆت بۆ مردن ئامادە بکە و تۆێشووی رێگات رێکخە و ئەم سەفەرەت لەپێشە و دەبێ بیکەیت. ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿واقیموا الصلاة و اتوا الزکاة و ماتقدموا لانفسکم من خیر تجدوة عند الله...﴾ البقرة ١١٠.

٤) ستایشکردنی رابەری تەریقەت: پێشتر باسکرا کە موخلیس سەر بەرێبازی نەقشبەندییە و رابەرەکەی شێخ مستەفای هەرشەمی بووە، میانەی موخلیس و شێخ زۆر خۆش بووە و زۆری خۆشویستووە، بۆیە خۆشەویستیەکەی کپ نەکردووە و هەمووی بە شیعر دەربڕیوەو کۆمەڵێ غەزەلی لەسەر رابەرەکەی نووسیوە و ستایشێکی بێ پایانی کردووە و ئەوپەڕی پلە و پایەی زانستی دیار و نادیاری پێ رەوا بینیوە. وا لێرەدا ئاماژە بە چەند غەزەلێکی دەکرێت.

# باغی سەمەنی و سونبول[١]

گوا دەلیلی حەرەمی مەحرەمی رازی دڵی ما

پیری مەیخانە نەبێ چۆن حەل دەبێ موشکیلی ما[٢]

رێ لە رێی[٣] عیشق و مەحەببەت بەخەتەرتر نییە هیچ

قەتعی رێی وا بەخەتەر دوورە لە قاچ و قولی ما

جائیزە و جوببەیی شاهی بە پیاوان نەدرێ

وەجی ئەو نەوعە خەڵاتەی نییە شان و ملی ما[٤]

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

(٢) حەرەم: ناوخانوو، ناوەوەی کەعبە/ مەحرەم: خزمی نزیك، ئەندامی خێزان کە نەزە ریان لێك حەرام نەبێ و مارە یان لەیەکدی نەبێ.

(٣) لە خ.د (دێ لەدێی)ە، بەڵام لە نووسینەوەی هەڵە کراوە و (رێ لە رێی)ە، هەروەها (قەتعی رێی) لە خ.د (قەتعی دێی) نووسراوە.

واتا: رێی عەشقی خوایی زۆر بەترس و سامناکە، قاچ و قولی ئێمە زاتی ئەوە ناکات ئەو جۆرە رێگایە ببڕێت. شاعیر لەم بەیتە و لە دوو بەیتی دادێ سێ جووت وشەی (قاچ و قول، شان و مل، دەست و مل)ی بەکارهێناوە و جۆرە مۆسیقایەکی خۆشی بە بەیتەکان بەخشیوە، ئەمەش بەڵگەی شارەزایی موخلیسە لە زمانی ناخاوتنی کوردەواری.

(٤) واتا: رابەری تەریقەتی موخلیس لەوانەیە کە شایانی جوببەی پاشایەتیە و شان وملی شاعیر شایانی ئەو جورە پایەی نییە.

وەج: کەڵك.

هەرچی دێ شەرحێکی وەسفی توو دەکاتن بە قەڵەم

ناگرێتن قەڵەمی وەسفی توو دەست و پلی ما[1]

دووره بۆی هەڵ بدرێ خیوەتی شادی لە بەهەشت

هەرچی رووزەردی نەبینێ لە غەمی سۆر گوڵی ما[2]

خەوی خۆشیی سەحەریت وەسڵی گوڵی داوی لەکیس

چووه دە ر تازە لەرمندی بەدەنی تەنبەلی ما

تەوبە ناکرێ لەبەهاران بە منی بادە پەرست

وا دەزانم لە ئەزەل مەی بووه ئاوی گڵی ما[3]

کەی دەبی دوور بکەویتن لە دڵی یار ئەسەری

ناڵەناڵی جگەری پڕ لە برین و کولی ما

وەکو هارووت دڵەکەی گرتم و خستوویە عەزاب

سەیری چاهی زەنەخی چۆن بوومتە بابلی ما[4]

لەدەری[5] لوتفی توو فەرقی کە نەبی شاه و گەدا

چ دەڵێی جارێ بفەرمووی وە رە بۆ مەنزڵی ما

---

(١) واتا موخلیس ناتوانێ وەسفی گەورەیی رابەرەکەی بکات، چونکە دەست و پلی ئەو لەوە ناوەشێتەوە کە ستایش و وەسفی بکات بەشیوەیەك کە شایانی بێت.

(٢) واتا: ئەوەی لەداخی دووریی رابەری ئێمە روو زەردی نەبینێ و ئازار نەچێژێ لە بەهەشتدا خیوەتی بۆ هەڵنادرێت.

(٣) واتا: بۆیە لەمەی نۆشی تۆبەم پێ ناکرێ چونکە لە ئەزەلدا ئەو گڵەی منیان لێ دروستکردووە بەمەی کراوەتە قوڕ لەجیاتی ئاو.

(٤) هاروت و ماروت: لە شاری بابلن لەشیان زەردە و رووت و قووتن لەناو دیوارێکی شین دانە کە هەتا نەژنۆیانە، هەردوو قاچیان بە ناسن بەستراوەتەوە و سەر بەرەو ژێر هەڵواسراون. حیاة الحیوان الکبری، کمال الدین الدمیري، ج٢، ص ٤١٢. ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿واتبعوا ماتتلو الشیاطین علی ملك سلیمان وما کفر سلیمان و لکن الشیاطین کفروا یعلمون الناس السحر و ما انزل علی الملکین ببابل هاروت و ماروت و ما یعلمان من احد حتی یقولا انما نحن فتنة فلا تکفر فیتعلمون منهما ما یفرقون بة بین المرء و زوجة﴾ البقرة/ ١٠٢. لێکچواندنی جەختاو لە نیوان (چاڵی زەنەخ و بیری بابل)دا هەیە.

(٥) لە خ.د (دەوری)یە، بەڵام هەڵەی نووسینەوەیە.

تەلەبت دیدەنی یار و مەیی ساف بێ لەجیهان

لەسەرای فانی[1] و باقی ئەوە حاسیلی ما

بەهرەوەر بوون لەحوزوور پیری موغان ئەهلی ئەدەب

ماوە بێبەهرە لەئەسرار دڵی ناقابیلی ما[2]

بەری یەك ڕەنگی سەفایە، بەری دوو ڕەنگی غەمە

مەکە تەقلیدی خەتیی بە دولایەعقەلی ما[3]

زاهیدا چوونە بە هەشتی توو موحەققەت کەنەبێ

بکە سەیرێکی لە باغی سەمەن و سونبولی ما[4]

هەر لە ئەوقافە قسەی کۆمەڵی جوببە لەبەران

هەر لەمەستی و لە مەحەببەت ئەدوێن کۆمەڵی ما[5]

هەرچی دێ دە یوێ لە رەندان بە هەوا پێش بکەوی

نابێ کەس پێش بکەوی تا هەبی کوێر و شەلی ما[6]

غەزەلی (موخلیسی) توو وەك غەزەلی خەلقی نییە

چ قوماشێکی هەیە سەیری بکە مەعمەلی {ما}

---

(١) فانی: زاراوەیەکی سۆفیاتیە، ناوی بکەرە، بەواتا: ئەوەی لەناودەچێ و تێدەچێت. تەسەوف چیە، ل ٢٦٣

(٢) بەهرەوەر: بەشدار. حزوور: کۆڕ، خزمەت.

(٣) سەفا: پاکی. لایەعقەل: بەهۆش نابێ.

واتا: ئەوانەی یەکڕەنگ و روون دەگەنە پاکی و ئەوی دوو رووە تووشی غەم دەبێ، تۆ بەگوێی خەتیی بەدکار و بەدهۆشی لێمە مەکە، چونکە دوو ڕووەکانە.

(٤) سەمەن: درەختی یاسەمەن. سونبول: گیایەکە لە شوێنی شێدار دەڕوێت، گەڵاکانی درێژ و گوڵەکانی ورد و بۆن خۆشن. تێکستی ئەدەبی کورد، د. محمد نوری عارف، ل ٢٦.

(٥) موخلیس خۆی لەبەرەی سۆفیەکان داناوە و پێی وایە کە مەلایەکان ئاگایان لە ئاین نەماوە و خەریکی مووچەی ئەوقافن، بەڵام سۆفیەکان باسی خۆشەویستی خوایی و مەستبوون لەوە دەکەن.

(٦) هەرچی دێ و دەیەوێ بەگاڵتە بگاتە هەورازی کۆڕی رەندان و پلە و پایە وەربگرێ، بەڵام تا کوێر و شەلی مەیخانەی سۆفیەتی هەبێ لەو پایەیە بۆ وانە و کەسی دیکە مافی بەسەرەوە نیە.

# داری موغیلان[1]

تاوەکو گەنجی عەزیزم خۆت بگەیەنە کۆی نیگار
پێنج و دوو ڕۆژێکە دەڕوا ڕەونەقی باغ و بەهار[2]
نەوجەوانانی سەعادەتمەند کە ڕۆیین تۆش دەڕۆی
کاری خۆت ئەوڕۆ ببینە نەك سبەی بڕوا قەتار
دەوری مەجنوون تێپەڕی، ئێستاکە نۆرەی ئێوەیە
دەورو تەسلیمە هەموو دەم، وایە دونیای بێ قەرار[3]
ڕەختی خۆت ڕاکێشە مەیخانە ئەگەر قوربت دەوێ
ڕۆژ و شەو تەی ناکرێ، بێ لێوی جامی زەڕنیگار[4]
چاوی پاکی دڵ مەگەر بۆ دیتنی رووت دەست بدا
چاوی دونیا بینی من حەدی نییە بۆ ئینتیزار[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسوورە و تەفعیلەکە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) کۆی نیگار: گەڕەکی یار، لێرەدا مەبەستی شاری مەدینەیە. ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ص): (اغتنم خمسا قبل خمس، حياتك قبل موتك، و صحتك قبل سقمك، و فراغك قبل شغلك، و شبابك قبل هرمك، و غناك قبل فقرك) فيض القدير، ج١، المناوي، ص ١٦

هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەم پەندە کوردییەی کە دەڵێ : (دونیا پێنج و دوو ڕۆژێکە دەڕوات) پەندی کوردی، عومەر شێخەڵلا، ل١٤٢

(٣) مەجنوون: قەیسی کوڕی ملەوەحی عامرییە کە شەیدای لەیلای کچی مەهدی عامری بوو.

(٤) ڕەخت: جل و بەرگ. قورب: یەکێکە لە مەقامەکانی سۆفییەتی و بریتییە لە نزیکی لە خودا بەهۆی پاککردنەوەی دەروون و بەردەوامی خواپەرستی. تەسەوف چیە، ل ٢٥٤

واتا: موخلیس دەیەوێ بارگەی خۆی لەخانەقا بێخێ و پێکی سۆفیانە لە ڕابەرەکەی وەرگرێ بۆ ئەوەی بگاتە مەقامی قورب، چونکە مەقام لەڕێگەی وەرزشەوە {ڕاهێنان/خەڵوەت کێشان} بەدەست دێت.

(٥) واتا: موخلیس لەم غەزەلەدا دوو مەبەستی پێکاوە، یەکەم نزیك بوونەوەیە لە ڕابەر تەریقەت، دووەم گەیشتنە بە مەقامی قورب لە ڕێگەی ڕابەرەوە، کەواتا دەیەوێ خۆشەویستی ڕابەر مسۆگەر بکا بۆ ئەوەی بێتە قۆناغێك بەرەو خۆشەویستی پێغەمبەر (ص).

لەم بەیتەدا دوو چاوی بەکارهێناوە، چاوی سەری بۆ بینینی ڕابەر و چاوی دڵی بۆ بینینی پێغەمبەر (ص) بەکاردەهێنێ، چونکە لەو کاتە ڕابەرەکەی لە ژیاندا بووە.

چاوەڕێی وەقتی سەحەر بەوەقتی گوڵ پشکوتنە

بەڵکو دەبینی باس سەحەر بۆیێ لەسەر گوڵزاری یار

مەنزیلی کێیە کەڕێی ئەو مەنزیلە نادرێ بە من

نیسبەتی داری موغیلانی لە گەل سەروو چنار[1]

هەر درەختیکی بەرابەر سەروی من لافی هەبێ

پایزێك دێ خۆی ببینێ بێ گوڵ و بێ پەلك و پار

چاوەڕێی چەوگانی تۆیە گۆی سەری فەرهادی دڵ

بۆ دەمێ ناخشێیە مەیدان رووحەکەم شیرین سووار[2]

ئەو مەسافەی مەرکەبی عاشق بەساتێ ئەی بڕێ

بای سلێمان تۆزی ناشکێنێت و عیفریتی هەژار[3]

(موخلیسا) دەستت دەگاتە دامەنی مەقسوودی خۆت

گەر لە ڕێگەی عیشقەوە سەبرت هەبێ وەك یار غار[4]

---

(١) داری موغیلانی: درەختێکی کورتە بنی دڕکاوییە، بەرێکی وەکو پاقلە دەگرێ و لە هەریەکێکدا (٥-٩) دانەی تێدایە و بەعەرەبی پێی دەڵێن (أم غیلان). فرهنگ عمید، حسن عمید، ص ٩٧٦

واتا: موخلیس بەتەمای سەردانی گۆڕی پێغەمبەرە (ص) لە مەدینە، ڕێگای حەج پڕە لە داری موغیلان، بەڵام ئەو ڕێیە هێندە پیرۆزە بە نسبی شاعیر نابێت چونکە لەهەوارز لاسق ئەوەو هەروەکو داری موغیلانی کە زۆر بەشەرەفترە {پایەدارترە} لە داری سەروو و چنار.

(٢) چەوگان: گۆچان، گۆپاڵ گاڵووك.

واتا: گۆی سەری فەرهادی دڵی شاعیر چاوەنۆڕی گاڵووکی یارە کەلە مەیدان بیدات بەرشەق و بەمەبەستی خۆی بگات. شاعیر زۆر سەرکەوتووانە هێمای بۆ چیرۆکی دڵداری شیرین و فەرهاد دەکات و لە سیاقیکی جڕو سەرکەوتووانەدا هەردوو وشەی شیرین و فەرهادی مەزراندووە.

(٣) ئەم بەیتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە حەزرەتی سلیمان با و عیفریتی لە ژێر دەسەڵات بووە، هەروەك لەم ئایەتانەدا بەدیاردەکەوێ ﴿و لسليمان الريح عاصفة تجري بأمرة الى الارض التي باركنا فيها و كنا بكل شيئ عالمين﴾ الانبياء/ ٨١. ﴿فسخرنا لة الريح تجري بأمرة رخاءً حيث أصاب و الشياطين كل بناء و غواص﴾ ص/٣٨.

(٤) یاری غار: مەبەستی حەزرەتی ئەبوبەکرە و ئاماژەیە بەم ئایەتە: ﴿الا تنصروة فقد نصرة الله اذ أخرجة الذين كفروا ثاني اثنين اذ هما في الغار اذ يقول لصاحبة لا تحزن ان الله معنا فأنزل الله سكينتة عليةو أيدة بجنود لم تروها و جعل كلمة الذين كفرو السفلى و كلمة الله هي العليا و الله عزيز حكيم﴾ التوبة/٤٠.

# ئاوی تری و ئاوی هەنار[1]

دەستی کورتم کە نەگاتن بەسەر و پەرچەمی یار
خۆم لەبۆ دامەنی پاکی ئەکەمە تۆز و غوبار[2]
ئارەزووی عەهدی شەبابی منی بێ دڵ ئەوە بوو
دەنگی موتریب، جامی جەم دیتنی یار، فەسڵی بەهار[3]
من وەها بووم و وەهام کرد، هەموو بایە، چ نییە
هەردەمێکی کە بەبێ یار بچی دەڕوا بە خەسار
(مد تیست تشنه لبان منتظر یار منند
ساقیا مژده که یار امد است باده بیار)[4]
عاشقی مەوهیبەیە، گۆتە نیە، دەم مەکەوە
با بمینێ لە دڵت هەرچی هەیە مەیخەرە زار[5]

---

(١) ئەم شیعرە لە بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسورە: فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان.
(٢) یار: مەبەست لێی رابەری تەریقەتە. وادیارە ئەم غەزەلە لەو کاتە گوتراوە کەشاعیر لە رابەرەکەی دووربووە.
(٣) واتا لەو کاتانەی کەشاعیر بێ دڵ بوو، واتا: بێ عەشقی سۆفیانە و رابەری تەریقەت بووە، حەزی لەگۆرانی و جامی جەمشید و یاری هەستی و کەژی بەهار بووە. گونجان هەیە لەنێوان (موتریب و جامی جەم، یار و بوار).
(٤) ئەم بەیتە فارسیە هی موخلیسە و لەکاتی خۆی لیژنەی سەلامەتی هزری لە کۆلێژی ئاداب لایاندا هەر لەبەر ئەوەی فارسیە.
واتا: ماوەك بوو تینووانی عەشقی سۆفیانە چاوەڕوانی یارەکەی من بوون (کە رابەری تەریقەتە)، دەسا مەیگێڕ موژدەت لێ بێ رابەر هات و پێکی سۆفیانە بێنە.
(٥) واتا: عەشقی سۆفیانە بەهرەیە و بە گوتە نییە، دەسا گەر لەو عەشقە نهێنیەکت بۆ دەرکەوت بڵاوی مەکەوە، چونکە بڵاوکردنەوەی زیانبەخشە. هەر لەم بارەیەوە باباتاهیری هەمەدانی دەڵێ:
لە میدانم کە رازم واکی واژم
غەمی سۆز و گودازم واکی واژم
چ واژم هەرکی زوولە بنگرە فاش
دیگەر راز و نیازم واکی واژم / رباعیات شور انگیزی باباتاهیر، ل٥٠
واتا: نازانم رازم لای کێ بڵێم؟
خەمی سووتان و توانەوەم لای کێ بڵێم؟
چ بڵێم؟ هەرکەسێ بزانێ بڵاوی دەکاتەوە
ئیدی راز و نیازم لای کێ بڵێم ؟!

**روو لە مەنزلگەهی دڵدار مەکە قەت بەس بەدەلیل**

**دووره دەرچی بەسەلامەت چ پیادە و چ سوار[1]**

**سالیکێکی ئەسەری حوسنی سلووکی کە نەبی**

**حەلی نیشکالی دەکا ئاوی ترێ و ئاوی هەنار[2]**

**گەر بکەم وەسفی قەدی دولبەرەکەی خۆم لە چەمەن**

**رادەوەستن بە ملی کە چ سەمەن و سەر و و چنار**

---

(١) **مەنزڵگەه**: شوێن. واتا: بەبێ رێ نیشاندەر مەچۆرە سەرای رابەری تەریقەتەوە، چونکە شوێنێکی پیرۆزە و ئەتەکێتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوی بێ رابەر بچێت دەرناچێت چ پیادەبێ چ سوار، واتا: چ نەزان بێ چ زانا.

(٢) **سالیك**: رێبوار، ئەو کەسەیە کە بۆ خودا دەڕوا و بە زانستەوە لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی دیکە دەچێت. التعریفات للجرجانی ،ص٦٨

**سلووك**: تەیکردنی ئەو قۆناغانەیە کە دەبێ رێبواری تەریقەت بیانبڕێت تا دەگاتە پلەی توانەوە لەخودا. المعجم الصوفی،ص ٥٨٨

**واتا**: ئەو رێبوارەی کە نەگەیشتبێتە پاککردنەوەی دڵ و سیفەتە بەدەکانی دەتوانی لەجیاتی پێکی خالەقاتا و بداتە ئاوی ترێ و ئاوی هەنار و بەوانە خۆی مەست بکات. ئاوی ترێ: مەی. ئاوی هەنار: سرکە.

# دوو پارچە مانگ[١]

بۆ غەریبان زۆر غەریبە لێو شەکەر

تۆ قسەی تاڵت لە زار گەربێتە دەر[٢]

کۆتری دڵ تەقڵەبازی چۆن بکا

دەشت پڕە ئەورۆ لە شاهێن و سەقەر[٣]

شەو کە گەیمە مەجلیسی رووحانییان

بێ شەراب مەستبووم هەتا وەقتی سەحەر[٤]

زولفی پەرتبوو رووی بووە دوو پارچە مانگ

(جاء ت الساعە و انشق القمر)[٥]

(من حبیبی لیس لی الا الفراق

والفراق هو ادهی وأمر)[٦]

---

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) لێو شەکەر: لێو شیرین، لێو جوان. لەنێوان (غەریب و غەریب)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە، یەکەم بە واتا: ئاوارەیە و دووەم بەواتای سەیرە.

(٣) شاهێن: باڵندەیەکی گۆشتخۆرە و چرنووکی بەهێزی هەیە و لە (عقاب) دەچێ. فرهنگ فارسی عمید، ص٦٦٠. سەقەر: باڵندەیەکی گۆشتخۆری دەنووك خوارە. فرهنگ فارسی عمید. ص ٧٠٢

واتا: ئەو دەرودەشتە کە پڕی سۆفی بەتواناى وەك شاهێن و سەقەرن، چۆن کۆتری دڵی من بەرامبەر بەوان تەقڵە لێ بدا کە تازە پێی ناوەتە بارەگای سۆفییەتییەوە. وادیارە موخلیس تازە پێی ناوەتە خانەقای شێخ مستەفا وە.

(٤) رووحالی: جنۆکە و پەری.

(٥) لێکچوواندنی جەختاو لەنێوان (ڕوو و مانگ)دا هەیە. ئەم بەیتە ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿اقتربت الساعة و انشق القمر﴾ القمر/ ١.

(٦) ادهی: پلەی باڵایە بەواتا: گرانتر. امر: پلەی باڵایە بەواتا: تاڵتر.

واتا: لەو یارەم هیچم بەدەست ناکەوێ تەنیا دابڕان نەبێ، دابڕانیش لە هەموو شتێ طرانتر و تاڵترە. ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿بل الساعة موعدهم و الساعة أدهى و أمر﴾ القمر/ ٤٦.

(ليس يدرى ان ماياْتى به
من صغير و كبير مستطر)[1]

بۆ دزى چووم كەوتمە نێو پەرچەمى
ئێشەكەم ئاڵۆزە كەوتۆتە خەتەر

(كيف ترجو الاجر من غير حساب
لاينال ذاك الامن صبر)

(قل اعوذ) زۆر بخوێنە (موخليسا)
(تسلمن من سحر كل من سحر)[2]

---

(١) مستطر: لە لەوحى لەزەلدا نووسراوە. واتا: نازانى ئەوەى يارەكەم بەسەرم دێنێ چ گەورە و چ گچكە لە ئەزەلدا نووسراوە و دەبێ بێ. ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿وكل صغير و كبير مستطر﴾ القمر/ ٥٣.

بەتوانایی و وردەكارى شاعیر لەوەدایە ئەم سێ ئایەتەى سەرەوە كە اقتباسى لێيان كردووە هەرسێكیان لەیەك سوورەت دانە و كۆتایی بە (قمر، امر، مستگر) هاتووە كەدوا دەنگیان یێكە و مۆسیقایەكی جوانى بە بەیتەكان بەخشیوە.

(٢) ئاماژەیە بە هەردوو سورەتى ﴿قل اعوذ و برب الفلق﴾ و (قل اعوذ برب الناس﴾، بەتایبەتى ﴿من شر النفاثات في العقد﴾ ، ﴿من شر الوسواس الخناس﴾.

# جێی سەفا[1]

رۆژ لە ئەرزم شەو کەدێ دەچمە فەلەك

یانی ئینسان حەز بکا دەبتە مەلەك[2]

هەرکە رۆییم بۆ فەلەك نایێمەوە

لێم گەڕێ گەر ئارەزووی چاوی بەڵەك

رووی زەمینی گرتووە تۆ فانی غەم

بۆ خلاسی کەس نییە سوودی کەڵەك[3]

بەر لەیاران چووم گەیشتمە جێی سەفا

(قال شیخ الحلقة ما اعجلك؟)[4]

هێند درۆی دیوە لە (موخلیس) دلبەرم

چەند دەکەم بڕوایی پێم نایێ گەلەك[5]

---

(١) لە بەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) واتا: بەرۆژ لەسەر زەویە و خەریکی کاروباری رۆژانەم، کە شەو دادێ بەگیان بەرەو ئاسمان دەچم بۆ بارەگای خوا سەردەکەوم و وەکو فریشتەکانم لێدێ، چونکە لەشەودا بوو کە میعراج روویدا، بۆیە شەو میعراجی گیانە.

(٣) کەڵەك: چەند دارێکە ئەبەسترێ بە چەند کوندەیەکی گەورەی فوودراوەوە لەناو ئاودا بۆ پەڕینەوە و هات و چۆ پێکردنی. فەرهەنگی خاڵ شێخ محەممەدی خاڵ ل ١٥٧

(٤) جێی سەفا: شوێنی یەکڕەنگی. حەلقە: ئەڵقەی یادکردنەوەی خودا، ئەمەش تایبەتە بە نەقشبەندییەکان کە بەشێوەی ئەڵقە دادەنیشن و زیکر دەکەن.

واتا: لەپێش هاوڕێیان پەلەم کردو گەیشتمە شوێنی یەك ڕەنگی کە بارەگای خواپەرستییە، کەچی شێخی ئەڵقەی زیکر لێم بەدەنگ هات و گوتی: ئەم پەلەیەت لە چییە؟

(٥) واتا: رابەرەکەی موخلیس کە شێخ مستەفای نەقشبەندییە، دیارە زۆر جاران درۆی لە موخلیس دیوە (بە قسەی شاعیر خۆی ،ئەمەش جورە نەفس شکاندنێکە ) بۆیە ئەگەر راستیش بڵێ هەر بڕوای پێ ناکات. بێگومان ئەو درۆیەی موخلیس باسیکردووە درۆی ئاسایی نییە ولەوانەیە مەسەلەی بەگوێ نەکردن بێ لە هەندێ شت.

# ساحێب قڕانم[١]

گەدایی شاهم و شاهی جیهانم
غولامی عیشق و ئازادی زەمانم[٢]
خودانی دە وڵەتی عیشقم لەبۆیە
قڕانێکم نییە و ساحێب قڕانم[٣]
تەجەللا گەر بکا بۆ دڵ نیگارم
لەنێو رووحانییان ر ووحی رەوانم[٤]
لەلای یار گەرچی زۆر هەرزان و سووکم
لەلای بادەفرۆشان زۆر گرانم
ئەگەر ساقی بدا مەی تا بەیانی
دە زانم (لیلە القدر)ە دە زانم[٥]
لە مەیخانە ئەگەر مەرگم نەسیب بی
شەهیدی زاویەی (بیت الامان)م[٦]

---

(١) لەبەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.
(٢) لەنێوان (گەدا و شاه)دا دژیەك هەیە، هەروەها، (غولام و ئازادی).
(٣) قڕان: ناوی جۆرە دراوێکی زیوینە.
(٤) تەجەللا: دەرکەوتنی نوورەکانی غەیبە بۆ دڵەکان.
واتا: ئەگەر رابەری تەریقەت خۆی بەدڵی موخلیس نیشان بدا، ئەوا موخلیس لەنێو فریشتەکان پایەی بەرز دەبێ و دەبێتە رووحی رەوان.
(٥) ساقی: مەیگێڕ، لێرەدا مەبەستی شێخی تەریقەتە.
مەی: پێکی گیانیی سۆفیانەیە کە لە خانەقاوە بەدەست دەکەوێت.
واتا: ئەگەر شێخی تەریقەت تاکو بەیانی پێکی گیانی بداتە موخلیس، لای ئەو ئەو شەوە لەیلەتولقەدرە یالەشەوی (لیلە القدر)یش ئەبێ.
(٦) مەیخانە: خانەقای نەقشبەندییەکان. بیت الامان: شوێنی ئاشق، لێرە مەبەستی مەیخانەی عەشقی خوایە.

له ڕێگەی عیشقەوە گەر بێت و بمرم

دەمینێ تا ئەبەد ناو و نیشانم[1]

کە لاهووتیم بە ناسووتی بەدەل بوو

رەقیب شادبوو کە تێکچوو ئاشیان[2]

لەبەینی خۆم و یار هەر خۆم حیجابم

کلیلی وەسڵە لام وایە، نەمانم[3]

بەزاهیر گەرچی زۆر دوورم لە ڕەندی

لە دڵدا موخلیسی پیری موغانم[4]

(١) واتا: گەردوون شانی خۆی نەدا بەر وەرگرتنی ئەمانەتی دین لەبەر گرانیی جێبەجێکردن، کەچی مرۆڤ لەبەر نەزانیی خۆی وەری گرت و تیچوو. ئەمە ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿انا عرضنا الامانة على السماوات و الارض و الجبال فأبين أن يحملنها و اشفقن منها و حملها الانسان انة كان ظلوماً جهولاً﴾ الاحزاب/ ٧٢.

(٢) لاهووت: جیهانی واتا و گیانی. ناسووت: جیهانی ماددە.

ئاشیان: ماڵ. لەنێوان (لاهووت و ناسووت)دا دژیەك هەیە.

(٣) واتا: خۆم پەردەم لەنێوان خۆم و خوادا، واتا: لایەنی مادیم پەردەیە لەنێوان من و خوادا، هەرکە بمرم ئەو پەردە مادییە لا دەچێ و بە خزمەتی دەگەم و پێی شاد دەبم، چونکە گیانەکان بەرەو خودا دەگەڕێنەوە.

(٤) واتا: هەرچەندە بەڕواڵەت دوورم لە ڕەندی و مەردی، بەڵام لەدڵدا دڵسۆزی شیخی تەریقەتی خۆمم کە شێخ مستەفای هەرشەمییە.

# تاقی هۆمایۆن[١]

هەر دڵێك عاشق نەبێت، با نەڵێتن من دڵم
بولبولێ یاری نەبێ گوڵ، چۆن دەڵێ من بولبولم
وەعدەبێ لێوی پیاڵەی مەی لەسەر لێو دانەنێم
تا بەلێوی پڕ تەبەسسوم، نەم دوێنیتن گوڵم[٢]
هەرکەسێکی هاتە ژێر تاقی هومایۆنی عیشق
لاڤ شاهی نابی لێداتن بڵێتن من زلم[٣]
کاسەلێسی سفرە یی ئیحسانی ئەو بان و دەرەم
مومکینم نابی بڕۆم لەو قاپییە چاو پڕ زلم[٤]
نەفسەکەم داوێنی گرتووم بیکەمە قوربانی یار
هەردەبی وای لێ بکەم نۆباڵی نایخمە ملم[٥]
نابی رووناکی بداتن ئەختەری ئیقبالی من
تا قەرینی تالع و بەختێکی وارەش وەك قەلم[٦]

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) لەنێوان (لێو و لێو)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) هومایۆن: پیرۆز، یەکێکە لە ئاوازە مۆسیقیەکانی ئیران. فرهنگ فارسی عمید، ص ١٠٩٢

(٤) کاسەلێس: ناخۆر، چەلاوخۆر، بەردەستە. بان و دەر: بارەگا.
زلن پووش، قەسەری بچووك. چاو پڕزلم: واتا: چاکەی ئەوم لەچاودایە، ئەمە ئیدیۆمە.
واتا: من کە ئەکی بارەگای ئەم رابەرەم کردووە، ناتوانم پشتیان تێ بکەم و بڕۆم چونکە زلی چاکەیان لەچاومدایە.

(٥) یار: مەبەستی رابەرە. دیارە لێرەدا نەفسی شاعیری لە ئاستی ﴿ان النفس لامارە بالسوو﴾ دەرچووە و لە خلّت و خاری گوناه پاك بۆتەوە، بۆیە داوای لێدەکات کە خۆی بەقوربانی رابەرەکەی بکات.

(٦) لەخەمر: لەستێرە. قەرین: نزیك ، دۆست.

**موستەحیلە دڵ لە غەم خاڵی ببی، ڕۆژی ئەزەل**

**تێکی هەڵشێلاوە سانیع غەم لە گەڵ'خاك و گڵم[1]**

**بۆ بەهارێز دێتە لام خۆ دەردی من ساری نییە**

**هەر لەبەر تەنسیری عیشقە وا کەساد و دڵ کولم[2]**

**فەحسی توو بۆ من تەبیب سوودی نییە چونکی ئەمن**

**سینە سووتاوی خەیاڵی خاڵەکەی وەك فلفلم**

**گەر نەشیدی وەسفی حوسنی توو ئەمن تەلحین نەکەم**

**کەس نییە یانی لە باغی عاشقی هەر خۆم مەلم[3]**

**ئایەیی ئیبتالی سیحرم بۆ بخوێنە (موخلیسا)**

**لام وەیە دەست لێوەشاوی ساحیرانی بابلم[4]**

---

(١) **سانیع**: دروستکەر، لێرەدا خوایە.
**واتا**: لەو ڕۆژەی خوا پەیدای کردوومە خەمی لەگەڵ گڵەکەم شێلاوە، بۆیە دڵم لەخەم خاڵی نابێت. ئەمە ئاماژەیە بۆ پەیدابوونی حەزرەتی ئادەم لەخۆڵ ﴿منها خلقناكم و فيها نعيدكم و منها نخرجكم تارة اخرى﴾ طه/ ٥٥. هەروەها ئەم فەرموودەیە (كلكم بنو ادم و ادم خلق من تراب) فيض القدير، ص ٣٧.

(٢) **ساری**: درم. دڵ کول: دڵ بریندار.

(٣) **واتا**: لەباخی عەشقی خوایدا خۆم تەنیام و هەر خۆم دەبێ سروودی جوانیی ڕابەری تەریقەت بڵێمەوە و ئاوازی بۆ دابنێم.

(٤) **ئیبطال**: پووچەڵکردنەوە. ساحیرانی بابل: هارووت و مارووت. ئایەیی ئیبتالی سیحر: مەبەستی ئەم ئایەتەیە ﴿فلما القوا قال موسى ما جئتم به السحر ان الله سيبطله﴾ يونس/ ١٠.

# سیحری حەڵاڵ[1]

کە پەرت بوو زولفەکەت پەرت بوو خەیاڵم
بەرابەر نەقشی ئەبرۆت وەك هیلالم[2]
هەتا وەك نەی نەگا لێوم بەلێوت
دەبێ هەر سینە کون کون بێ و بناڵم[3]
خەریکی دەوڵەتی عیشقم لە بۆیێ
لە دڵدا خەزنەدار و دەست بەتاڵم[4]
ئەگەر دێی بۆ هەواڵ پرسیم[5] خەبەردە
بەچاوی خۆم هەتا بەرپێت بماڵم
کەمن پیری موغانم سایەداربێ
چ دە ربەستم کە بێ جاھ و جەلالم
غەزالم کەوتە سەحرا راو نەکا کەس
نەوەك تووشی بەلا بێتن غەزالم
تەماشای شیعری (موخلیس)کە دەزانی
کەخاوەن حیکمەت و سیحری حەڵاڵم[6]

---

(١) ئەم شیعرە لە بەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.
(٢) پەرت: بلاو، پەخشان. هیلال: مانگی یەکشەوە.
(٣) دەستنووسی م.خ (کون کون بێ و) / م.ك (کون کون بی ی و)
وێنەیەکی شیعەری جوان هەیە کە وەکو شمشاڵ لێوی بە لێوی بگات، هەروەها سینەی کون کون کە بەشمشاڵی چواندووە، چونکە شمشاڵ کون کونە.
(٤) لە دەستنووسی (أ.ر) لەجیاتی (دەست بەتاڵم) بووەتە (دڵ بەتاڵم).
دەوڵەتی عیشق: دەوڵەتی خواناسی. لەنێوان (خەزنەدار و دەست بەتاڵ)دا دژیەك هەیە.
(٥) دەستنووسی م.خ (هەواڵ پرسینم)ە.
(٦) حیکمەت: فەلسەفە، لێرەدا مەبەستی شیعری پڕ واتایە. سیحری حەڵاڵ: مەبەستی (بیان)ە کە بابەتێکی رەوانبێژییە. ئەمە ئاماژەیە بۆ فەرموودەی پێغەمبەر (ص): (ان من البیان سحرا و ان من الشعر حکما) فیض القدیر، ج١، المناوي، ص٥٢٤
لەم غەزەلەدا لە بەیتی پێنجەم بە ئاشکرا موخلیس بە (پیری موغان) ئاماژە بە رابەرەکەی دەکا و پێی وایە ئەگەر سایەی ئەوی لەسەربێ گوێی لەوە نیە کە بەبێ پلە و پایەیە، هەروەها بەیتی شەشەمیش هەر مەبەستی رابەرەکەیەتی.

# هەیهوو هەیهوو[1]

تاکو گەنجێکی نەفام بووم مەیلی پیرانم هەبوو

هەرکە پیری کەوتە سەر ڕووم مەیلی گەنجانم هەبوو[2]

هودهودی بادی سەبا وا لەسەبا هاتەوە لام

موڵکی گەنجیم تا هەبوو مورغی سلێمانم هەبوو[3]

زوڵفی یار لوتفی لەگەڵمان تا هەبوو خۆشبوو ژیان

بۆ هەموو فەسڵێك لەساڵ سێبەر و سەیوانم هەبوو

سینەکەی بێ کینەکەی تاك و رەقیب تێکی نەدا

باغی سێوان و هەنار و باغی خۆخانم هەبوو[4]

دەست لە تەختی سەڵتەنەت هەڵبگرە هەر رەندی بکە

سەردەمێك ئەمنیش وەکو توو قەسر و هەیوانم هەبوو[5]

ناو و نیشانت نەوێ تا بارەگای پیرۆزی یار

رووی نەدامێ یار هەتاکو ناو و نیشانم هەبوو[6]

دڵ بە هیچ چشت بەند مەکە دەم چی دەویست ئەوها بکە

تاکو ئەو دەرسم نەخوێند ژینێکی پڕ ژانم هەبوو

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) لەنێوان (گەنج و پیر)دا دژیەك هەیە. شاعیر لەم بەیتەدا بەپێچەوانەی سروشتی ئاسایی بووە، لەگەنجیدا هاودەمی پیران بووە و لەپیریدا گەنجان.

(٣) مورغی سلێمان: پەپووە سلێمانە. لەنێوان (سەبا و سەبا)دا رەگەزدۆزیی تەواو هەیە. ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿وتفقد الطير فقال مالي لا أرى الهدهد أم كان من الغائبين﴾ النحل/ ٢٠.

(٤) لەنێوان (سینە و کینە)دا رەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

(٥) سەڵتەنەت: دەسەڵات، ساماندارى. لەنێوان (سەڵتەنەت و رەندی) دژیەك هەیە.

(٦) لەم بەیتەدا (رد العجز الى الصدر) هەیە لەنێوان (ناوونیشان و ناوونیشان)دا. یار: لێرە مەبەستی رابەری تەریقەتە. واتا: هەتا لەپێستی خۆپەرستی و دونیاویستی خۆمدا نەڕنی شێخی تەریقەت ڕووی نەدامێ.

گەه لە مزگەوتان خەریك بووم زیكر و تەهلیلەم دەكرد

گەه لە مەیخانە شەراب و لاوك و حەیرانم هەبوو[1]

پێم لەسەرپێ دادەنا بادە بەدەست و یار لە رۆخ

كەوسەر و ئاوی حەیات و حوور و غیلمانم هەبوو[2]

شەو لەمەجلیس یار كە زولفی خۆی لەسەر ڕوو لادەدا

مانگەشەو پێویست نەبوو شەمعی شەبساتنم هەوو[3]

ڕەنگی دوو ڕەنگیم لەمەیخانە بەمەی شوشت نافەرین

مورشیدێكی ناسیح و هیمەتی مەردانم هەبوو[4]

پێم لەنێو مەیخانە دانا گەیمە نێو جا ه و جەلال

تا لەنێو مەدرەسە بووم قەلبێكی وێرانم هەبوو[5]

هەروەكو ئێستا كە دەمبینی لە پێشان وانەبووم

هەیهوو هەیهوو چەندە شەوقی شەنگەبێریانم هەبوو

قەت لەبیرناكەم بوواران بۆ قەراجی وەكو دەچووم

ئارەزووی راوی قولینگ و كارغەزالانم هەبوو

---

(١) **تەهلیلە**: تەسبیحات كردن و گوتنی (لا الە الا اللە).

**واتا**: شاعیر لەم بەیتەدا لەنێوان مزگەفت و خانەقادایە، لە مزگەفت خەریكی یادركردنەوەی خودا بووەو لەخانەقاش خەریكی مەینوشی و لاوك و حەیران بووە. مەبەست لەمەینۆشی و لاوك و حەیران ئەو بادە گیانیەیە كە لەوێ دەستی دەكەوێ و ئەمانە هەموو خوازەن و لاوك و حەیرانیش شیعر و سروودە سۆفیانەكانە.

(٢) **كەوسەر**: ناوی رووبارێكە لە بەهەشت. ئاماژەیەبۆ ئایەتی ﴿انا اعطیناك الكوثر﴾ الكوثر/ ١. **غیلمان**: كۆی غولامە **واتا**: كوڕ (لەبوونیەوە تا مێرمندالّی). **ئاوی حەیات**: ئاوی ژیان، ئەو ئاوەی گلگامش و ئەسكەندەر بەدوایدا گەڕاون و نەیگەیشتوونەتێ.

(٣) **شەبوستان**: شوێنی نووستن، شوێنی ژنانی حەرەم.

(٤) **واتا**: هەتا موخلیس نەهاتبووە ژێر سایەی رابەری تەریقەتی نەقشبەندیەوە، لە حالەتی دوو ڕەنگیدا بوو (ویستنی جیهانی هەستی و نەستی لەیەك كاتدا)، بەلاّم لەسایەی رابەرەوە بەمەی خانەقای شێخ رەنگی دوو رەنگی شوشت و رەنگی خانەقای نەقشبەندی وەرگرت.

(٥) **جەلال**: شكۆمەندی، حالێكی سۆفیانەیە و مەبەست لێی شكۆمەندی خوایە، پلەوپایەكی سۆفیانەیە و لەدوای جەمالەوە دێت.

**واتا**: هەتا لەحوجرەی مزگەفت بووَ دلێكی وێرانی هەبوو، بەلاّم هەركە پێی خستە خانەقای شێخ مستەفای هەرشەمی گەیشتە پایەیەكی بەرز.

روو لەنێو مێرگ و کولیك و سەیری ناوانم دەکرد

شەو لەدیوانی هەوەسدا لاقی سوڵتانم هەبوو

تادەمام لەو هۆبە رەشمارانە هەر کەیفم دەکرد

بۆ هەموو تەرزە غەمێکی بەزم و سەیرانم هەبوو

چەند لەبۆتان و لەخۆشناو و لەنێو شاران گەڕام

چونکە سۆرانی بوو (موخلیس) مەیلی سۆرانم هەبوو[1]

---

(١) شاعیر (خۆشناو)ی لە (سۆرانی) جودا کردۆتەوە، بەڵام خۆشناوەتی گۆفەرێکی دیالێکتی سۆرانە.

# بازی عیراقی[1]

**شاها ئەتوو شاهێکی لەسەر تەختی کەمالی**
**جارێکی بپرسە لەگەڵدای خۆت چییە حالی**[2]
**رووی مانگی شەوی چاردەیی ئەیپامی بەهارە**
**ئەوخاڵی لەسەر رووی بووەتە نەقشی جەمالی**[3]
**کەوتوومەتە ژێر هەڵمەتی بازێکی عیراقی**
**رۆم و عەجەمی دەینمە ژێر سێبەری باڵی**[4]
**بۆ بچمە دەری ناکەس و نەودەوڵەتی ئەورۆ**
**هەر دێمەوە دەرگانەیی تۆ، تۆ بنەماڵی**[5]
**جامێکی بە فتوا کە حەرامە بدە ساقی**
**جامێکی لەخوێنم ئەتوو نۆشکە بە حەڵاڵی**[6]

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفووفی مەحزووفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.

(٢) کەماڵ: دروستییە لە هەموو شتێ کەسیفەتی خوایە، لێرەدا بۆ رابەرەکەی خۆی بەکارهێناوە، چونکە نازناوی (کمال الدین)یشی هەبووە.

(٣) جەماڵ: سیفەتی خوایە، لێرە مەبەستی جوانیی دەروونی رابەرەکەیەتی.

(٤) باز: شەهێن، لێرە مەبەستی رابەرەکەیەتی کە شێخ مستەفای نەقشبەندییە.
رۆم: تورکی عوسمانی.

(٥) نەودەوڵەت: دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو. بنەماڵ: وەجاغ.
ئەم غەزەلەی لەوکاتەدا داناوە کە ویستوێتی بچێتە مەدینە و نەیەتەوە، دوایی نەچووە و گەراوەتەوە خزمەت شێخ مەستەفا.

(٦) لێرەدا موخلیس لە حاڵەتێکی نائاساییدایە و دەیەوێ چاو لەسۆفییە فەلسەفیەکان بکات و پێکێك هەلبداکە بەفتوای شەرع حەرامە، بەلام بێگومان ئەمە لایەنی رواڵەتی بەیتەکەیە و مەبەست لێی مەیی ئاسایی نییە. لەنێوان (حەرام و حەڵاڵ)دا دژیەك هەیە.

**دەڕوا وەکو خەو وەسڵ و فیراق و هەموو (اضداد)**

**دونیا چ سەباتێکی نییە شیرن و تاڵی[1]**

**پێی ناگرێ دەست هەڵگرێ (موخلیس) لە مەحەببەت**

**تاپیر دەبی هەر دێتەوە سەر دەوری مناڵی[2]**

---

(١) **وەسڵ**: گەیشتنە یار. فیراق: دوورکەوتنەوە لەیار. اضداد: ئەو شتانەی کە پێچەوانەی یەکدین. سەبات: بەردەوامی. لەنێوان (وەسڵ و فیراق، شیرن و تاڵ) دژیەك هەیە.

ئەم بەیتە ئاماژەیە بەم بەیتەی ئیمامی شافیعی:

**ولاتجزع لحادثة الليالي**

**فما لحوادث الدنيا بقاء**

ديوان الشافعي، محمد عفيف الزعبي، ص١٥

(٢) **مەحەببەت**: خۆشەویستیی راستەقینەی خوایی، لێرەدا مەبەستی خۆشەویستی رابەری تەریقەتەکەی خۆیەتی. لەنێوان (پیری و مناڵی)دا دژیەك هەیە. لەمەش ئاماژەیە بە بەیتێکی (مەحوی) کەدەڵێ:

**لەبێ کەوتووم و لەفسم بۆهەوا دەشێ وەکو منداڵ**

**لەبەرپیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم**

دیوانی مەحوی، مەلا عەبدول کەریمی مودەریس ، ل ٢٢١

### ٥) هەستکردن بەگوناه:

# موخلیس و حەزین[١]

چم لەخۆم کرد چم نەکرد بۆ ئاخیرەت نەفعێ بدات
چاك وەیە سەر هەلگرم بۆ خۆم بکەم تەرکی ولأت
بچمە رەوزە هەر بگریێم بانگ بکەم لەحزە و سەعات[٢]
یا رەسوولی مەدەنی[٣] جا نیمە خۆم خستە پەنات
شەرمەزار و ڕووسیاهم بێکەسم رووحم فیدات
بێ شعوور بووم بووم بەیاری نەفس و شەیتانی لەعین[٤]
رووم بەمەغرووری لەدونیا کرد و غافڵ بووم لەدین
کەس نییە رووی تێ بکەم نەی ﴿رحمه للعالمین﴾[٥]
هەر ئەتۆی (ملجأ) لەرۆژی ئاخیرەت بۆ موزنیبین
دەستی من بی و دامەنت ئاگات لەمن بی بۆ نەجات

---

(١) ئەم پێنج خشتەکییە لە گۆڤاری هەتاوی ژمارە (٧١)ی ساڵی ١٩٥٦ لەلاپەڕە ١١ بڵاوکراوەتەوە لەبەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
هەردوو شاعیران موخلیس و حەزین دان بەگوناهەکانی خۆیان دەنێن و سەری خۆیان هەڵگرتووە و بەرەو مەدینەی پێغەمبەر (ص) دەچن بۆ لەوەی لیێ بپاڕێنەوە و بەبەر شەفاعەتی بکەون.

(٢) رەوزە: مەبەست گۆڕی پێغەمبەرە (ص). ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە: (مابين قبرى و منبرى روضة من رياض الجنة) فيض القدير، ج٥، ص ٤٣٣.

(٣) مەدەنی: نیسبەتە بۆ شاری مەدینە کە پێشوو (يثرب) بوو.

(٤) لەدەستنووسی م.خ ((رووسیاهو))ە، لەگۆڤاری هەتاو (سەرفرۆو)ە.

(٥) ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿وما أرسلناك الا رحمة للعالمين﴾ الانبياء /١٠٧.

چەندی واعیز وەعزی دام حاسیل نەبوو بۆم (انكفاف)[1]
هیچ ئەما ئەیکەم لەفیعلی[2] سووء[3] لەگەڵ لاف و گەزاف
هەر خودایە گەربزانی جیرمی جورمم[4] بێ خیلاف
کێوی عیسیانم ئەگەر بێت و بچێتە کێوی قاف[5]
مومکینە قافت لەبەرچاو ببتە زووری زوورەبات[6]
چونکە چیی چابی لەپێش خۆم بۆ سبەی[7] نەمناردیە
هەرکەسێکی لێی ئەپرسم چار و تەدبیرم چییە
ئیجتینابم[8] لێ ئەکاتن هیچ جەوابێکی نییە
جا بەقوربان خۆت عیلاجم گەرنەکەی هیچ کەس نییە
بێ جەسارەت کا لەلای مەولا تکامان بۆ بکات
کردەوەی خۆم دێنمە بەرچاو دێمە سەر رێگای خەتەر[9]
چونکە هێند زۆرە خراپەم وا لەغایەت چوویتە دەر
وایە ئەمما ئیعتیقادم وایە ئەی فەخری بەشەر
تۆ شەفیعم بی گوناهم سەد زیاتر بی ئەگەر
نادرێ ئەسڵا عەزابم دێمە رێزی ئەولیات

---

(١) **انكفاف**: وازهێنان
(٢) لەدەستنووسی م.خ (فیعلی)یە، لەگۆڤاری هەتاو (کاری)یە.
(٣) **سووو**: خراپە. **لاف و گەزاف**: فیز و خۆهەڵکێشان.
(٤) لەدەستنووسی م.خ (جیرمی جورمم)ە لە گۆڤاری هەتاو (جورمی جیرمم)ە.
**جورم**: سووچ، گوناه. **جیرم**: تەن، قەبارە.
(٥) **کێوی قاف**: کێوێکی ئەفسانەییە و پێشی دەڵێن قەفقاز. فرهنگ فارسی عمید، ص ٧٨٦.
(٦) لەدەستنووسی م.خ (زووی زوورەبات)ە لەگۆڤاری هەتاو (زۆری زۆرەبات)ە. زوور: زوورگ، گردۆلکە. زوورەبات: زوورگەبات، ناوی گوندێك بوو لە رۆژئاوای هەولێر و سەر رێی مووسڵ کە رێزە گردۆلکەیەکی لێیە.
(٧) لەدەستنووسی م.خ (بۆ سبەی)، لەگۆڤاری هەتاو (بەسۆی)ە.
(٨) **ئیجتیناب**: خۆ دوور خستنەوە.
(٩) لەدەستنووسی م.خ (سەر حاڵی خەتەر)، لەگۆڤاری هەتاو (سەر خەتەر)ە.

فەزلی سەحبی تۆ لەگەڵ ئەسحابی کەهفان لێك جودان[1]

من موحیبی سەحبی تۆمە و سەگ[2] موحیب بوو بۆ ئەوان

سەگ بەهەشتی بوو بەمەنزیل[3] سافیدات بێ جیسم و جان

چۆن سەگی ئەسحابی کەهفان بچتە نێو قەسری جینان

من سەگی ئەسحابی تۆ نەچمە قسووری عالیات

هەرکەسێ شاهی مەدینەی یار نەبیتن بێکەسە[4]

بێ سەباتە تاعەتی هەروەك بینای بی هەندەسە

بانەترسێتن لەمەحشەر (موخلیس)ی پڕ وەسوەسە[5]

ئەی (حەزین) حوزنت نەبی مادام ئەوت ناسی بەسە

بەحری جوود و غیرەتە و ئەهلی وەفا عالی سیفات[6]

---

(١) سەحب: یار. ئەسحابی کەهف: یارانی ئەشکەوت. ئیشارەتە بە ئەم ئایەتە ﴿ اذ اوى الفتية الى الكهف فقالوا ربنا اتنا من لدنك رحمة و هيأ لنا من أمرنا رشداً، فضربنا على اذانهم في الكهف سنين عدداً﴾ الكهف/١٠.

(٢) سەگ: مەبەستی سەگی یارانی ئەشکەوتە و ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿تحسبهم ايقاظاً وهم رقود و نقلبهم ذات اليمين و ذات الشمال و كلبهم باسط ذراعية بالوصيد لو اطلعت عليهم لوليت منهم فرارا و لملئت منهم رعباً﴾ الكهف/١٨.

(٣) لەدەستنووسی م.خ (سافیدات بێ) لەگۆڤاری هەتاو (سافیەبێ)یە.

(٤) شاهی مەدینە: لێرە مەبەستی پێغەمبەر (ص).

(٥) لەدەستنووسی م.خ (پڕ وەسوەسە) و لە گۆڤاری هەتاو (بێ وەسوەسە)یە.

ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ص): (لكل نبي دعوة مستجابة، فتعجل كل نبي دعوته، واني اختبأت دعوتي شفاعة لامتي فهي نائلة من مات منهم لا يشرك بالله شيئاً). صحيح سنن ابن ماجة، محمد ناصرالدين الالباني، ص٤٣٠.

(٦) جوود: بەخشندەیی. عالی سیفات: سیفەت بەرز.

موخلیس ئەم غەزەلەی (حەزین)ی وەرگرتووە و کردوویەتیە پێنج خشتەکی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەغەزەلەکەی حەزینی پێ خۆشبووە بۆیە پێنج خشتەکی لەسەر نووسیوە. هەرچەندە لەتەمەن لێك نزیکن بەلام موخلیس زیاتر بەشیعرەوە خەریك بووە و چوونی بۆ سەر ڕێبازی نەقشبەندی و میانەی لەگەڵ ڕابەرەکەی زیاتر هانی داوە بۆ شیعردانان. کەچی حەزین وەکو شاعیرێك دەرنەکەوتووە زیاتر بەمەلای مودەڕیس ناوبانگی دەرکردووە و سەر بەهیچ تەریقەتێکی سۆفیانە نەبووە و زوو وەفاتیکردووە.

**٦) ئامۆژگاری ئایینی:** ئەو جۆرە ئامۆژگارییانەیە کە لەڕووی ئایینەوە ئاراستەی دەوروبەر دەکرێت. بەمەبەستی سوود لێ وەرگرتن. موخلیس ئەم جۆرە ئامۆژگارییانەی زۆرە بەتایبەتی لە دوو بەیتی و تاکەکانی دا.

# ئاوی بەقا[1]

**بێ خەبەر بۆچی وەها بێ خەبەری**
**سەفەری گەرچی بەزاهیر حەزەری[2]**
**کۆششێکی بکە تا پێت ئەکرێ**
**پسەری ئەورۆ سبەینێ پدەری[3]**
**سەبەبی پارە نییە موعتەمەدی**
**تۆ بە تورەی بەشەری موعتەبەری[4]**
**ئەبی نازت نە بە زێڕ و نەبەزیو**
**تۆ بەدڵ مەعدەنی زێڕ و زەبەری[5]**

---

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فعلن.

(٢) **حەزەر:** ئامادە، حازر، شار. ئاماژەیە بەم فەرموودەیە (کن في الدنیا کأنك غریب أو عابر سبیل) فیض القدیر، ج٥، ص٥١.

(٣) **پسەر:** کوڕ. **پدەر:** باوك.

**واتا:** موخلیس لەبەیتی یەکەم و دووەم ئاگاداری بەرامبەرەکەی دەکاتەوە و ئامۆژگای دەکات کە بە ئاگابێتەوە و خێرا بارکۆڵەی تێك بنێ چونکە سەفەرێکی هەمیشەیی لە پێشە و داوای لێدەکا بەردەوام لە هەوڵدان بێت و خۆی بۆ دوا ڕۆژ ئامادە بکاو بەرگەی هەڵگرتنی لێپرسینەوە بگرێت.

(٤) **موعتەمەد:** پشت پێ بەستراو. **تورە:** مۆرە. **موعتەبەر:** خاوەن پلە و پایە.

**واتا:** پارەو پوول کەس ناکاتە پیاو بەڵکو مۆری مرۆڤایەتی چاکترین بەردی مەحەکی مرۆڤایەتییە. ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿ولقد کرمنا بني ادم و حملناهم في البر و البحر و رزقناهم من الطیبات و فضلناهم علی کثیر ممن خلقنا تفضیلا﴾ الاسراء/ ٧٠.

(٥) **زێڕ و زەبەر:** وێران. ئەم نیوە بەیتە دەتوانین بە دووشێوە بخوێنینەوە:

(تۆ بەدڵ مەعدەنی، زێڕو زەبەری) یاخود (تۆ بەدڵ مەعدەنی زێڕ و زەبەری). واتا: دڵی تۆ کانی زێڕە و تۆ سەرکەوتووی. ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿اعلموا انما الحیاة الدنیا لعب و لهو...﴾ الحدید/ ٢٠.

مەکە دۆستایەتی دونیا چ نییە

لەگەڵی کەس دەمێ ناباتە سەری[1]

تەڵەبی ئاوی بەقا بۆچی دەکەی

تا لە دونیا بی لەبەحری خەتەری[2]

چ خزر بی، چ سکەندەر بی دەبی

بگری ئاخری رێی دەربەدەری[3]

هەرچی نووسرابی ئەزەل وادەکرێ

نییە تەدبیر بە تەنیا ئەسەری[4]

کە قەزا ساحێبی تەدبیری نەبوو

بەهەبا رۆیی سکەندەر سەفەری[5]

(موخلیسا) گەرچی گەدا هەینەتی لێك

لە دڵا خاەنی دورِ و گوهەری[6]

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە (ان الدنیا ملعونة ملعون مافیها الا ذکر الله تعالی و ما والاه وعالما ومتعلماً) فیض القدیر، ج١، ص٣٢٦.

(٢) ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿انك میت و انهم میتون﴾ الزمر/ ٣٠.

(٣) سکەندەر: لە وشەی (الکساندەر)ی ئەورووپیەوە وەرگیراوە، کوڕی فیلیب و پاشای (مقدونیە) بووە، بە چل هەزار سەرباز هێرشی هێنایە سەر ئێران و لە ٣٣١ پ.ع بەسەر داریۆشدا سەرکەوت، لەگەڵ (خدر) بۆ ئاوی ژیان چووە، کەچی نەگەیشتووەتێ. المنجد، ط٢٢، ص٤٢

(٤) ئەزەل: دێرین، ئەزەل و ئەزەلییەت بۆ خوایە، جگە لەخوا هیچ شتێ ناوی لێ نانرێ ئەزەلی خودا دێرینە و هەمیشەیە، ئەزەلییەت سیفەتی خوایە. معجم مصطلحات الصوفیة، ص١٥.

لێرەدا موخلیس لەگەڵ رای جەبریەکانە و هەمووی بۆ خوا دەگەڕێنێتەوە، ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ﴿و ما تشاؤون الا أن یشاء الله ان الله کان علیما حکیماً﴾ الدهر/٣٠.

(٥) هەبا: (هباو): تەپ و تۆز. بەهەبا رۆیی: بەفیرۆ چوو.

واتا: قەزا خۆی چی لەدەست نیە و هەرچی هەیە پێی دەکرێ، بۆیە هەموو کاروکردەوەیەکی مرۆڤ کۆتایی پێ دێ، هەروەکو ئەسکەندەر کە ئەو هەموو وڵاتانەی گرت و سەری نایەوە.

(٦) گەدا هەینەت: سواڵکەر ئاسا. لیك: کورتەی (لکن)ی عەرەبیە.

گوهەر: گەوهەر.

لێرەدا شاعیر وەکو شاعیرە کلاسیکییەکانی دیکە بەشیعرەکانی خۆی دەنازێ و بە دورِ و گەوهەری دەچوێنێ.

# شیعری دڵداری

## ڕێی غەنە نادا[1]

دولبەر کە سەبا زولفی لەسەر ڕوومەتی لادا
بنواڕە مەلەك وا لەسەمادان لە سەمادا[2]
پارێزی کەساندا دڵ کە بگا دەستی بە مەقسوود
بۆ کوشتنی تیرباری بەجارێ لە پەنادا[3]
چاوم کە سپی ماوە لەدووریت وەکو یووسف
جامەت چ دەبێ جارێ ڕەوان کەی بە سەبادا[4]
دیتی کە سەرم خستە بەری پێی بەتەمای رووی
لەم ڕێگەیە لای دا و گەڤ کرد، سەری بادا

---

(١) لەم شیعرە لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفوفی مەحزوفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

(٢) لەنێوان (سەما و سەما)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) پارێزساندن: هە ل وەرگرتن، بە هەلزانینی کات. ساند: کورتکراوەی (ستاند)ە. پەنا: حەشارگە.

(٤) چاو سپی بوون: کوێربوون. جامە: جل و بەرگ. لێرەدا مەبەستی تەلمیحە بۆ یووسف و برایەکانی. ئاماژەیە بۆ ئایەتی ﴿وابیضت عیناه من الحزن فهو کظیم﴾ یوسف/ ٨٤.
واتا: هێندە چاوەنۆڕیم کرد و نەهاتی، لە داخاندا کوێربووم و وەکو یەعقووم لێهات، جا چ دەبێ لەگەر وەکو یووسف کراسەکەتم بۆ بنێری تا چاوم چاك بێتەوە. نیوەی بەیتی دووەم ئاماژەیە بەم ئایەتە ﴿اذهبوا بقمیصي هذا والقوه علی وجه ابي یأتي بصیراً و اتوني باهلکم اجمعین﴾ یوسف/ ٩٣.

**من ڕەندی ئەکەم زاهیدی خود بین چیە تانت**

**چەند بەستەزمانی ئەتوو خۆت کوشت لە ڕیادا[1]**

**هەرچەندە کە موخلیس بە ئەزاکەت ئەدوێتن**

**ئەو ڕافزی بابە ئەبەدا ڕێی غەنە نادا[2]**

---

(١) خودبین: خۆپەرس. تان: پلار، سەرزەنشت.

(٢) رافزی: ئەوانەی کە ئیمامی عەلییان زۆر خۆش دەوێ و دەڵێن: پەیامی پێغەمبەرێتی بۆ عەلی هات و جوبرائیل خیانەتی کرد و دایە محەمەد (ص). رمضان افندي على شرح العقائد، ص ١٤.

غەنە (غەننە): وشەیەکە لەیاری تۆپی پێ و قاشوانێ بەکاردێ، لەو کاتەی کە یاریکەر یاری بە تۆپ یان بە قاشۆیەکە دەکات و ناهێڵێ کەس لێی بستێنێ و پێچ و پەنای پێ دەکات.

واتا: هەرچەندە کە موخلیس بە هێمنی یار دەدوێنێ و چاوەڕۆخەی بۆ دەداتەوە، کەچی ئەو یارە رافزی بابە هێند وشکە هیچ قسەیێ کاری لێ ناکات و ناخرچێ.

# کۆخە کۆخ[١]

کەی دەگا دەستم بە باڵای بەرزی یاری شەنگ و شۆخ

دەفعەیێ لەو باغە نەمدیوە هەنار و سێو و خۆخ[٢]

هەرکەسێکی بوو بە عاشق یاری دڵ نەرمی نەبی

عومری گەنجی و عومری پیری هەر دەبێتە ئاخ و ئۆخ

دەستی خۆم دانا لەسەر ڕووم، لێوی خۆم جوولاندەوە

زاڵمەی سۆر هەڵگەڕا ئەبرۆی بزاوتن یانی یۆخ[٣]

بەزمە ئەوشۆ وامەکە زایەع ببیتن هاتنم

رووحەکەم بۆ تۆ بێ بەس مەنعم مەکە بتێیمە رۆخ[٤]

موخلیسا) دانیشە تازە تۆ دزیت پێ ناکرێ

باغەوان دانیم بە هۆش، تۆش پیر و ساحێب کۆخە کۆخ[٥]

---

(١) لە بەحری رەمەلی مەشتی مەقسورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) شەنگ و شۆخ: خۆی (شۆخ و شەنگ)ە، بەڵام سەروا ناچاری کردووە. لەنێوان (شۆخ و خۆخ)دا رەگەزدۆزی لاحیق هەیە. باغ: لێرەدا سینەیە هەنار و سێو خۆخ: ئاماژەن بە مەمکەکان.

(٣) یۆخ: وشەیەکی تورکییە بە واتا (نا) دێت. ئەم بەیتە ئاماژەیە بەنیوە بەیتێکی (نالی) کە دەڵێ: (برۆی هێنایە یەك وەك شكڵی (لا) یەعنی کە بێزارم) دیوانی نالی، ل ٢٧١

(٤) بتێمە رۆخ: بێمە رۆخت. لێرەدا جۆرە لادانێکی زمانی هەیە و لەبەر سەروا (ت)ی رۆخت بە (بێمە)وە لکاوە و بووەتە (بتێیمە).

(٥) ئەم بەیتە ئاماژە بە پیربوونی شاعیر دەکات، بەڵام خۆ شاعیر لەدوا تەمەنی سۆڵ بووە و دوور نییە لەبەر سەروا (کۆخە کۆخ)ی پیری بەکارهێنابێ.

واتا: موخلیس ئەو باخە کە سینگی یارە ئێشکچیەکی چاپووکی هەیە و خەوی لێ ناکەوێ، بۆیە دزیت پێ ناکرێ و سێو و هەنارت بە نسیب نابێت، خۆ ئەگەر بشگەیە ناو باخەکە ئەوا لەبەر کۆخەت باخەوان بە ئاگا دێ و قاوت دەدات.

# داش بەداش[1]

**یار کەتازە پێگەیشتووە چی هەبێ نایدا بەلاش**

**هێند رەقە هیچی لەدەست هەڵناوەرێ حەتتا بەڵاش[2]**

**بێ بەها چووم بۆ قەڵای لوتفی لەبەر رەشبوونی دڵ**

**پێی وتم کێ وا دەکا؟ سەرفی قەڵا کا بۆ قەلاش[3]**

**گەنمی وەسڵی رووت بەسە، جۆی فیراق تێکەڵ مەکە**

**پێی وتم: بێ تاقەتی، وا ریشەکەت بوویتە مزاش[4]**

**من بەتەنیا غەم دەخۆم، غەم گۆشت و خوێنی من دەخوا**

**بۆیە یەك یەك دەندەکانم، بووینە شەقڵەی بێ هەراش[5]**

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەقسوورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) بەلاش: خۆرایی. لەنێوان (بەلاش و بەڵاش)ا رەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) قەڵا: مادەیەکە بۆ سپیکردنەوەی قاپ و قاچاغی مس بەکاردەهێنرێت. قەلاش: نەبوو، موفلیس.

واتا: چوومە لای یارم تا هەندێ قەڵام بەخۆڕایی بداتێ بۆ ئەوەی دڵی رەشمی پێ سپی بکەمەوە، بەڵام یار وتی: چۆن قەڵا دەدەمە پیاوی قەلاش؟

(٤) لەنێوان (وەسڵ و فیراق)دا دژیەك هەیە. مزاش: دوو بەشە: مز: نرخ. اش: کورتکراوەی ئاشە. مزاش: مزی ئاش، ئەو گەنم و جۆیەی کە ئاشەوان {لەجیاتی پارە/ وەکو دەستهەق} لەخاوەنی باراشەکە وەردەگرێ. واتا: موخلیس بە یەکگەیشتنی یاری بە گەنم چواندووە کە زەردە و رووناکی ئاسۆی لێوە دیارە، دوورکەوتنەوەشی بە جۆ چواندووە کە رەشە و نائومێدی دەگەیەنێ.

(٥) دەللە: پەراسوو. شەقڵە: دارێکی ئەستوور نییە و وەکو دەسکە خاکەناسە و دەیکەنە رایەڵی خانوو. هەراش: ئەو زەڵ و قامیش و قرش و قاڵەیە کە دەیخەنە سەر شەقڵە و قوڕی سواقی دەخرێتە بان.

شاعیر لەبەر خەم زۆری لاواز بووە و دەندەکانی وەکو شەقڵەی بێ هەراشن، لەم وێنە شیعرییەدا موخلیس دەستڕەنگینی نواندووە.

دڵ لەسەر دار دامەیی عیشقت لەوەسڵی ئەو سوار

ئۆینی لۆ نایێ کەچی ناشکا لەگەڵما داش بەداش[1]

تێکچووە مێشکی سەرم، ئالەتی تەفکیرم نەما

هیچ خەیاڵی وردی لێ نایێتە خوار وەك کۆنە ئاش[2]

وەك رەقیب زانی کە یار دە یوێ لەگەڵ یەك کۆببین

ئالەتی تەفکیر و کیزبی خستە کار هەروەك رەشاش

دڵ وڵاغی ئیشتیاقی توند بووە گەرمەی دەکا

سەر ڕەقە هەرچەند دەکەم، دەڕواتە پێش، نایێتە پاش[3]

ئەمتیعەی شیعری هەیە (موخلیس) لەسەر تەرزێکی کۆن

ئەمڕۆ تا مۆدە هەبێ، کەس نایکڕێ کۆنە قوماش[4]

---

(١) لۆین: یاری ورد. داشە بەداش: بەرد بە بەرد لەیاری (دامە)دا. واتا: دڵم لەسەر داردامەیی عەشقی تۆ سوارە و دەیەوێ ئاغە بکات، واتا پێت بگات و بگاتە جێی مەبەست. کەچی هەموو یارییەکی لەبیر چووە و هیچی بۆ نایێ، یاریش هێندە رەقە و لاملە بەرد بە بەردیشم لەگەڵ ناکات، واتا: یارەکەم بواری گفتوگۆم نادات تا بە قسەی خۆش لە خشتەی ببەم و ماڵی بکەم.

(٢) واتا: چۆن کۆنە ئاش ئاردەکەی درشتە، مێشکیشم ئاوا تێکچووە و بیری وردی لێ نایێتە دەرەوە.

(٣) واتا: چۆن وڵاخ کە لە غاردان گەرمەی دەکات و بەردەوام دەبێ، چەندی جڵەوی راکێشیەوە هەر چەپۆك بۆ پێشەوە داوێ و ناگەڕێتەوە، دڵیش ئاوای لێهاتووە، سەری هەڵگرتووە و ناگەڕێتەوە.

(٤) ئەمتیعە: کۆی مەتاعە بەواتا: کاڵاکان، کەل وپەلەکان. مۆدە: نوێ، تازە، لە ئەسڵدا لە وشەی (Alamode)ی فەرەنسیەوە هاتووە.

# بەختی زاغ[1]

دەردی عیشقم نابێ سەر ڕێز هەردەمە ئەمکانە ساغ

دارەمەیتێ هەڵببەستن بمبەنە لای ڕوو چراغ[2]

ئەی رەفیقان بێنە لاما(ن)[3] شیعر و بەستەم بۆ بڵێن

بانگ کە ئەدیدە غەزالان بمگرن دەورو قەراغ

شین لە دەورم دا ببەستن بۆم بگرێێن دەن لەخۆ

دلبەرم جار جار بڵێ ئۆف لاوەکەی دڵ پڕ لە داغ[4]

گەرچی وا کوشتمی بە ناحەق گەر بدا وەعدەی ویسال

نامەوێ غیلمان و حۆری بۆچمە گوڵزار و باغ[5]

قەبرەکەم سەر ڕێ بێ مەئوای با بڵند (بێ)[6] بەڵکو یار

بێ بەلامانا گوزەرکا و بای وەتەن پڕ کا دەماغ[7]

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەقسوورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) دارەمەیت: دارەبازە. رووچراغ: رووی وەکو چرا.

(٣) لەدەستنووسی شاعیر (لاما) بوو، لەوە دەچێ نوونەکە لەبیرکرابێ.

(٤) دەن لەخۆ: لەخۆدەن، کورتکراوەی (لەخۆبدەن)ە و لادانێکی زمانیی شاعیرە.

(٥) غیلمان: کۆی غولامە و نێرەکە لەبەهەشتدا خزمەتی بەهەشتییان دەکەن.

(٦) لەدەستنووسی شاعیر (بڵند)ە و وادیارە (بێ) لەبیرکراوە.

(٧) گوزەرکا: تێ بپەڕێ. ئەم بەیتە ئاماژەیە بەم بەیتەی (وەلی دێوانە):

با کلکۆم تەنیا جەڕای خێڵان بۆ

نزیك هەوارگەی سەر ڕە وێڵان بۆ

بەڵکم ئەو لیلەم جەڕا گوزارێ

راش گنۆوە سەر گلکۆی من جارێ /ژیان بەسەرهات و هۆنراوەی وەلی دیوانە، عوسمان هەورامی، ل ٩٠

**من لەمەیدانی (الست)دا خۆم بە مەحروومی دەدیت**

**هەرکە دیم یاری جەفاکار، چەرخی گەردوون، بەختی زاغ[1]**

**(موخلیس)ی دڵ پڕ لەغەم چ بکا لە دەست دەردو ئەلەم**

**دەردی عیشقم نابێ سەر ڕێژ هەردەمە ئەمکانە ساغ[2]**

---

(١) (الست) ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿الست بربکم قالو بلی﴾ الاعراف/ ١٧٢.
بەختی زاغ: بەختی رەش. زاغ: باڵندەیەکە لە قەلەڕەشکە بچووکترە، قەلەڕەشکە. واتا: هەرکە یاری بەئازار و چەرخی چەپگەردو بەختی رەشی خۆم لەدونیا دیت، زانیم کە لە رۆژی ئەزەلدا ئەمەم بۆ نووسراوە.

(٢) لێرەدا موخلیس نیوە بەیتی سەرەتای غەزەلەکەی دووبارەکردۆتەوە شاعیر لەجیاتی (سارێژ) وشەی (سەرڕێژ)ی بەکارهێناوە و لەمەش جۆرە دەسکارییەکی زمانییە و گەر (سارێژ)یش بایە کێشی نیوە بەیتەکە تێك نەدەچوو.

# چوارینە[1]

شەو لەبەر فیکر و خەیاڵی زوڵفی خاو، خاوە دڵم
ڕۆژ بەیادی ڕووی بەرە و ڕۆژ، مات و داماوە دڵم
واڵە دەستدەردی جودایی هەر بە ناو ماوە دڵم
گەرخودا چارم نەکا، مەعلوومە فەوتاوە دڵم[2]

کاسی کەنسی چاوی چاو بێچووە غەزالی خوتەنم
سەربەسەر سەر پڕ لەئەسراری هەوای ئەوسیم تەنم
چونکە بیماری خەدەنگی[3] لیو عەقیقی یەمەنم
فەرموو بنوارە هەناوم، پڕ لەخوێناوە دڵم[4]

هێندە مەشهوور بوو لە دونیا حوسن ئاداب و حەیات
بێ مولاقات و دواندن سەربەخۆم بووم مەبتەلات

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
ئەم کۆمەڵە چوارینەیە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری کۆمەڵە چوارینەکانی (بێخود)، هەردوو کۆمەڵە چوارینەکان تام و بۆی نامۆییان لێ دێت و موخلیس خۆشی دانی بەوەدا ناوە کە کاریگەریی بێخودی لەسەرە، بەڵام لەرووی کێشەوە لەوەی موخلیس جودایە و لەبەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووفە.
(٢) خاو: زولفی نەهۆنراو. لەنێوان (خاو و خاو)دا رەگەزدۆزیی تەواو هەیە. شاعیر کە (رووی بەرەو رۆژ)ی بەکارهێناوە لەبەر ئەوەیە چونکە تیشك دەداتەوە و جوانییەکی دڵگیر دەبەخشێت.
(٣) لەنێوان (کاس و کەنس)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە. لەنیوەبەیتی یەکەمدا هەست بە مۆسیقا و ریتمێکی جوان و رێك دەکرێت، بەتایبەتی لەنێوان کاس و کەنس و لەلایەك و (چاوی چاوبێچوە)دا لەلایەکی دیکەوە. هەروەها لەنیوە بەیتی دووەمدا دەنگی (س) پێنج جار دووبارە بۆتەوە و مۆسیقایەکی جوانی هەیە و جگەلە رەگەزدۆزی تەواو لەنێوان (سەربەسەر سەر).
(٤) لەدەستنووسی شاعیر (غەدەنگ) بوو. خەدەنگ: تیر.
عەقیقی یەمەن: بەردێکی بەنرخی سوورە لەیەمەن. لێکچواندنی جەختاو هەیە لەنێوان (لێو و عەقیق)دا.

گەرچی خۆ نەم چێشتووە لەم ساتەوە شەهدی وەفات

هاتم و ڕۆییم لەلاتان وا بەجێماوە دڵم[1]

تا نەچێژم لەزەتی شەهدی ویساڵت بێ خەتەر

زۆر بە دووری تێ دەگەم، نەخلی موورادم بێتە بەر

ئەی سەبا عەرزی بکە پاش شەرحی حاڵم سەر بەسەر

دەربەدەر کردراوە یاخۆ هەر لەلای ماوە دڵم[2]

تەرکی کونجی مەدرەسەم کرد تاکو گەنجم دەستکەوێ

کەوتمە داوی تەلیسمی گەنزی شیرین خوسرەوێ

کەس نییە بێتن بەفەریادم بڵێ چت دەوێ

ساخودا هاوارە هاوارە، کە گیراوە دڵم[3]

گەردەنم کەچکرد لە پێش شمشێری ئەبرۆی پێی گوتم

سەهووی من جەللاد و خوێن ڕێژنیم لەدونیا من بتم

قیبلە و میحرابە (موخلیس) هەردوو ئەبرۆ و ڕوومەتم

وایە نەمزانی کەوا، بۆ سەجدە وەستاوە دڵم[4]

---

(١) **مولاقات**: بەیەك گەیشتن. **موبتەلا**: تووشبووی بەڵا. **شەهد**: هەنگوین.

(٢) **ئەخلی موراد**: بەواتای داری ئومێد دێت. ئەمە چاولێکەری شاعیرانی فارس و کوردی پێش خۆیەتی. **سەبا**: ئەو بایەی کە لە رۆژهەڵاتەوە هەڵدەکات.

(٣) **کونج**: گۆشە، قوژبن. **تەلیسم**: پارچە کاغەزێکە کە فاڵچییەکان خشتە و نووسینی لەسەر دەنووسن کە گوایا بۆ پارێزگاری و چاو و زار باشە.

(٤) لەنێوان (شمشێر و ئەبرۆ)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە. لەنێوان (قیبلە و میحراب) لەگەڵ (ئەبرۆ و ڕوومەت)دا پێچەو بەخشی مشەوەش هەیە، قیبلە بۆ ڕوومەت و میحراب بۆ ئەبرۆ دەگەڕێتەوە.

# کوێرە بەتەمای چاوە[1]

عومرێکە کەوا دەربەدەری جەور و جەفاتم
ئەورۆکە کە جەژنە بەتەمای خێر و خەڵاتم
بۆ رەسمی وەفا، وەقتی وەفات، وەعدەی بدەی دێم
تا زیندوو نەبم، مونتەزیری بۆنی وەفاتم[2]
تاوا بە حەیابی ئەتوو ئەی شۆخی زەمانە
هەرچۆنی حەیاتم ببی مەمنووی حەیاتم[3]
مەعلوومە لەدەست تۆوە شکاوە دڵی ساغم
حیکمەت چییە ناپرسی بەقوربان کە شکاتم
بادەت کە قەپاند و دەری شادیت کەقەپاتکرد
لەو رۆژە بە جان و بەحەواس جوملە قەپاتم[4]
خۆم کردمە بەرخۆم لەغەمی دووری قەبای رەش
بیستوومە دەڵێن پاشملە رەشپۆشی قەباتم[5]
کوێرە بەتەمای چاوە هەتا مابی لەدونیا
تا رۆژی جەزا (موخلیس)م و هەر بەتەماتم

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفووفی مەحزوفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.

(٢) وەفات: مردن. لەنێوان (وەفات و وەفات)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) لەنێوان (حەیاتم و حەیاتم)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیە. یەکەم بەواتای ژیانە و دووەم بەواتای ئابڕووە.

(٤) قەپاند: فڕاند. قەپات کردن: داخستن. لەو رۆژە: کورتکراوەی (لەو رۆژەوە)یە و لەبەر کێش (وە) قرتاوە.

واتا: لەو رۆژەوەی کەبادەی خۆشەویستیت لێ فراندم و دەرگای خۆشیت لێ داخستم بەگیان و هەستم قەپاتم و خۆشیم لێ حەرام بووە هەستی پێ ناکەم.

(٥) قەبا: کەوا، کەوێ. قەبات: کاری ناهەموار، کەوای تۆ.

رەگەزدۆزی تەواو لەنێوان (قەبا و قەبات) هەیە.

ئەم غەزەلە چونکە عوزریە دەشێ لەگەڵ هەردوو رەگەزی نێر و مێ بێ، بەڵام زیتر پێدەچێ بۆ رەگەزی نێر بێ.

**٦- ئامۆژگاری ئایینی:** ئەو جۆرە ئامۆژگاریانەیە کە لەڕووی ئاینەوە ئاراستەی دەوروبەر دەکرێت بەمەبەستی سود لێوەرگرتن.موخلیس ئەم جۆرە ئامۆژگاریانەی زۆرە بەتایبەتی لە دووبەیتی و تاکەکانیدا.

# ئاوی بەقا[1]

| | |
|---|---|
| بێ خەبەر بۆچی وەها بێخەبەری | سەفەری گەرچی بەزاهید حەزەری[2] |
| کۆششێکی بکە تا پێت نەکرێ | پسەری ئەوڕۆ سبەینێ پەدەری[3] |
| سەبەبی پارە نیە موعتەمەدی | تۆ بەتوڕەی بەشەری موعتەبەری[4] |
| نەبی نازت نەبە زێڕ و نەبەزیو | تۆ بەدڵ مەعدەنی زێڕ و زەبەنی[5] |
| مەکە دۆستایەتی دونیا چ نییە | لەگەڵی کەس دەمێ ناباتە سەری[6] |
| تەڵەبی ئاوی بەقا بۆچی دەکەی | تا لە دونیا لەبەحری خەتەری[7] |

(١) لەبەحری ڕەمەلی شەشی مەخبوولی مەحزوفە: فاعلاتن فاعلاتن فعلن.

(٢) لەبەحری ڕەمەلی شەشی مەخبوولی مەحزوفە: فاعلاتن فاعلاتن فعلن.

(٣) حەزەر: ئامادە. حازر: شار. ئاماژە بەم ئایەتە ((کن في الدنيا كانك غريب او عابر السبيل)) فيض القدير، ج ٥،ص٥١.

(٤) موعتەمەد: پشت پێبەستراو. توڕە:مۆر. موعتەبەر: خاوەن پلەوپایە.

واتا: پارەوپول کەس ناکاتە پیاو بەڵکو مۆری مروڤایەتی چاکترین بەردی مەحەکی مروڤایەتیە. ئاماژەیە بۆئەم ئایەتە((ولقد كرمنا بني ادم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات و فظلناهم علي كثير ممن خلقنا تفضيلا)) السراء ٧٠.

(٥) زێڕوزەبەر: وێران.ئەم نیوە بەیتە دەتوانین بەدوو شێوە بخوێنینەوە (تۆ بەدڵ مەعدەنی، زێڕەزەبەنی) یاخود(تۆ بەدڵ مەعدەنی، زێر و زەبەری). واتا: دڵی تۆ کانی زێڕە و تۆسەرکەوتووی. ئاماژەیە بەم ئایەتە ((اعلموا انما الحياة الدنيا لعب ولهو.....))الحديد/٢٠.

(٦) ئاماژەیە بۆ ئەم فەرمودەیە ((ان الدنيا ملعونة ملعون ما فيها الا ذكرالله تعالى وما والاه وعالما أو متعلما)) فيض القدير .ج١،ص٣٢٦.

(٧) ئاماژەیە بۆئەم ئایەتە ((انك ميت و انهم ميتون)) الزمر /٣٠.

چ خزربی،چ سکەندەر بی دەبی        بگری ئاخری ڕێی دەربەدەری[1]
هەرچی نوسراوبی ئەزەل وادەکرێ        نیه تەدبیر بەتەنیا ئەسەری[2]
کەقەزا ساحێبی تەدبیری نەبوو        بە هەبا ڕۆیی سکەندەر سەفەری[3]
موخلیسا گەرچی گەدا هەیئەتی لێك        لە دڵا خاوەنی دووڕ و گەوهەری[4]

---

(١) سکەندەر: لە ووشەی (الکساندەر) ی ئەورووپیەوە وەرگیراوە،کوڕی فلیپ و پاشای (مقدونیە) بووە. بە چل هەزار سەرباز هێرشی هێنایە سەر ئێران ولە ٣٣١ پ.ع بەسەر داریوشدا سەرکەوت،لەگەڵ (خدر) بۆ ئاوی ژیان چوە،کەچی نەگەیشتوەتێ. المنجد، ط ٢٢، ص٤٢

(٢) ئەزەل: دێرین، ئەزەل و ئەزەلیەت بۆ خودایە، جگە لەخوا هیچ شتێ ناوی لێنانرێ ئەزەل، خودا دێرینە و هەمیشەیە، ئەزەلیەت سیفەتی خوایە. معجم مصطاحات الصوفیة، ص١٥.
لێرەدا موخلیس لەگەڵ ڕای جەبریەکانە و هەمووی بۆخودا دەگەڕێنێتەوە،ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ((وما تشاؤون الا ان یشاء الله ان الله کان علیما حکیماً)) الدهر/٣٠ .

(٣) هەبا: (هبا): تەپوتۆز. بەهەباڕۆیی: بەفیڕۆ چوو.
واتا: قەزا خۆی چی لەدەست نیە هەرچی هەیە پێی دەکەی، بۆیە هەموو کاروکردەوەیەکی مرۆڤ کۆتایی پێدێت،هەروەکو ئەسکەندەر کە ئەوهەموو وڵاتانەی گرت و سەری نایەوە.

(٤) گەداهەیئەت: سواڵکەر ئاسا. لیك: کورتەی (لکن)ی عەرەبیە. گوهەر:گەوهەر.
لێرەدا شاعر وەك شاعیرە کلاسیکیەکانی دیکە بەشیعری خۆی دەنازێ و بەدووڕو گەوهەردی دەچوێنێ.

## شیعری دڵداری

# ڕێی غەنە نادا [1]

دولبەر کە سەبا زوڵفی لەسەر ڕومەتی لادا
بنواڕە مەلەك وا لە سەمادان لە سەمادا[2]

پارێزی کەساند دڵ کە بگا دەستی بەمەقسود
بۆ کوشتنی تیر باری بەجارێ لە پەنـاد[3]

چاوم کە سپی ماوە لە دووریت وەکو یووسف
جامەت چ دەبێ جارێ ڕەوان کەی بە سەبادا[4]

دیتی کە سەرم خستە بەری پێی بەتەمای ڕووی
لەم ڕێگەیەدا لایداو گەڵی کرد، سەری بادا

---

(١) ئەم شعرە لە بەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفوفی مەحزووفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.

(٢) لەنێوان (سەماو سەما)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) پارێزساندن: هەڵوەرگرتن، بەهەڵزانینی کات. ساند: کورتکراوەی (ستاند)ە. پەنا: حەشارگە.

(٤) چاوسپی بوون: کوێربوون. جامە: جلوبەرگ. لێرەدا مبەست کراسە. تەلمیحە بۆ چیرۆکی یوسف و برایەکانی. ئاماژەیە بۆ ئایەتی ((وابیضت عیناه من الحزن فهو کظیم)) یوسف/٨٤.

واتا: هێندە چاوەنۆڕیم کردی و نەهاتی،لەداخاندا کوێربووم وەك یەعقوبم لێهات،جا چ دەبێ لەکەر وەکو یوسف کراسەکەتم بۆ بنێری تا چاوم چاك بێتەوە .نیوە بەیتی دووەم ئاماژەیە بەم ئایەتە ((اذهبوا بقمیصي هذا وألقوه علي وجه ابي یأتي بصیرا وأتوني بأهلكم اجمعین)) یوسف/٨٤.

**من ڕەندی ئەگەم زاهیدی خودبین چیە تانت**

**چەند بەستەزمانی ئەتۆ خۆت کوشت لەڕیادا[1]**

**هەرچەندە کە موخلیس بە نەزاکەت ئەدوێنن**

**ئەو ڕافز بابە ئەبەدا ڕێی غەنە نادا[2]**

---

(١) خودبین: خۆپەرست. تان: پلار، سەرزەنشت.

(٢) رافزی: ئەوانەی کە ئیمامی عەلییان زۆرخۆشدەوێ و دەڵێن: پەیامی پێغەمبەریەتی بۆ عەلی هات و جبرئیل خیانەتی کرد و دایە محمد (ص).

رمضان افندي علي شرح العقائد،ص١٤

غەنە (غەنە): وشەیە کە لەیاری تۆپی پێ و قاشوانێ بەکاردێ، ئەوکاتەی کە یاریکەر یاری بەتۆپ یان بە قاشۆیەکە دەکاوناهێڵێ کەس لێی بستێنێ و پێچ وپەنای پێدەکات.

واتا: هەرچەندە کە موخلیس یار دەدوێنێ و چاوەڕوخەی بۆ دەداتەوە،کەچی ئەو یارە رافزی بابە هێندە ووشکە هیچ قسەیێ کاری لێناکات و ناخرچێ.

# کۆخە کۆخ[1]

**کەی دەگا دەستم بەباڵای بەرزی یاری شەنگ وشۆخ**
**دەفعەیێ لەو باغە نەمدیوە هەنار و سێو خــــۆخ[2]**
**هەرکەسێکی بوبە عاشــــق یاری دڵ نەرمی نەبی**
**عومری گەنجی و عومری پیری هەردەبێتە ئاخ و ئۆخ**
**دەستی خۆم دانا لەسەر ڕووم، لێوی خۆم جوڵاندەوە**
**زاڵمەی سوو هەڵگەڕا ئەبرۆی بزاوتن یانی یــــۆخ[3]**
**بەزمە ئەوشۆ وامەکە زایەع ببیتن هاتنم**
**ڕووحەکەم بۆتۆبێ بەس مەنعم مەکە بتێیمە ڕۆح[4]**
**(موخلیسا) دانیشە تازە تۆ دزیت پێ ناکرێ**
**باغەوان دانیم بەهۆش، تۆش پیر و ساحێب کۆخە کۆخ[5]**

---

(١) **لەبەحری رەمەلی هەشتی مەقسورە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) **شەلگ و شۆخ:** خۆی (شۆخ و شەنگە) بەڵام سەروا ناچاری کردوە.
لەنێوان (شۆخ و خۆخ) دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.باغ:لێرەدا سینەیە.
هەناروسێوخۆخ: ئاماژەن بە مەمکەکان.

(٣) **یۆخ:** ووشەیەکی تورکیە بەواتای (نا)دێت. ئەم بەیتە ئاماژەیە بەنیوە بەیتێکی (نالی) کە دەڵێ ((برۆی هێنایە یەك وەك شکلی (لا) یەعنی کە بێزارم)) دیوانی نالی، ل٢٧١.

(٤) **بتێیمەڕۆخ:** بێمەڕۆخت. لێرەدا جۆرە لادانێکی زمانی هەیە لەبەر سەروا (ت)ی ڕۆخت بە (بێمە)وە لکاوە و بووەتە (بتێیمە).

(٥) ئەم بەیتە ئاماژە بەپیربوونی شاعیر دەکات، بەڵام خۆشاعیر لەدواتەمەنی سۆڵ بووەودوور نیە لەبەر سەروا (کۆخەکۆخ)ی پیری بەکارهێنابێ.
**واتا:** موخلیس ئەو باخە کە سینگی یارە ئێشکچیەکی چاپووکی هەیە و خەوی لێناکەوێ، بۆیە دزیت پێ ناکرێ و سێوو هەنارت بەنسیب نابێت، خۆ لەگەر بشگەیتە ناو باخەکە ئەوا لەبەر کۆخەت باغەوان بە ئاگا دێ و قاوت دەدات.

# داش بە داش[1]

یار کە تازە پێگەیشتووە چی هەبێ نایدا بەلاش

هێندە ڕەقە هیچی لەدەست هەڵناوەرێ حەتتا بەڵاش[2]

بێ بەها چووم بۆ قەڵای لوتفی لەبەر ڕەشبوونی دڵ

پێی ووتم کێ وادەکا؟ سەرفی قەڵاکا بۆقەلاش[3]

گەنمی وەسڵی ڕووت بەسە،جۆی فیراق تێکەڵ مەکە

پێی ووتم: بێتاقەتی وا ڕیشەکەت بویتە مزاش[4]

من بەتەنیا غەم دەخۆم،غەم گۆشت و خوێنی من دەخوا

بۆی یەك یەك دەندەکانم،بوینە شەقڵەی بێ هەراش[5]

---

(١) **لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسورە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

(٢) **بەلاش:** خۆڕایی.لەنێوان (بەلاش و بەڵاش )دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٣) **قەڵا:** مادەیەکە بۆ سپیکردنەوەی قاپ و قاچاغی مس بەکاردەهێنرێ.

**قەلاش:** نەبووە،موفلیس.

**واتا:** چومە لای یارم تاهەندێ قەڵام بەخۆڕایی بداتێ بۆتەوەی دڵی ڕەشمی پێ سپی بکەمەوە،بەڵام یار ووتی چۆن قەڵا دەدەمە پیاوی قەڵاش؟

(٤) لەنێوان (وەسڵ و فیراق)دا دژیەك هەیە. **مزاش:** دووبەشە: **مز:** نرخ. **اش:** کورتکراوەی ئاشە. **مزاش:** مزی ئاش، ئەو گەنم وجۆیەی کە ئاشەوان لەخاوەنی باراشەکەی وەردەگرێ.

**واتا:** موخلیس بەیەکگەیشتنی یاری بەگەنم چواندووە کەزەردەوڕووناکی ئاسۆی لێوە دیارە، دوورکەوتنەوەشی بە جۆ چواندوە کە ڕەشە و نائومێدی دەگەیەنێ.

(٥) **دەندە:** پەراسوو. **شەقڵە:** دارێکی ئەستوور نیەو وەکو دەسکە خاکەناسە دەیکەنە ڕایەڵی خانوو. **هەراش:** ئەو زەل و قامیش و قرش و قاڵەیە کە دەیخەنە سەر شەقڵە و فوڕی سواقی دەخرێتە بان. شاعیر لەبەر خەم زۆری لاواز بووە و دەندەکانی وەکو شەقڵەی بێهەراشن. لەم وێنە شیعریەدا موخلیس دەستڕەنگینی نواندووە.

دڵ لەسەر داردامەیی عیشقت لەوەسڵی ئەو سوار
نۆینی لۆ نایێ کەچی ناشکا لەگەڵما داش بە داش[1]
تێکچوە مێشکی سەرم،ئالەتی تەفکیرم نەما
هیچ خەیاڵی ووردی لێ نایێتەخوار وەك کۆنە ئاش[2]
وەك ڕەقیب زانی کە یار دەیوێ لەگەڵ یەك کۆببین
ئالەتی تەفکیروگێزبی خستە کار هەروەك ڕەشاش
دڵ ووڵاغی ئیشتیاقی توند بوە گەرمەی دەکا
سەر ڕەقەی هەرچەند دەکەم،دەرواتە پێش،نایێتە پاش[3]
ئەمتیعەی شیعری هەیە(موخلیس)لەسەر تەرزێکی کۆن
ئەمڕۆ تامۆدە هەبێ،کەس نایکڕێ کۆنە قوماش[4]
بەختی زاغ[5]
دەردی عیشقم نابێ سەر ڕێژ هەردەمە ئەمکا ئەساغ
دارمەیتێ هەڵببەستن بمبەنە لای ڕوو چراغ[6]
ئەی ڕەفیقان بێنە لاما [ن][7] شیعروبەستەم بۆ بلێن
بانگ کەنە دیدە غەزالان بمگرن دەوروقـــــەراغ

---

(١) **لۆین**: یاری وورد. **داش بە داش**: بەرد بە بەرد لەیاری دامەدا.
**واتا**: دڵم لەسەر داردامەیی عەشقی تۆ سوارە و دەیەوێ ئاغە بکات،واتا پێت بگات و بگاتە جێی مەبەست.کەچی هەموو یاریەکی لەبیرچووەوهیچی بۆنایێ، یاریش هێندە ڕەقەولاملە بەرد بە بەردیشم لەگەڵ ناکات، **واتا**: یارەکەم بواری گفتوگۆم نادات تا بەقسەی خۆش لەخشتەی ببەم و ماڵی بکەم.
(٢) **واتا**: چۆن کۆنەئاش ئاردەکەی درشتە مێشکیشم ئاوا تێکچوە بیری ووردی لێ نایێتە دەرەوە.
(٣) **واتا**: چۆن ووڵاغ کە لەغاردان گەرمەیدەکا و بەردەوام دەبێ، چەندی جڵەوی ڕاکێشیەوە هەرچەپۆك بۆ پێشەوە داوێ و ناگەڕێتەوە،دڵیشی ئاوای لێهاتووە،سەری هەڵگرتووەوناگەڕێتەوە.
(٤) **ئەمتیعە**:کۆی مەتاعە بە واتا:کاڵاکان ،کەلوپەلەکان.
**مۆدە**: نوێ،تازە،لەئەسڵدا لە ووشەی (alamode) فەرەنسیەوە هاتوە.
(٥) **لەبەحری ڕەمەلی مەشقی مەقسورە**: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
(٦) **دارمەیت**: دارەبازە. **ڕووچراغ**: ڕووی وەکوچرا
(٧) لەدەستنوسی شاعیر (لاما) بوو. لەوە دەچێ نونەکە لەبیر کرابێ.

شین لە دەورم دابیەستن بۆ بگرییەن دەن لەخۆ

دڵبەرم جارجار بڵێ ئۆف لاوەکەی دڵ پڕلەداغ[1]

گەرچی واکوشتمی بەناحەق گەربدا وەعدی ویساڵ

نامەوێ غیلمان و حۆری بۆ چمە گوڵزار و باغ[2]

قەبرەکەم سەر ڕێ بێ مەئوای بابڵند[بێ] [3] بەڵکو یار

بێ بەلامانا گوزەر کاو بای وەتەن پڕکا دەمـــاغ[4]

من لەمەیدانی (الست)دا خۆم بەمەحرومی دەدیت

هەرکەدیم یاری جەفاکار،چەرخی گەردوون،بەختی زاغ[5]

(موخلیس)ی دڵ پڕ لەغەم چ بکا لەدەست دەردوغەم

دەردی عیشقم نابێ سەر ڕێژ هەردەمە ئەمکا نەساغ[6]

---

(١) **دەن لەخۆ**: لەخۆدەن،کورتکراوەی (لەخۆبدەن)ە و لادانێکی زمانی شاعیرە.

(٢) **غیلمان**:کۆی غولامە و نێرە کە لەبەهەشتدا خزمەتی بەهەشتیان دەکەن.

(٣) لەدەستنوسی شاعیر(بڵند)ەو وا دیارە (بێ) لەبیر کراوە.

(٤)**گوزەرکا**: تێپەڕێ، ئەم بەیتە ئاماژەیە بەم بەیتەی (وەلی دێوانە):

**باگڵکۆم تەنیا جەڕای خێڵان بێ — نزیك هەوارگەی سەر ڕەوێڵان بێ**

**بەڵکم لەو قیبلەم جەڕا گوزاریێ — ڕاش گنۆوە سەر گڵکۆی من جاریێ**

ژیان و بەسەر هات وهۆنراوەی وەلی دێوانە، عوسمان هەورمی، ل ٩٠.

(٥) (الست) ئاماژەیە بە ئایەتی ((الست بربکم قالو بلي)) الأعراف/١٧٢.

**بەختی زاغ**: بەختی ڕەش. **زاغ**: باڵندەیەکە لەقەڵەڕەشکە بچوکترە، قەڵە ڕەشکە.

**واتا**: هەرکە یاری بەلازار و چەرخی چەپگەرد و بەختی ڕەشی خۆم لەدنیا دیت، زانیم کە لەڕۆژی ئەزەلدا ئەمەم بۆ نوسراوە.

(٦) لێرەدا موخلیس نیوە بەیتی سەرەتای غەزەلەکەی دووبارە کردوەتەوە شاعیر لەجیاتی (سارێژ) ووشەی (سەر ڕێژ)ی بەکارهێناوە و ئەمەش جۆرە دەستکاریەکی زمانیەوگەر (سارێژ)یش بایە کێشی نیوە بەیتەکە تێك نەدەچوو.

# چوارینە[1]

**شەو لەبەر فیکر و خەیاڵی زولفی خاو،خاوە دڵم**
**ڕۆژ بەیادی رووی بەرەو ڕۆژ،مات و داماوە دڵم**
**وا لەدەست دەردی جودایی هەربەناو ماوە دڵم**
**گەر خودا چارم نەکا،مەعلومە فەوتاوە دڵـــم[2]**

**کاسی کەئسی چاوی چاو بێچوە غەزالی خوتەنـــم**
**سەربەسەر سەر پڕلەنەسرینی هەوای نەوسیم تەنم**
**چونکە بیماری (خەدەنگی)[3] لێو عەقیقی یەمەنــم**
**فـەرموو بنواڕەهەناوم،پڕ لەخوێناوە دڵـــــــــم[4]**

**هێندە مەشهوور بوو لەدونیا حوسن و ئاداب و حەیات**
**بێ مولاقات و دواندن سەربەخۆم بووم موبتــــــەلات**

---

(١) **لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن. ئەم کۆمەڵە** چوارینەیە کەوتوەتە ژێر کاریگەر چوارینەکانی (بێخود)، **هەردوو کۆمەڵە چوارینەکان تام** و بۆی نامۆییان لێدێت و موخلیس خۆشی دانی بەوە داناوە کە **کاریگەری بێخودی** لەسەرە،بەڵام لە ڕووی کێشەوە لەوەی موخلیس جودایە و لەبەحری **هەزەجی هەشتی** نەخرەبی مەکفوفی مەحزووفە.

(٢) **خاو**: زولفی نەهۆنراوە، سمت. لەنێوان (خاووخاو)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە. شاعیر کە (ڕووی بەرەو ڕۆژ)ی بەکارهێناوە لەبەرئەوەیە چونکە تیشك دەداتەوەو جوانییەکی دڵگیر دەبەخشێ.

(٣) لەدەستنوسی شاعیر (غەدەنگ)بوو. **خەدەنگ**: تیر.
**عەقیقی یەمەن**: بەردێکی بەنرخی سوورە لەیەمەن. لێکچواندنی جەختاو هەیە لەنێوان (لێو و عەقیق)دا.

(٤) لەنێوان (کاس و کەئس) دا ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیە. لەنیوەی بەیتی یەکەمدا هەست بەمۆسیقاو ریتمێکی جوان دەکرێت، بەتایبەتی لەنێوان(کاس و کەئس) لەلایەك و (چاوی چاوبێچوە)دا لەلایەکی دیکەوە، هەروەها لەنیوە بەیتی دووەمدا دەنگی (س) پێنج جار دووبارە بوکەوەو مۆسیقایەکی جوانی هەیە و جگە لە ڕەگەزدۆزی تەواو لەنێوان (سەربەسەر سەر).

گەرچی خۆ نەم چێشتوە لەم ساتەوە شەهدی وەفات

هاتم و ڕۆیم لەلاتانەوا بەجێماوە دڵـــــــــم[1]

تا نەچێژم لەزەتی شەهدی ویساڵت بێ خەتـــــــەر

زۆر بەدووری تێدەگەم ئەخلی موورادم بێتە بــــــەر

ئەی سەبا عەرزی بکە پاش شەرحی حاڵم سەر بەسەر

دەربەدەر کردراوە یاخۆ هەر لەلای ماوە دڵـــــــم[2]

تەرکی کونجی مەدرەسەم کرد تاکو گەنجم دەستکەوێ

کەوتمە داوی تەلیسمی گەنزی شیرین خوســــــرەوێ

کەس نیـە بێتن بە فریـادم بڵێتن چت دەوێ

سا خـودا هاوارە هاوارە کەگیراوە دڵـم[3]

گەردەنم کەچکرد لەپێش شمشێری ئەبرۆی پێی گوتم

سـەهووی من جەللاد و خوێن ڕێژنیم لەدونیا من بتـم

قیبلـەومیحرابە (موخلیس) هەردوو ئەبرۆوڕومەتم

وایـە نەمزانی کەوابۆ سەجدە وەستاوە دڵـــم[4]

---

(١) مولاقات: بەیەکگەیشتن. موبتەلا: تووشبوی بەڵا. شەهد: هەنگوین.

(٢) ئەخلی موراد: بەواتای داری ئەومێدی دێت. ئەمە چاولێکەری شاعیرانی فارس و کوردی پێش خۆیەتی. سەبا: ئەو بایەی کە لەڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکات.

(٣) کونج: گۆشە، قوژبن. تەلیسم: پارچەکاغەزێکە کە فاڵچیەکان خشتەونوسیێ لەسەر دەنوسن کە گوایە بۆ پارێزگاریکردنی چاووزاری باشە.

(٤) لەنێوان (شمشێرو ئەبرۆ) دا لێکچواندنی جەختاو هەیە. لەنێوان (قیبلە و میحراب) لەگەڵ (ئەبرۆ و ڕوومەت)دا پێچەوبەخشی مشەوەش هەیە، قیبلە بۆ ڕوومەت و میحراب بۆ ئەبرۆ دەگەڕێتەوە.

# کوێرەبەتەمای چاوە[1]

عومرێکەکەوا دەربەدەری جەورو جەفاتـم
ئەورۆکە کەجەژنە بەتەمای خێرو و خەلاتم

بۆڕەسمی وەفا، وەقتی وەفات، وەعدەی بدەی دێم
تازیندوو نەبم، مونتەزیری بۆنی وەفاتـــــم[2]

تاوا بە حەیابی ئەتوو ئەی شۆخی زەمان
هەر چۆنی حەیاتم ببی مەمنونی حەیاتم[3]

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفوفی مەحزووفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.
(٢) وەفات: مردن. لەنێوان (وەفات و وەفات)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٣) لەنێوان (حەیاتم و حەیاتم ) دا ڕەگەدۆزی تەواو هەیە. یەکەم بە واتای ژیان و دووەم بە واتای ئابڕووە.

# سوخمەی ترازاندم[1]

بەسیحری چاوی سەححاری، هەڵستا عەقڵی لێستاندم
بە پشکۆی ڕوومەتی سۆری، سەراسەر جەرگی برژاندم[2]
لە مەیدان هات و چوو دەستی لەسەر تیر و کەوان دانا
بە ناحەق هەروەکو دوژمن، لە گۆلی خوێنی گەوزاندم[3]
کە هەوری دیدە بارانی، نەباران تا کو زستان چوو
ئەمن زانیم کەوا ئەوساڵ، بەخۆڕاچوو ئەوی چاندم[4]

دەمی وەك غونچەیی تەنگی، نەپشکوت و دەفعەیێ ئەسڵا
لەدەورەی باغەکەی چەندی، وەکو بولبول چریکاندم[5]
کە داوای ڕۆحی لێکردم، منیش ماچم تەمەننا کرد
کە زاناندم دڵی دەشکێ، دڵم نەشکاند و سەلماندم[6]
کە ئەمری کرد دەبێ (موخلیس)لەسەر بدرێ، ووتم: بۆچی؟
گوتی: ئەم شۆ لەخەوما دیت، کە هات سوخمەی ترازاندم

---

(١) لە بەحری هەزەجی هەشق تەواوە: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن.
(٢) سەححار: لە ووشەی (سحر)ەوە هاتووە و سیغەی موبالەغەیە، واتا: زۆر جادووگەر.
(٣) گۆل: کە زەوی ئامادە دەکرێ بۆ شینایی، پارچە زەویەکە دابەشی خانەی بچوك دەکەن بۆ ئەوەی خانەکان ئاویان لێبوەستێ،ئەو خانانە گۆلی پێدەوترێ.
(٤) واتا: کە چاوەکانم نەگریان و نەشکیان نەڕشت، زانیم کەوا هەموو هەڵ و تەقەلایەکم بە فیڕۆ چوو، چونکە پیشەی عاشق ئەوەیە کە لەگریان بێ.
(٥) ئەسڵا: ئەوەی ڕاستی بێ. لێکچواندنی بەرەڵا لەنێوان(دەم و دەم)ی غونچەدا هەیە.
(٦) زاناندم: لەتێپەڕەوە کراوە بە کۆزەتیف بۆ پیشاندانی هۆی ڕوودانی کارەکە، واتە کە بەبیرکردنەوە زانیم. موخلیس لەم غەزەلەدا پەردەی لەسەر هەندێ ووشەی تا بۆ هەڵداوەتەوە نالی ئاسا ناوی ماچ و سوخمە ترازاندنی هێناوە، شاعیر ئامادەیە گیانی خۆی بەتاکە ماچێکی یارەکەی بدات.

# بەحری غەزەل[1]

چ بکەم لە غەمی فیرقەتی ئەو دولبەرە یـاران
شەیدای جەمالی ئەوە سەد یوسفی کەنعـــان[2]

شاهێکی بە عینوانە لەسەر تەختی سولەیمان[3]
دڵدارەوەفادارە ، لەبۆ عاشقی بێ جـــــان[4]

سەد حەیفە کەوا فەسڵی بەهارە لەهەموو لا
گوڵـــزار و چەمەن پڕلەگوڵ و سونبول و لالا[5]

وا پێدەکەنی غونچە و بولبول بوە شەیـــــدا
ئەمما لەمنی خانەخرا شیوەن و گریــــــان[6]

لەو جەژنە کەوا جەژنەیی قوربانە بەقوربـــــان[7]
موشتاقی تەواف مەمتم لێم مەکە پەنهـــــــان[8]

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفوف مەقسوورە: مفعولن مفاعیلن مفاعیل فعولان.

(٢) کەنعان: ناوچەیەکە لە ئاسیای ڕۆژئاوا (فەلەستین و فینیقیە)،کەنعانیەکان لەوێ نیشتەجێبوون و بە بازرگانی و پیشەسازی خەریك بوون، لەتەوراتدا بەم ناوچەیە دەوترێ (أرض الميعاد). المنجد ص ٥٩٥.

(٣) بە عینوانە: بەرێ و جێیە. تەختی سولەیمان: تەختی حەزرەتی سولەیمانە کە پێغەمبەری خوا بووە، زمانی باڵندەکانی دەزانی جنۆکە و با لەژێر دەسەڵاتی ئەوبوون. قصص الأنبياء، أبوالفداو اسماعيل بن كثير، ص ٤٩٨.

(٤) بێ جان: بێ گیان، واتا: یار بۆ ئەو کەسە وەفادارە کە گیانی لەرێی ئەودا بەخت کردوە.

(٥) سونبول: جۆرە گوڵێکە،گوڵەگەنم. لالا: گوڵاڵە،لالە.

(٦) خانەخرا: کورتکراوەی (خانەخراپ)ە، واتا:ماڵوێران.

(٧) لەنێوان (قوربان و قوربان)دا ڕەگەزدۆزی هەیە.

(٨) تەواف: لەدەورە سوڕان.ئاماژەی بەو سوڕانەی کە موسڵمانەکان لەکاتی حەج و عەمرەدا لەدەوری کەعبەدا ئەنجامی دەدەن.شاعیر مەمکی یارەکەی لەقیق وپیرۆزیدا بەکەعبە چواندوە.

ئەو زولفەت کەوەك دوکەڵە بۆم لابە ئەی جان[1]

ئەك بێم و بسوتێم وەکو پەروانە لەداغـــــــان

سەیادی غەزالی خەتەنی[*] چینی ئەمن بووم[2]

ئێستـــاکە لەنێو داوی غەزالێکەوە کەوتـووم

سەدمـــوژدە لەنێوە کە لەڕێی عەشقەوە واچوم

تەبلیغی سەلام واجبە بیـــــکەن گەلی یـــاران

بەو سیحر و دوو دیدەت دڵ ودینت بەهەوادا

بەوعیشوەیە خۆ لەزەتی عومرت بەفەنـــادا[3]

خستومتە نێو بەحری غەم و جەورو جەفـادا[4]

بەدبەختی هەتاکەی درۆ و ئیفکی ڕەقیبـــان(٥)

غەواسە لەنێو بەحری غەزەل (واقی)ی وەفادارە[6]

ئەمما لەغەم ودەردی عیشق پڕبووە زینهـــــار[7]

یـــــەك زەرە ئەماوە هەوەس و مەیلی لە ئەشعار

ئەمەـــــا ئەمەیە توحفەیە بۆ کەیفی ڕەقیبان[8]

---

(١) واتا: زولفی لە درێژی زۆری و بەیەکا چوندا وەکو دوکەڵ وایە.

(*) (خوتەن) ڕاستترە.

(٢) سەیاد: ڕاوچی. خەتەن (خوتەن): ناوی کوتی تورکستانی ڕۆژهەڵاتی چینە و بە ئاسکی میسك بەناوبانگە.

(٣) عیشوە: ناز. فەنا: لەناوچون.

(٤) لەدەستنوسی شاعیرو (أ.ر) نوسراوە (خستومەتە)، بەڵام بەگوێرەی واتا هەڵەی نوسینە و دەبێ (خستومتە) بێت، چونکە دولبەر لێرەدا بکەرە نەك شاعیر.

جەفا: دەرد، ناخۆشی.

(٥) ئیفك: بوختان. ئاماژەیە بۆ هەڵبەستەی کەبەحەزرەتی عائیشەیان داکرد،کەچی وەحی بەدرۆی خستەوە ((ان الذین جاؤوا بالأفك عصبة منكم لاتحسبوه شراً لكم بل هو خیر لكم لكل امرئ منهم ما اكتسب من الأثم))النور/١١.

(٦) غەزەل شیعرێکی دڵداری یان خوایيە و لەپێنج بەیت تاکو نۆزدە بەیتە. هەرچەندە جیاوازی لەم بارەیەوە زۆرە.

(٧) زینهار: بەڵێن، پەنابردن.

(٨) واتا: هەرچەندە شاعیر هەوەسی لە شیعر هۆنینەوە نەماوە، بەڵام ئەمەی کەداناو بوتەوەی بێتە توحفەیەکی بەنرخ بۆ هەوەسی برادەرانی خۆی.

# بەهاوارت [1]

لەباغاندا چ قەوماوە لەنەغمەی بولبولان دیسان
لەمەیخانان چ رویداوە لەبەزمی ساقییان دیسان
ئەوا دەستی لەنێو دەستی نیگاری خۆیەتی هەرکەس[2]
منی بێکەس نەبێ دەستم خراوە دەست غەمان دیسان[3]
چ هاوارێك و رۆرۆیە لەباغی سێو و خۆخانی[4]
مەگەر نالەی دێتن لەدەستی باغەوان دیسان
خەریك بووم زولفەکەی لادەم،کەچی هێشکچی دەنگی هات
کەوریا[5]بن ئەوەك دزبێ لەبۆ لای سۆرگوڵان دیســـان
لەنێو شاری ئەوا باسی قڕانی عاشقان ئەکرێ
خودا سابێ دەبا ئیمڕۆ قڕانی عاشقان دیسان[6]
بەسەربەستی دوێنێ هات بەچاوی مەستی ئەمنی کوشت
تەمایتی بمکوژێ ئەورۆ بەتیر وخەنجەران دیســــــان
وەفادرێ نەبوو بێتن بەهاوارت ئەرێ (موخلیس)
ئەوا دووبارە هاوارە لەجەوری دولبەران دیســان

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی موسەببەغە: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان.
(٢) نیگار: وێنە، لێرە مەبەستی وێنە.
(٣) خراوە: کورتکراوەی (خراوەتە)یەو لەبەر کێشەکەی (تە) قرتاوە.
(٤) مەبەستی لە(باغ)سینگی یارە و (سێو و خۆخ) مەمکەکانیەتی.
(٥) لەدەستنوسی شاعیر(دەوریابن)ە، لە خ.د (وریابن)ە.
(٦) قڕان: جۆرە پارەیەکە، لێرەدا مەبەستی لەناوبردنە.بۆیەکەم جارە موخلیس ووشەی (ئیمڕۆ)بەکاردێنێ و هەر (ئەورۆ)ی بەکارهێناوە کە شێوەزاری هەولێرە.
لەبەیتی دووەم هەست بەمۆسیقایەکی سوار دەکرێ و ووشەی (دەست)چوارجار دووبارە بۆتەوە و دەنگی (س) حەفت جار هاتووە.بەگشتی لەهەندێ بەیتەکاندا سەروای ناوەوە بەدی دەکرێ و ئەم جۆرە سەروایەش مۆسیقا بەخشی بەیتەکانە.

# قوببەیی سینە[1]

قوبیەتی سینەی نیشاندام‌پێی گوتم ئەی راغیبین[2]

(ذلك قصر بنـــاه ربنـــا للعاشقيـــــــــــن)

چومە ژێرتاق و سەرا پەردەی نیشارەی کرد گوتی:

(لاســـــبيل للدخـــول هنا للسائليـــــــن)[3]

پێم وت،ئەبرۆت دڵڕفێنە، پێکەنی فەرمووی ئەتوو

(لا تلمنـــي ان هــذا نقــش رب العاليـــــــن)

بۆچ بەهەوری زولفەکەت خورشیدی ڕووت پۆشی؟ ووتی[4]

(ما فعلـــت ذاك الا عبـــرة للناظـــــــرين)

موددەێکە وادەسوتێم خۆ عەزابیش چاوەکەم

(لايـــزاد بل علي مقدار ذنب المجرميــــــن)

(وعده دادی بمن ورفتی چو اهو به چمـــن)[5]

(ليتني كنت تراباً ما رايت الواعديـــن)[6]

(واڤی)[7] تاماوە ئومێدی شەهدی وەسڵی هەرهەیە

(فاتـــل لله الرقيـــب انه مـــن مانعيـــــــن)

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەقسوورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.
لێرەدا شاعیر وەکو شاعیرانی کلاسیکی کورد بە عەرەبی و کوردی و فارسی ئەم ڕەنگاوڕەنگەی (ملمع) هۆنیتەوە،ئەمەش توانای موخلیس دەردەخا لەو سێ زمانە.

(٢) قوبیەتی سینە: مەبەستی مەمکەکانیەتی کە وەکو گومبەت هەڵیداوە.
واتا: ئەم گومبەتی سینگە خودا بۆ عاشقانی بنیات ناوە تاوەکو لەسایەی ئارامبگرن و بحەسێنەوە.

(٣) واتا: سواڵکەران (کەمەبەستی دڵدارەکانە) ناتوانن بێنە ناو لەو تەلارەوە.

(٤) هەوری زولفەکەت: جگە لەواتای (هەور) بەواتای (مشکی)یش دێت،چونکە ڕەشە وەکو هەور.

(٥) ئەم نیوە بەیتە فارسیە واتا: بەڵێنت پێدام خۆشت وەکو ئاسك چووی بەناو گوڵزارەوە.

(٦) واتا: بریا بامایە خوڵ و بمردبام، بەڵێنی لەم پارانەم نەدیبایە.

(٧) واڤی: نازناوی شاعیر بووە لەسەرەتادا و پاشان بوە بە موخلیس.

# فەرهاد و شیرین[1]

ئارەزووی تەوبە دەکا دڵ بۆیە غەمگینم ئەمن
چۆن دەبێتن تەرکی عیشق و تەوبە نەشکێنم ئەمن[2]

نەونەمام فەسڵی بەهار و جەژنی قوربان هاتەوە
مەوسیمی سەیر و تەوافە بۆچی نەتبینم ئەمن[3]

ساقی سادە بێنە بادە دەم بەخەندە ڕووکە من
موبتەلای لێوی پیاڵەی ساف و ڕەنگینم ئەمن[4]

سینەکەم پڕ ئاگری عیشقە وەکو مورغی سەحەر
گەر غەزەل خوانی بکەم دونیا دەسوتێنم ئەمن[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) واتا: من کەخەمبارم چونکە دڵەکەم دەیەوێ تۆبە بکا،چۆن دەبێ وازلەعەشق بهێنم و تۆبەکەم نەشکێنم. ئەم غەزەلە لەنێوان دڵداری ئاسایی و نائاسایی دایە.

(٣) مەوسیم: کات. سەیروتەواف: گەڕان و سوڕان لەسەفاومەڕوە و دەوری کەعبەدا، چونکە ئاماژەی بەجەژنی قوربان کردووە کە کاتی حەجە، بەڵام شاعیر مەبەستی حەجی ئاسایی نیە.

(٤) ساقی سادە: ئەو مەیگێڕەیە کەکوڕێکی جوانکیلەیە و مووی لێنەهاتوە.

لەنێوان (سادە و بادە) دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە. مۆسیقای ناوەوەی ئەم بەیتە جۆش و خرۆشێکی پێدراوە بەتایبەتی سەروای ناوەوەی نیوەی بەیتی یەکەم.

(٥) مورغی سەحەر: بولبول، شالوور. غەزەل خوانی: گۆرانی گوتن.

ئەم بەیەتەی باباتاهیر بووەتە بنەمای ئەم بەیتەی مرخلیس:

موسەویر گەرکەشەد نەقشم بە دیوار    بسوزەم عالەم ئەز تەئسیری ئیمسال

رباعیات شورانگیز باباطاهر، ص٤٦

**من بریندار نیم بە شیر و تیری کەس خوا شاهیدە**

**سەیدی پەنجەی دیدە باز و چەنگی شاهینم ئەمن[1]**

**وا لەگز کووهی فیراقا داچووە(موخلیس) بەدڵ[2]**

**ئەهلی دڵ تاتێبگەن فەرهادی شیرینم ئەمـــن**

---

(١) لەنێوان (دیدە و باز)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە. شاهێن: باڵندەیەکی بۆری گۆشتخۆرە و لەبازگەورەترە.

(٢) لەگز: لە ڕووی ڕێزمانیەوە(بەگز) بێ ڕاسترە. کووه:کێو. ئەهلی دڵ: ئەوانەی کە دڵیان بەنوور ڕووناك بوکەوە و بەهەر دەربڕینێ بیانەوێ حاڵی ویژدانی خۆیان دەردەبڕن. فرهنگ اصطلاحات عرفاني، سيد جعفر سجادی، ص ١٦٥.

واتا: چۆن فەرهاد لەپێناوی شیرین کێوی بێستوی کون کرد، موخلیسیش ئاوا بەدڵ کەوتوکە گیانی کێوی فیراق و دەیەوێ شەقی بکات و بە ئاواتی خۆی بگات.

# مەم و زین[1]

دڵبەرێکم هەیە من، بسکەکی چین چینی هەیە
چاوەکی بێ غەرەز و سینەکی بێ کینی هەیە[2]

زوڵفی زەردی کە لەسەر کوڵمی سپی حەلقە دەدا
گەنجی زیو ڕاستە کە چەند مارێکی زێڕینی هەیـــە[3]

سەیری ئەو قامەتەکە هەر لەسەری تا بنی پێـــی
ڕۆژ و شەو، نەرگس و گوڵ، عەرعەر و نەسرینی هەیە[4]

لێـــوی شیرینی ئەگەر بێ بەتەبەسوم بدوێ
غونچە باغی ئیرەم و شانەیی هەنگوینی هەیە[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن.

(٢) بسك: زوڵف. لەنێوان (چین و کین)دا ڕەگەزدۆزی موازیع هەیە.

(٣) گەنجی زیو: مەبەستی ڕوومەتی سپی یارە.

واتا: زوڵفە زەردەکەی کە وەکو ماری زەردە لەسەر ڕومەتە سپیەکەی کە وەکو گەنجینەی زیوە، پەپکەی لەسەری کردووە و پارێزگاری دەکات. لە لەدەبی سەرزاریدا واباوە کە هەر گەنجینەیەك مارێکی لەسەرە و پارێزگاری دەکات.

لەنێوان (زوڵفی زەرد و مارێکی زێڕین) پێچەوبەخشی نارێك هەیە.هەروەها(کوڵمی سپی) لەگەڵ(گەنجی زیو) دا.

(٤) واتا: قامەتی یارەکەی لەتوێقی سەری تا بنی پێی بەم شتانەی چواندووە: ڕۆژ ڕوومەتیی، شەو قژیی،نەرگس چاویی،گوڵ دەمیی، عەرعەر باڵایەتی، نەسرینیش پێیەکانیی کە سپی و بچوکن. لەنێوان(شەو و ڕۆژ، نەرگس و گوڵ عەرعەر و نەسرین) دا گونجان هەیە.

(٥) باغی ئیرەم: ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە (ارم ذات العماد) الفجر/٧.

واتا: دەمی یارەکەی لەبچوکیدا وەکو غونچەی باخی ئیرەمە و قسەکانیشی لەشیرینیدا وەکو هەنگوینی ناو شانە وایە. لەنێوان (لێوی شیرین و هەنگوین، تەبەسوم و غونچە) پێچەوبەخشی نارێك هەیە.

خۆشە لام دەستی بنەخشێنی بەخوونی دڵەکەم
تاکو وەسفی بکرێ دەستەکی ڕەنگینـــی هەیە

با کە یێقەی بدڕێنێ بکە سەیری مەمەکەی
ئاسمانی حوسنی ئەو یارە، چ پەروینی هەیە[1]

وردەخاڵی ڕەشی وایە کە عەتر بەخشی ئەکا
مامزی چین و خەتانافەیی موشکینی هەیە[2]

بۆیە فەرهادی سیفەت کەوتمە کێوان بەتەمای
وەعدەیی ئەو کچەمە،خینەکی شیرینی هەیــە[3]

هەرچی گوێ بگرێ لە(موخلیس) دڵی ئاگر دەگرێ
سەرگوزەشتەی من و تۆ تامی مەم وزینـــی هەیە[4]

---

(١) سینگی یارەکەی وەکو ئاسمان وایە هەرکە با لێی دەدا مەمکەکانی بەدیار دەکەون کەوەکو ئەستێرەی پەروینە لەخرِی و ورشەداریدا.

(٢) خەتا: بیابانێکە لەسەرووی چین بە میسك بەناوبانگە. نافە: ماددەیەکە کە لەئاسکی موشکیدا هەیە و بۆنێکی خۆشی لێدێ.

(٣) خین: خوێن. لێرەدا (شیرین)دوو واتای هەیە یەکەمیان هێمایە بۆ (شیرین)ی دولبەری فەرهاد، دووەمیش مەبەستی خوێن شیرینیە.

(٤) واتا: لێرەدا شاعیر سەرگوزەشتەی خۆی و یارەکەی بە مەم وزین دەچوێنێ و زۆر وەستایانە سوودی لەئەدەبی سەرزاری وەرگرتوەوئاخنیویەتە ناو ئەم بەیتەوە، هەروەکو لە (شیرین و فەرهاد)یش دا ئاماژەی پێکردووەو مەزراندوویەتی.

# دەست کورت[١]

یەکەمە دڵدارەکەم بێ سانییە
یەك دوو ساڵە بێ تۆ یەك دوو سانییە[٢]
بێ جینایەت جانی من جانم دەبا
کاری وا هەرکاری یاری جانیە[٣]
نێرە بێ بان بای هەیە فەرمووی بڵێ
نێرە دێی بیبا نییە بێ بانییە[٤]
دولبەرم وانی نییە ئەمما ڕەقیب
ڕازی نابیتن دەڵێتن ، وانییە[٥]
چایەکی قورسم بەچاکە خواردەوە
پاشی زانیم خوێنی خۆمە چا نییە[٦]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
(٢) لەنێوان (سانییە و سانییە)دارەگەزدۆزی تەواو هەیە.
واتا: یارەکەم لە جوانیدا تاکە و ئەگەر یەك دوو سانیە لێی دووربم،بەیەك دوو ساڵ هەیە.
(٣) جینایەت: سوچ،گوناه. جان: گیان. جالی: ناوی بکەرە بەواتای تاوانبار. لەنێوان (جانی و جانی)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە. لەنێوان (کاری و یاری)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە. ئەم بەیتە مۆسیقایەکی بەرزی تێدایە و لەنیوەی بەیتی یەکەم وشەکانی (جینایەت، جانی، جانم) جوانی و ریتمێکی ڕێکی پێداوە،لەنیوەی بەیتی دووەمیش (کاری،کاری، یاری) بەهەمان شێوە.
(٤) ڕەگەزدۆزی تەواو لەنێوان (بیبانییەو وبێ بانییە) دا هەیە.
بیبالی:گوندێکە لەسەرووی کەرکوکەوە ودەکەوێتەدوڵی بیبانی، ئەم دوڵەش لەنێوان خۆبی ناوچەی شوان و ساڵەیە. لەم بەیتەدا چوارجار با دووبارە بۆ تەوەو مۆسیقایەکی ڕێکی پێبەخشیوە.
(٥) وان: ناوی شارێکە سەر بەکوردستانی تورکیا. والی: خەڵکی وان. والیە: ڕاست نیە، خەڵکی وانە. لەنێوان (وانیە و وانییە)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە، چونکە (وانییە) بەواتای ڕاست نیە و خەڵکی وان دێت.
(٦) لەم بەیتە سێ جار (چا) دووبارە بوتەوە، هەروەها دەنگی (خ).

یاری شێروانیم بەلەهجە و پەنجەکەی

تێی بفکرە تێی دەگەی (شێر) وانییە[1]

ئاوی دیدەم زەرد بووە بێ تۆز و کا

ڕەنگی خوێناوی جگەرمە (کا) نییە[2]

بێ شکە دەستکورتی عیشقە موخلیست

ڕاستییە بۆتۆ دەڵێم شك وانییە[3]

---

(١) لەنێوان (شێروانییە و شێر وانیە)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە. یەکەم بەواتای خەڵکی شێروانە و دووەم بەواتای شێر ئاوا نییە.

(٢) ووشەی (کانییە) بە دوو واتا دێت: سەرچاوەی کانییە،کا نییە.

کا: دوای دەرهێنای گەنم و جۆ و دانەوێلە لە قرشەکەی، ووردەکەی پێی دەگوترێ کا.

(٣) شك وانییە: دوو واتا هەڵدەگرێ ، یەکەم: گومان نییە، دووەم، سکاڵا نییە. لەنێوان (ڕاستی و شك)دا دژیەك هەیە.

# بەرز و ڕاقییە[1]

**گەنجی عیشق و عیشقی گەنجی دەوڵەتێکی باقییە**

**زینەتــی ئەو دەوڵەتە دەست و پیاڵەی ساقییــــە[2]**

**قەت برین و زەهری عیشقێکم نەدیت چا بێتەوە**

**ئاشکرایە حیکمەتی بێ مەرهەمی و تریاقییــــە[3]**

**دڵ لەژێر ئەو قەسرە تیرێکی[4] لە بۆهات کاری کرد**

**لام کەوانی وا لەلای چاوێکی ئەبرۆ تاقییــــە[5]**

**گەرچی عاشق عەیبە ئەسراری دڵی خۆی باس بکا[6]**

**هــــەرچی دێتە سەر زمانم هەر لەبەر موشتاقییە**

**دەست لە باڵای بەرزی یار هەڵناگرێ(موخلیس) بەدڵ**

**شیعرەکانی بۆیە مەعنای هێندە بەرز و ڕاقییــــــە**

---

(١) **لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن. لە دەستنوسی (أ.ر) یە.

(٢)**گەنج: گەنجینە:** لاو. لەنێوان (گەنج و گەنج)دا ڕەگەزدوزی تەواو هەیە. لەدەستنوسی خ.د (عیشقی گەنجی) ەو لە أ.ر (عیشقی گەنج)ە.

(٣) تریاق:تریاك. واتا:ئەوەی زەهری عەشقی چەشت چابوونەوەی بۆنییە و وەکو تریاك وایە ئەوەی فێری بیێ وازلێهێنانی ناخۆشە.

(٤) لەدەستنوسی أ.ر (تیریکی)یە و لە م.ك (تیرێکی)یە.

(٥) لێکچواندنی جەختاو لەنێوان (لەبرۆ و تاق)دا هەیە.

(٦) لەدەستنوسی خ.د (فاش بکا)یە و بەهەمان واتا دێ و لەگەڵ (باس بکا)یەکە.

# لاو لاو[1]

ئــــەم لاوە وەکو لەولاوە تەماشاکە چ لاوە
وەستاوە، ئەوەندە خاوە،دەڵێی خاوەڕواوە[2]

قەد عەرعەرە، لەب شەککەرە، ڕەنگ ئەسمەرە، چاوی
غەممــازە، پەری نــازە، دەڵێــی بـــــازە لــە ڕاوە[3]

ڕووی وەك گوڵە، موی سونبولە، خاڵ فولفولە،ئەبرۆی
شمشــیرە، موژەی تیــرە، بەسەد لیــرە،کـــــڕاوە[4]

ئەم پەرچەمە، واپڕخەمە، وەك لەملەمە،زوڵفی
زنجیرە، عەقڵ گیــرە،بــە ئینســان نەکڕاوە[5]

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەکفورل مەحزووفە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.
لەدەستنوسی(خ.د)ە. ئەم غەزەلە هەمووی بەگشتی خاوەن سەروای ناوەخۆیە و شاعیر زۆری لەخۆی کردووە بۆ دۆزینەوەی سەرواکان و ڕێکی و جوانی و مۆسیقا سواریەکی باشی بە بەیتەکان داوەوپێدەچێ چاوی لەغەزەلەکەی مەلای جزیری کردبێتەوە کە لەسەرەتادا دەڵێ:-

من دی سەحەر، شاهی مەجەر، لیبسی دیەر، مەحوورییور
لەم دیم زەوی، سرڕ موشتەری، یارەب پەری، یا حوور بور

العقد الجوهری/ص٥٩٨

(٢) کو: فارسیەو بەواتای،کەنەو. لەنێوان (خاو و خاو)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە، هەروەها لەنێوان (لاوە و لاوە)دا.
(٣) لەنێوان(ناز و باز)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.
(٤) لەنێوان(تیرە و لیرە)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.
(٥) لەدەستنوسی (خ.د) لەجیاتی (لەملەمە) ووشەی (کولمەیی)ە، بەڵام مامۆستا عەلی فتاح دزەیی شیعرەکەی لەبەربوو و گوتی (لەملەمە)یە.
لەملەمە: قەرەباڵغیەکی زۆر لەبارەی هەرشتێکەوە بێ لەحاڵەتی جوجوڵدا.وەك تێورووکاندنی منداڵ و ئەسپ و مێش.فرهنگ فارسی، محمد معین، ص.
لێرەدا مەبەستی بەیەکا چوونی پەرچەمە.

ئەم قامەتە، ئەم سورەتە، ئەم نەخش و نیگارە
مەعلومە لەعالەم کە بە پەرگار نەخشـــاوە
سەربەستە، عەجەب مەستە، لەبەر دەوڵەتی حوسنی
خۆی بویتە جەفا، پشت لەوەفا، لوتفـــی نەمـــاوە[1]
تۆی شاق، ئەتۆی کاف،لە بۆ عیللەتی (واق)
ئەم عیللەتە تەشخیس بە لوقمان نەکراوە[2]

---

(١) لەنێوان (جەفا و وەفا)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.
(٢) لەنێوان (شاق و واق و کاف)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

# سێو و خۆخ[1]

گەر گوڵی من بولبولم،وەر ئاتەشی پەروانەمــــە
خۆ ئەگەر لەیلای منیش مەجنونی ئەو چاوانەمە[2]

لێم گەڕێ بابێم تەماشای باغەکەت کەم پڕبەچاو
چەند دەمێکە ئارەزووی ئەو سێو و ئەو خۆخانەمە[3]

ڕۆژی ئیحسان و خەڵات بەخشینە ئەوڕۆجەژنەیە
وەك هەتیو هاتومە دەرگا،چاوەڕێی جەژنانەمــە[4]

شار بەشار و دێ بەدێ کوچەبەکوچە دەرەبەدەر
ڕۆژوشەو دێم ودەچـــم وەك تەیری بێ هێلانەمە[5]

(موخلیس)ی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن
خوونی گەش بۆ ڕۆژی دەعـــواشاهید ونیشانەمـــــــە[6]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی مەشق مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) وەر:کورتکراوەی (ئەگەر)ە.شاعیر جارێك خۆی بەبولبول چواندووە ئەگەر یارەکەی گوڵ بێت، جارێکی تر خۆی کردوتە پەپولە ئەگەر یارەکەی ئاگر بێت،دوا‌جاریش بوتە مەجنون ئەگەر یارەکەی وەکو لەیلا بێت.

(٣) باغ: مەبەستی سینگی یارە. سێووخۆخ: مەبەستی مەمکەکانیەتی.

(٤) لێکچواندنی بەرجەستە لەنێوان (شاعیر و هەتیو)دا هەیە.

(٥) کوچە:کوڵان. دەر: دەرگا. ئەم بەیتە بەبەیتێکی گامیر أصفهانی دەچێت کە دەڵێت:

ازپی دیدن رخت همچو صبا فتادم　　　خانه خانه دربەدر کوچە بەکوچە کە بە کو

قواعد فارسية، د. محمد تقي الزهتابي و د.حسين علي محفوظ، ص٢١٧.

(٦) ڕۆژی دەعوا:ڕۆژی حەشر. واتا: موخلیس کە شەهیدی عەشقە وازی لێبینن، چونکە لە ڕۆژی دوایی خوێنەکەی شایەدی بۆ دەدا و تۆڵەی بۆدەسێنێتەوە. موخلیس کە خوێنی گەشی بەکارهێناوە چونکە خوێنی شەهید تا ڕۆژی دوایی گەشەو ووشك نابێتەوە.

# نەقشی قەبر[1]

زوڵفی داوداوی، هەمووو داوێکی هەر داوی منە
بازی چاوی، فێرە ڕاوی، هەر لەبۆ ڕاوی منـە[2]
قـــەدی لاولاوی هەمووو لاوێکـــی دوو لا کـــردووە
ئاتەشی ڕووی بۆ خسوسی جەرگی برژاوی منە[3]

سەیری سەحراکە چ ڕەنگینە وەکو فەسڵی بەهـــار
قەترەقەترە و چك چکەی خووناوی دوو چاوی منە[4]
بۆنی شەو بۆ دێ لەنیوەی شەو هەمووو شەو تابەیان
پێم ئەڵێ ئەو بۆنە بۆنی پەرچەمی خاوی منـــە[5]
تووخودا (موخلیس) کەسووتای عەشقی تۆیە دولبەرا
بیکە نەقشی قەبرەکەی ئەو عەبدە سوتاوی منـــــە[6]

---

(١) لە بەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) لەنێوان (داو و داو) دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە. یەکەم بەواتای: تاڵی مووە، دووەم: ئەو داوەی کە نێچیر دەگرێ. لێکچواندنی وێنە هەیە لەنێوان (باز و چاو)دا. لەنێوان (چاوی و راوی)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

(٣) لێکچواندنی وێنە لەنێوان (قەد و لاولاو)دا هەیە. دوولا: کووڕ، چەماو.
واتا: ئەو بەژنە ڕێك و جوانەی هەمووو لاوێکی لەخەما چەماندوتەوە و ڕووی کەوەکو ئاگری سوورە جەرگی منی برژاندووە. لەنێوان (ئاتەش و ڕوو)دا لێکچواندنی وێنە هەیە.

(٤) چك چکە: هاتنە خوارەوەی دڵۆپی فرمێسك.

(٥) ئەم بەیتە مۆسیقایەکی دڵگیری هەیە و هەردوو ووشەی (شەو و بۆن) هەریەکە سێ جار دووبارەو بوتەوە.

(٦) ووشەی (سووتای) کورتکراوی (سووتاوی)یە و لەبەر کێشی بەیتەکە(و)ی لێقرتاوە.

# دەوری جوانی[1]

گەلەداو بەربوو دڵـم، هاتەوە وەك داوی دەزی
هەرچەی کردبوو یار لێم، دڵەکەت داوی دزی[2]

بە خەتا یار گوزەری کرد بەکەنارم سەحەرێ
بەتکا چومە بـەری دانەبەزی، تا نـــەبـــەزی[3]

ڕەشەماری کەزییان دێن و دەچن وەك حەرەست
بنی فەت نابێ، بڕینێ گەزی لێـدابێ کـــــەزی[4]

ڕەز و باغێکی پڕی میوەیی نایابی هەیـــە
کە بەکارنێن هەموو ناخر دەڕزێتن لەڕەزی[5]

بەهەوای دەوری جوانیت وەرە (موخلیس)بدوێ
لە ژوان خۆشە بوەستی لەشەوا تا دەتـــــەزی

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن.

(٢) لەنێوان(داو و داو)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
واتا: کە دڵم لەداوی یار بەربوو وەك داوەدەزی باریك بوو بوو، کەچی یار گەف دەکردو دەیگوت: دڵەکەت داوەدەزی دزیوە و نەیدەزانی کە دڵی منە وەکو داوە دەزووی لێهاتووە. لێرەدا وێنەیەکی شیعری ووردی خستوکە ڕوو، جۆرە لەڕادە بەدەریەکی تێدایە کە دڵی لەباریکیدا بوتەداوەدەزوو.

(٣) لەنێوان (دانەبەز و تانەبەزی)دا ڕەگەزدۆزی موازیع هەیە. بەری: پێشی، بەردەمی.

(٤) لەنێوان (ڕەشەمار و کەزی)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە، هەروەها لەنێوان (ڕەشەمار و حەرەس)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە، لەنێوان(گەزی و کەزی)دا ڕەکەزدۆزی موازیع هەیە.

(٥) واتا: یارەکەم سینگ و بەرۆکێکی خڕوخۆڵی هەیە وبەرێکی باشی گرتووە کە مەمکەکانیەتی، بەڵام لەبەر ماری زوڵفی کەس ناوێرێ خۆی لێبداو بەکاریبێنێ، گەربەمجۆرەش بمێنێتەوە دەرزی، واتا: بێ بەر دەبێ و منداڵ لەبەر بەرۆکی خۆی نابینێ و گوێی لەدەنگی دایەی منداڵی نابێت.

# شەمامەی بێ خەت[1]

پەردە لەڕووتا هەڵدەوە، هەرچی دەبیتن بابی
مەستانە نەختێ لاکەوە، هەرچی دەبیتن بابی[2]

ڕەنگ زەردی دەستی فیرقەتم، مردی شەمامەی بێ خەتم
ســــا بمخە ناو بێستانەوە، هەرچی دەبیتن بابیــــی[3]

دڵ تۆی کەدیت نەیما قەرار، گێی خۆی نەدا نەغیار و یار
خۆی خستە وەرتەی عیشقەوە، هەرچی دەبیتن بابیــــی[4]

میحرابی ئەبرۆی تۆم هەبێ با ڕووم لەقیبلە هەر نەبی
دینم بە عیشقت گۆڕیەوە،هەرچی دەبیتن بابیـــــــی[5]

(موخلیس)ئەوا نیوەی شەوە، هەستە بچۆ لای یارەوە
دەرمانی دەردت هەرنەوە، هەرچی دەبیبتن بابیــــی

---

(١) لەبەحری ڕەجەزی هەشتی تەواوە: مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن.
ئەم غەزەلە جگە لەبەیتی چوارەمی هەمووی دڵداری مەجازیە و ئافرەتێ دەدوێنێ، بەڵام لەبەیتی چوارەم گومان دەخاتە مەسەلەکەوە و خوێنەر بۆ ئەوە دەبات کە پلەی دڵداریەکەی باڵاترە، بەڵام بەکارهێنانی هەندێ ووشە و دەستەواژە وایکردوە کە لێکۆڵەر جەخت لەسەر دڵداری ژن بکاتەوە وکو بەکارهێنانی (مەستانە نەختێ لاکەوە، مردی شەمامەی بێ خەتم). کەواتە لەبەیتی چوارەم دا شاعیر ویستویەتی کە چاولێکەری شێخی سەنعان بکاتەوە و دینی بە عەشقی بگۆڕێ.

(٢) لاکەوە: ئاوڕدەوە.

(٣) شەمامەی بێ خەت: مەمك. بێستان: مەبەستی سینگ و مەمی یارە.

(٤) گێ:گوێ. نەغیار: ناحەز. وەرتە(ورگە): گێلەوەژە.

(٥) واتا: ئەگەر بڕۆی تۆم هەبێ کە میحراب ئاسایە، قیبلەم ناوێ و دینم بەعەشقت گۆڕیوەتەوە و بێ باکم لە هەموو شتێ. ئەمە ئاماژەیە بەحیکایەتی (شێخی سەنعان)کە خاوەنی (٥٠٠) موریدبووەو تەمەنی ٨٠ساڵ بووە، لەبەر عەشقی کچەگاورێ وازی لەئیسلامەتی هێناوەوزوناری قەشەکانی لەپشت بەستووە و بووەتە بەرازەوان. ئینجا موریدەکان پەنا دەبەنە بەر شێخی عەتارو شێخیش سەرزەنشتی دەکا و دەبێتەوە موسڵمان و دەمرێت. ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ب ١،کامەران موکری، ل ١٢.

# وەسفی سروشت و ژن

پێش ئەوەی بێینە سەر کرۆکی باسەکەمان پێویستە ئاورێك لەپێناسە و ڕەهەندەکانی سروشت بدەینەوەبۆئەوەی مەیدانی نوسینەکە ڕوونتر بێ مەبەستەکان زووتر خۆیان نیشان بدەن.گەر سەیری بیروبۆچونی زاناوفەیلەسوفەکان بکەین دەبینین لەچەند ڕوانگەیەکەوە سەیری سروشتیان کردووە و هەوڵیانداوە پێناسەی بکەن، لەوانەش:

ا- سروشت لای فەیلەسوفەکانی یۆنان بریتیە ((لە جیهان و گەردوون و هەموو بونەوەرەکانی مادی دەگرێتەوە بەیاساکانیانەوە،لەوانەش مرۆڤ))[1]

هەرلەم بارەیەوە گوتراوە کە سروشت ((بریتیە لەبوونەوەران هەرشتێ کە لەباری جەستەییدا هەبێ و بەپێی یاسا بڕوات لەوانەش مرۆڤ[2])) لەشوێنێکی دیکە هاتووە کە ((ئەو کەونەیە کە دەوری ئێمەی داوە بەهەموو ڕەگەز و دیاردەکانەوە[3]))

ئەم سێ دەقەی سەرەوە هەرسێکیان لەیەك تەوەرەدا دەخولێنەوەوپێیان وایە کە سروشت بونەوەرە مادییەکانە.

ب- لەفەرهەنگی (لسان العرب)دا سروشت بەو ناکار و خۆرسکەی مرۆڤ دەگوترێ کەلەسەری ڕاهێنراوە[4].

ج- سروشت لای نوسەرێکی دیکە((ئەو هێزەیە کە لەناو تەکان دا هەیەبەم هێزە هەمووشتێ کە بوونی هەبێ دەگاتە پلەی تەواوی سروشتی خۆی)).[5]

---

(١) الطبيعة وما بعد الطبيعة، يوسف كرم، دارالمعارف – القاهرة ١٩٥٩، ص٨

(٢) سەرچاوەی پێشوو،ل٨

(٣) الطبيعة في الشعر العراق الحديث،حسين عبود،رسالة الماجستير،كلية الأداب،جامعة البصرة،١٩٨٤،ص١٥

(٤) لسان العرب، ابن المنظور، دارلسان العرب – بيروت، مادة(طبع).

(٥) المعجم الفلسفي، ج٢، د. جميل صليبا، دارالكتاب اللبناني، ١٩٧٩، ص١٣.

د- لەبواری هونەریەوە سروشت بەمجۆرە پێناسەکراوە((بەشێکە لە گەردوون توانای بزواندنی هەستی هونەری لە مرۆڤدا هەیە))[1] لەم پێناسەیەدا بەشێك لە سروشت سەربەهونەرە بەگشتی و سەربەئەدەبە بەتایبەتی.

هەروەها ئەنیسی مەقدیسی بەمجۆرە پێناسەی ئەدەبی سروشت دەکات کە ((ئەدەبێکە گرنگی بەوێناکردنی سروشت دەدا کە دەیخاتە نەفسی مرۆڤەوە))[2]

سروشت بەپێی پیکهاتەکانی بریتیە لە:

١-ڕەگەزەکان: ئەو بەشانەیە کە لەناو ناچن، وەکو: ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەو چیاو دەشت و دۆڵ......تد

٢-دیاردەکان: ئەوانەن کە گۆڕان و پەیدابوون و بەردەوامیان نییە و دەگۆڕێن،وەکو:شەو وڕۆژ،کەژەکان،بەفروباران.....تد[3]

## ( جۆرەکانی سروشت بە پێی گیاندار و بێ گیان )

١- سروشتی گیاندار: ئەو گیانلەبەرانەی کەلە سروشتدا دەژی.

٢- سروشتی بێ گیان: وەکو ڕۆژو مانگ و ئەستێرەو ئەشکەوت....تد. کەواتە ئەو سروشتە هەموو گەردوون بەگیاندار و بێ گیان دەگرێتەوە، مرۆڤیش یەکێکە لەسروشتە گیاندارەکان و کاریگەری سروشت بەسەریدا هەیە و سروشتە بێ گیانەکەش دووجۆری هەیە:

١-سروشتی حەقیقی: ئەو سروشتەیە کە لە خۆیەوە هەیە و دەستی مرۆڤی تێدا نییە، وەکور: ڕووبار و دەریا و ڕووەکی سروشتی....تد.

٢-سروشتی دەستکرد: ئەو سروشتەیە کەمرۆڤ دروستی کردووە، وەکو: گوند و شار و کارگە و....تد[4].

* * * *

---

(١) المعجم الأدبي، صبور عبدالنور، بيروت -١٩٧٩، ص١٦٣.

(٢) الاتجاهات الأدبية في العلم العربي الحديث، ط٥، دارالعلم للملايين - بيروت، ١٩٧٣ ص ٣٤٨.

(٣) شعرالطبيعة في الأدب العربي/ د. سيد نوفل، مطبعة مصر- القاهرة - ١٩٤٥، ص ١٤٩.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٠

موخلیسی شاعیر خاوەنی دڵێکی ناسك و هەستێکی پاك و بیرێکی قووڵ بووە، زۆربەی زۆری ژیانی گەنجیەتی لەدەشتێ قەراج و کەندێناوەو موڵکیە ڕابواردووە و دیمەنی بەهاری ئەم ناوچانە دڵیان کێش کردووە و قەریحەی شعریان کردۆتەوەو بەدەنگیان هێناوە. ئەم پێنجینە و دوو قەسیدەیەی کە دەیکەینە نمونەی ئەم بابەتە تێکەڵن لەوەسفی سروشت و ژن، بەڵام لەهەردوو قەسیدەکەدا وەسفی سروشت (بەهاری دەشتی قەراج) بەسەریاندا زاڵە و جاروبار ئاوڕی لەوەسفی ئافرەت داوەتەوە.

## شەنگەبێریەکەی موخلیس

هەرکە ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەم پێنجینەیەی موخلیس پەیدا کرد، یەکسەر (شیرین تەشی دەڕێسێ)ی وەفاییم کەوتەوە یاد، چونکە هەردوکیان لەسەر یەك کێشی عەرووزین و سەرەڕای ئەوەش پێنجینەن و هەریەکە وەسفی نەریتێکی کۆنی کوردەواری دەکات.

دوایی لەگۆڤاری بەیانی ساڵی ١٩٨٥ بەناونیشانی (شاعیری دەشتی قەراج مەلاخەلیلی موخلیس) نوسرابوو ((ئەوکاتەی موخلیس مەلای گوندی دووسەرە بوو، فەتاح ئاغای دووسەرە کە ئەدەب دۆستبوو زۆر حەزی لەشیعرەکانی (وەفایی) دەکرد بەتایبەتی (شیرین تەشی دەڕێسێ)، کە موخلیسی شاعیر ویستویەتی شیعرێك ڕێك بخات لەسەر کێش و سەرواى شیعرەکەی وەفایی بێت بۆ ئەوەی جێگای ئەم شیعرە لەدڵی بگرێتەوە))[1] ئەوکاتە بۆم دەرکەوت کەبۆچونەکەی من لەجێی خۆی بووە.

هەروەها(هێمن)ی شاعیر(شەنگەبێری) نوسیوە و وێنەیەکی نایابی نواندووە لە چونەبێردا. خۆهەرچەندە(هیمن و موخلیس) هێندە جیاوازیان لەتەمەندا نەبوە، بەڵام ڕۆشنبیری (هێمن) تاڕادەیێ لە هی( موخلیس) جیابووە، هەردووکیشیان لەسەر کێشی خۆماڵی کوردین. لەبارەی مۆسیقای شیعرەوە بەلای من شیعرەکەی موخلیس

---

(١) جەلال مەولود ئەحمەد، شاعیری دەشتی قەراج مەلاخەلیلی موخلیس، بەیان ژمارە ١١٢ ساڵی ١٩٨٥، ل٣٦.

مۆسیقاکەی لەبارترە و خێراتر هەست دەبزوێنێ، ئەمە لەڕووی ڕوخسارەوە، بەڵام لەڕووی ناوەڕۆکەوە (موخلیس) تەنیا وەسفی چونە بێری یارەکەی دەکات و کەمێکیش دەشتی قەراج. کەچی (هێمن) گیانێکی پێشکەوتنخوازانە و پەیامداری (التزام) دەخاتە نێو شعرەکەوە و ئازادیی نیشتمان دەکاتە زەمینەی بەپەگگەپشتنیان[1].

(١) بڕوانە تاریك و ڕوون /هێمن، بەغدا ١٩٧٥، ل١٦٨-١٦٩.

# شەنگەبێری[1]

کە قارەقارەی مەڕ هات وەکو هەوری بەهـــاری[2]
هێنایە خوار لەسەرسەر ئەو شـۆخە کۆفیـی لاری[3]
بەهەوری سۆری پۆشی زوڵفی کەزیی و ڕەشماری[4]
پشت بەستی بەستە پشتی لەژێر مەمکی هەناری[5]
ناوی خوای خستە زاری، دەچتە بێر شەنگە بێری[6]

---

(١) لەبەحری هەزەجی موخلیس لەم کۆمەڵە پێنجینەیەدا سروشتی گیاندار و بێ گیانی تێکەڵکردووە،سەرەتا سروشتی گیانلەبەر و سروشتی بێ گیانی(هەور) تێکەڵکردووە و پاشان هاتووە سروشتی بەهاری بە گوڵ وگوڵزار و داروبارەوە خستوتە خزمەتی کچە شەنگەبێریەکەی خۆی و ئەم هەموو نەسرین و داری سەروو وگوڵاڵە و گیابەندوخاو و بەیبوون و شمشاد و گوڵ و عەرعەر و چناری کردوتە شەرمەزاری یارەکەی ،ئەمەش هەمان بیرۆکەی گۆرانی شاعیرە کەدەڵێ

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز — بێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز

دیوانی گۆران، محەمەدی مەلاکریم/ل ١٠.

ئەو وێنە شیعریانەی کەنەخشێنراون وەکو زنجیرەیەکن و پەیوەندیان بەیەکەوە هەیەو وێنەکانیش چەسپاوین و لەجوڵانەوەدان،کەرەستە شیعریەکەش لە کولتوری کۆنی کوردەوارییەوە وەرگیراوە و دەمانباتەوە سەردەمی فەقێیانەو خەزێم و گوارەی بەکاریتە. لەپاشان قەراج دەکاتە بەهەشت و کچە بێریش حۆرییە تێیدا دێت و دەچێت.

(٢) لەنێوان (قارەقاری مەڕ و هەوری بەهار)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە و زۆر بەهێزە چونکە هەردوکیان لەیەك کات و شوێندا ڕویانداوە.

(٣) کۆفی: شەدە،کڵاو و دەسرۆك. کۆفی لادان:ئامادەبونە بۆچونە بێر.

(٤) هەوری: مشکی. لێرەدا یار زیاتر ئامادە دەبێ و مشکیە سورەکەی زوڵفی دادەپۆشێ، چونکە لەکاتی بێرکردن (کارکردن)دا نابێ زوڵف پەرش و بڵاوبێ.

(٥) ئەم نیوە بەیتە مۆسیقایەکی جوانی هەیە و لەدووبارەکردنەوەی هەردوو وشەی (پشت،بەست)ەوە پەیدابووە و جۆرە یاریکردنێکی وشەیی تێدایە،ئەگینا دەیتوانی بڵێ(پۆدێنی لەپشت بەست)،کە ڕستەیەکی سادەیە و شیعریەتی تێدانییە.

(٦) ئاماژەیە بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ص) ((کل امر ذي بال لم يبدا باسم الله فهو ابتر)) الکشاف،الزمشخري،مصر-١٩٦٦، ص٣١.

کچە بێریش ناوی خوای لێهێناوە و دەستی بەمەرِدۆشین کردووە،لە ووشەی (دەچتە)لەبەر کێشی شعرەکەی (ێ)ی لێ قرتاندووە،چونکە(دەچتە)ناوچەییە و (دەچێتە)زمانی نوسینە.

لەسەر قۆڵی کەلابرد کلەنگوچکی کەتانی[1]
پارچە زیوێ وەدەرکەوت لەژێر بەفری بەیانی[2]
لەدونیادا حەرامە لەپاش ئەو نەوجەوانی[3]
خودا حیفزی بکاتن لە چاوی دوژمنانی
دەڕوا بەخان و مانیدەچتە بیر شەنگەبێری[4]

بەینی خەزێم و گوارە نەزێڕ نە کارەبایە[5]
لەشەرمەزاری هەردوو ڕوویان زەرد هەڵگەڕایە[6]
قەلبی لەقەلبە هەرکەسێ بڵێ ڕۆژ یا چرایە[7]
هەرکەس کەدیتبێتی هۆشی لەسەر نمایە[8]
بۆدینی هەربەڵایە، دەچتە بیر شەنگە بێری

بەقەد شەنگ و شۆخی سوڵتانی نەونەمامان[9]
وا کەوتە ڕێ بەلەنجە وەك کەبکی پڕ خەرامان[10]
لەتافەتی لێدەچکا لەسەر هەتاکو دامان[11]
کەس نەبوو تاس نەبیتن لەبەر بۆنی شەمامان[12]
کەی خوایە دێتە لامان؟دەچتە بیر شەنگە بێری

---

(١)کلەنگوچك: کورتکراوەی (کلکە ئەنگوچك)ە بەواتا:فەقێیانە.
(٢) پارچە زیو: مەبەستی قۆڵ و باسکی یارە کە سپییە.
(٣) نەوجەوالی: هەرەتی گەنجی.
(٤) خان و مالی: بەلەنجەولار.
(٥) بەینی خەزێم و گوارە: مەبەستی گۆنای ڕوومەتە. خەزێم: جۆرە خشڵێکی خڕبوو لەلوتیان دەکەن.
(٦) واتا: کوڵم و گۆنای یار هێند جوانە نە زێڕ دەیگاتێ نە کارەبا، لەبەرئەوەی خەزێم و گوارەکان شەرمەزارن و شەرمەزاریش ڕووی زەرد دەبێ.
مەبەستی ئەوەیە زەردیەکان لەبەر شەرمەزاریە. ئەم وێنە شیعریە جوانی بایسی تێدایە.
(٧) واتا: ئەوەی دەڵێ ڕووی یارەکەم وەکو ڕۆژ یا چرایە، ئەوە دڵی گۆڕاوە و شێت بووە، یاخود بەجۆرەیە (قەڵبی لە قەلبە) واتا: دڵی بێگەرد نیە و بەخەشە.
(٨) نمایە: نەماوە.
(٩) شەنگ و شۆخ:وەرگەڕاوەی (شۆخ و شەنگ).
(١٠) کەبك: کەو. خەرامان: ڕۆیشتنی بەلەنجە. لەنێوان (لەنجەی یار و ڕۆیشتنی کەو) لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
(١١) لەتافەت: جوانی، شۆخی.
(١٢) تاس: کاس، بێ هۆش. شەمامە: لەناو بێستاندا هەیە و خەت خەتە و بۆنی خۆشە.

**نەسرین و سەرو و لالە، گیابەند و خاو و بەیبوون[1]**
**شمشاد و عەرعەروگوڵ، چناری دەستی مەجنوون[2]**
**چاوشۆڕی ئەم نیگارەن، هەمووی وا بونە مەفتوون[3]**
**یەك یەك وەکو غوڵامان بۆ پایەبۆسی هاتوون[4]**
**لەپێشی خاك و پابوون، دەچتە بێر شەنگە بێری**
**کە هاتە دەر لەڕەشمار ڕۆژبوو لەهەوری دەرهات[5]**

**بەحوسنی خۆی دەنازی ،سەرخۆشە و بێ موبالات[6]**
**غەوغا دەکەتە عەردی، کەوتە سەماسەماوات[7]**
**عالەمی کوشت بەجارێ، دوو چاوی پڕ نیشارەت**
**ئەم فیتنەیە لەکوێ هات؟ دەچنە بێر شەنگە بێری**

---

(١) **نەسرین:** جۆرە گوڵێکی پەڕە ووردی بۆن خۆشی سپیە. فەرهەنگی خاڵ/٣٥٥.
**سەروو:** درەختێکی ڕاسق بەرزی هەمیشە سەوزە گەڵای وورد و خڕە. ئەستێرە گەشە/ل٣٣٢
**لالە:** لالا، لالۆ، جۆر گوڵێکە.
**گیابەند:** گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە چێشتی دانولەوە. فەرهەنگی خاڵ/ل٢١٩.
**خاو:** گیایەکی گەڵا توکنی گوڵ زەردی بۆنخۆشە ئەکرێ بەمەشکەیەکەوە کە بۆگەن بوبێ. ئەستێرە گەشە/ل١٩٢. بەیبون: گوڵە بەیبون.
(٢) **شمشاد:** جۆرە دارێکی جوانی بێ گرێ و قۆزلە،کەوچك و لەنگەری لێدروست دەکرێ.
**عەرعەر:** سپی داری ڕاسق بێگرێ و قۆرت.
**چنار دەستی مەجنوون:** مەبەستی لەیلایە کە باڵی وەکو چنار بەرزە.
(٣) **مەفتوون:** سەری لێشێواوە،عاشق، شەیدا.
(٤) **پایەبۆس:** پێ ماچکردن.
(٥) **ڕەشمار:** ڕەشماڵ لێکچواندنی جەختاو لەنێوان (یار و ڕۆژ، ڕەشمار و هەور) هەیە. هەروەها دژیەکیش لەنێوان(ڕۆژ و هەور)دا هەیە.
(٦) **بێ موبالات:** کەمتەرخەم، لەوەی گوێ نادالە هیچ شتێك.
(٧) **غەوغا:** هەراوهۆریا. لەنێوان (سەما و سەماوات)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.

بۆ پاسەوانی باغی زابتی چاوی مەستی[1]

تیــر و کەوانی هێنــا، ئــازانە گرتیە دەستـــی

لـــەم باغە نەك دزێ بێ‌بــاقە گوڵەك ببەستـــی[2]

ئەمری دەکردە عەسکەر هەرکەس لەجێی هەڵستی

بۆ سەلام لغ ڕاوەستی، دەچتە بێر شەنگە بێـــری[3]

دەشتی قەراج بەهەشتە و ئەو حۆرییە بەتەنیا[4]

بۆ دڵ گوشادی جارجار مەیلی دەکاتە هەرلا

قازوقوڵینگ و سینە، هاتوونە بۆ تەمەننـــا[5]

بنوارنە کارغەزالان‌شۆن بویتە شێت وشەیدا[6]

کەوتونەتە چۆڵ و سەحرا،دەچتە بێر شەنگە بێری

---

(١) **زابتی چاوی مەستی**: مەبەستی برژانگەکانیەتی کە وەکو ئەفسەر قیت وەستاون.

(٢) **لەم باغە**:مەبەستی ڕوومەتیی. واتا:ئەفسەری چاوی یار کە برژانگە خۆی خستە کەمین و تیر و کەوانی لەدەست گرت،تا ئەگەر موخلیس بۆ ماچێ بیت نەهێڵێ و لێی لە هەرا بدات.

(٣) **سەلام لغ**: selam lik

هوڵی میوانی پیاو ماقوڵەکانی کۆنە،ئەو پێشوازی و دروشمانەی بۆ پاشایەکانی شار دەکرا کاتێ کەدەچونە نوێژی هەینی.المعجم التركي العربي،ج٤، عبدالطيف بندر اوغلو..... ص١٧٥.

(٤) **قەراج**: ناوچەیەکی بەپیتی کشت و کارە،دەکەوێتە قەزای مەخموور لەچیای قەرەچوغەوە تا زێی گەورە، بەگشتی کەمبارانە. لەنێوان (دەشتی قەراج و بەهەشت، شەنگە بێری و حۆری)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە.

(٥) **قازوقورینگ**: قازومێشەسپی.

**سی**: جۆرە قازێکی کێوییە.

(٦)**کارغەزال**: بێچوە ئاسك،کارمامز. **واتا**: کە شەنگە بێری لەدەشتی قەراجی وەکو بەهەشت دەگەڕێ، باڵدارەکانی وەکو: قازوقورینگ وسینە بەباڵە فڕکەدێن و دەچن و سەیری شەنگە بێری دەکەن و کارمامزەکانیش مەستی جوانیی یارن.

(موخلیس) ئەگەرچی پیرە، قامەتی واچەماوە[1]
ئەمما لەدڵ جەوان و لاوچاك و تازە لاوە
بۆگرتنی غەزالان کەیفی لەسەیر و ڕاوە[2]
بەتیری کچە کوردی، جەرگ و دڵی پساوە
پەڤین کاری کراوە،دەچتە بێر شەنگە بێری[3]

---

(۱) دیارە شاعیر لێرەدا پیر بووە (یاخوی بەپیر داناوە) بەڵام بەدڵ هێشتا گەنجە و سوزی لاوێتی تێدا ماوە.

(۲) غەزال: ئاسك،مەبەستی یارە.

(۳) شەنگە بێری: ئەو کچە شوخ و شەنگەیە کەدەچێتە مەڕدوشین.

لەزمانی کوردیدا بەزوری ئاوەڵناو دەکەوێتە دوای ناوەوە، بەڵام لێرەدا بەپێش ناو کەوتوە.

لەم نو پارچە پێنجینەیەدا بەدەیەها لادانی ڕێزمانی بەرچاو دەکەون و شاعیر پەیرەوی شێوازی هیندی کردوە و جێگەی سروشتی فرمانی گوڕیوە و هێناویتیە سەرەتا یان پێش کوتای ڕستە.جالەبەر ئەوەی نمونەکان گەلێ زورن بویە تەنیا پێنج نمونە دەستنیشان دەکرێن:

١- لەپێنجینەی یەکەمدا(هێنایە خوار لەسەر سەر ئەو شوخە کوفیی لاری)،ڕستە ڕێزمانیەکە بەم جورەیە(ئەو شوخە کوفیی لاری لەسەر سەر هێنایە خوار).

٢- لەپێنجینەی دووەمدا(لەسەر قوڵی کەلابرد کلەنگوچکی کەتانی)،ڕستە ڕێزمانیەکە بەمجورەیە(کە کلەنگچکی کەتانی لەسەر قوڵی لابرد).

٣- لەپێنجینەی چوارەمدا(لەتافەتی لێدەچکا لەسەر هەتاکو دامان)، ڕستە ڕێزمانیەکە ئاوایە (لەسەر هەتاکو دامان لەتافەتی لێدەچکا).

٤- لەپێنجینەی شەشەمدا(کە هاتەدەر لە ڕەشمار)،ڕستەڕێزمانیەکە بەم شێوەیە یە(کە لەڕەشمار هاتەدەر).

٥- لە پێنجینەی هەشتەمدا(قازوقوڵینگ و سینە هاتوونە بو تەمەننا)، ڕستەڕێزمانییەکە ئەمەیە(قازوقوڵینگ و سینە بوتەمەننا هاتونە.

هەروەها لەم شیعرەدا یەکێتی بابەت بەزەقی دیارە و لەسەرەتاوە تا کوتایی موخلیس وەسفی کچێك دەکات کەکاتی بێر هاتووە و خوی بومەڕدوشین ئامادە دەکات،ئەمە و زور لەشیعرەکانی دیکە ئەم ڕایە ڕەد دەکەنەوە کە گوایە شیعری کلاسیکی بێ یەکێتی بابەتە و هەر بەیتێك بابەتێکی سەربەخویە.

# بواری دەشتی قەراج[1]

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەقسوورە:فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.

موخلیسی شاعیر دوو قەسیدەی درێژی هەیە لەسەر دەشتی قەراج،یەکێکیان پێنجینەیە و شازدە پارچەیە،ئەوی دیکەیان حەفتاوپێنج بەیتە ئەم قەسیدە درێژە لەسەر سەروای ستونییە. ئەم دووانە تا رادەیەك لە یەکدی دەچن، بەڵام لەم بارەیەوە (مەلاخالیدی دوو سەرە)پێی گوتم کە موخلیس یەکەمجار پێنجینەکەی دانابوو و لێی بزربووە،دوایی لەبەر رۆشنایی ئەو پێنجینەوە هاتووە قەسیدە ستونییەکەی داناوە تا شوێنی گومبوەکە بگرێتەوە.

منیش ئەم بۆچونەم لاپەسەندە چونکە رەسەنایەتی شیعری زیاتر لە پێنجینەکە بەدی دەکرێ. سەروای قەسیدەکە کزەوبەزۆری (ان)ی کۆی کردوتە سەروا،بۆ نمونە لەوانەی کە بە (ان)ی کۆ کوتاییان هاتووە ئەمانەن (شەوان، ئەستێرەکان، بارانەکان، دولبەران، مردووان، پەروەران، شاخ و داخەکان، بەوان، عاشقان، حاجیلەکان، مۆدەکان، کوران، گەمان، کێوەکان، گوڵان، رووسییان، بەردەکان، هەرکەوان، ئەوان، سوسکەکان، دڵ کولان، راوچیان، ئەشقیان، کێروشکەکان، ئاوەکان، هێلانەیان، تیترواسکەکان، خزم و کەسان، بێگانەکان، غەمان، خاتونەکان، بارخانەمان، عارەبان، رەشماڵەکان، نایەیان، جێگەمان، بازنان، قسان، گوارەکان، سییان،کوران، سوڕگوڵان، هۆبەیان، سوڕانییان). کەواتە لە حەفتاوپێنج بەیت چل وچوار بەیتی سەروای بە(ان)ی کۆ کوتایی هاتووە کە خۆی لەخۆیدا نیشانەی کزی سەروایەکەیە ولادانە لە یاسای شیعری کلاسیزمی کورد.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لەرووی روخسارەوە کزەو کزیەکەشی بەهۆی درێژیەکەیەتی.بەڵام لەرووی ناوەرۆکەوە لە پێنجینەکە دەوڵەمەندترە چونکە پێنجینەکە تەنها وەسفی بەهاروەدەشتی قەراج و بەزم و رەزمی کچ و کورو شانازیکردن بە نیشتیمان و بەرهەم و بەخشندەیی دانیشتوانی قەراجە،کەچی لەقەسیدە ستونیەکەی وەکو هەندێ شاعیرانی کلاسیکی سەرەتا بەناوی خوا و تووانای دەستی پێکردووە و ئینجا دێتە سەر جوانی بەهارونەورۆزی کوردوستان.

خۆکە موخلیس دێتە سەر راوکردن هێندە شارەزایە دەڵێی خۆی راوچییە،بەتایبەتی کە باسی نوسکەنوسکی تورلە و هانە هانی تاژیەکان دەکات. ئەوەی گرنگە بەلای منەوە ئەوەیە کەرووی پرسیار لە(زێ) دەکا و پێی دەڵێ:بۆچی ناوەستی؟زێیەکەش لەوەڵامدا دەڵێ: لەرقی ئێوە ناوەستم و دەرۆم چونکە ئێوە بێگانەپەرستن و نۆکەرییان دەکەن،منیش دەرۆم بزانم هەستان و ژیان لەگەڵ بێگانان چۆنە؟!

ئینجا شاعیر لەو دەشتە کاکی بەکاکییەی قەراج گەشتێکمان پێدەکات،سەرەتا بارگە لەگردی (گردەشێر) دەخاو بەزم و ئاهەنگی کچ و کوران سازدەکات هەتا کاتژمێر پێنج و شەشی عەرەبی،دوایی سەرخەوێ دەشکێنن و بانگی کابان دەکەن بۆ نان ئامادەکردن.

هەرکە لەویٚ بێزار بووبەرەو گوٚمی (ماروانشان)دەچیٚ و وەسفی ئەو قازوقورینگ و پۆڕوسیانە دەکات کەدێنە سەر ئەو گوٚمە ئاوە.

چاکترین بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە قەسیدە ستونییەکە شوێنی پێنجینەکەی گرتوتەوە هاوبەشی هەردووکیانە لەم لایەنانەدا:-

أ- لەیەکەم پێنجینە و بەیتی پازدەی قەسیدەستونییەکە باسی بەهار دەکات.

ب- لەپێنجینەی سێیەم و بەیتی شازدەی قەسیدە ستونییەکە باسی کچی نازداری کورد دەکات.

ج- لەپێنجینەی چوارەم و بەیتی شەست و چواری قەسیدەستونییەکە باسی گوٚمە ئاوی تێدایە.

د- لەپێنجینەی حەفتەم و بەیتی شەست و یەکی قەسیدە ستونییەکە باسی مەشکە هەژاندنی تێدایە.

هـ- لەپێنجینەی دوازدە و بەیتی حەفتای قەسیدەکە باسی جوانی قەراج دەکات.

موخلیس بەچاوی کامێرەی شیعرەوە وەسفی شەنگەبێری و بەهاری دەشتی قەراج دەکات، وێنە شیعریەکان جوڵاون و سەرەتا چاوی مروٚڤ بەرەو ئاسمانی بەرز ئاراستەدەکات بوٚ پەند وەرگرتن لە شکوٚمەندی دانەری ئەم گەردوونە،پاشان بەرەو وەرزی بەهارمان دەبات و گەرانێکی نەپساوەمان پێدەکات لەم دەشت و دەرە ڕەنگینەو یەکیەك وەسفی گوڵەکانمان بوٚ دەکا و هەریەکە بەشتیٚ دەچوێنیٚ،هەندیٚ بەخوێنی عاشقان و هەندیٚ بەجامی مەی و هەندیٚ بە خووناو....هتد. ئینجا گوێمان هەڵدەخات بوٚ بیستنی گرمەی هەوری بەهاران و هاژەی گەواڵە،کەواتە هەموو دیمەنەکان تەنیا بەچاو نابینرێن بەڵکو هەستی بیستنیش بەشداری دەکات لەخوێندنی کەو و سوسکەو پۆڕو فڕینیان و ڕاوکردنیان، لەپاشان چاوی کامێرەی شیعر بەرەو دەووزێیان دەسوڕێتەوە و وەسفی کەناچە و تیژواسکەکان دەکات کە لەکەناری زێی گەورە دەنیشن و دەسوڕێنەوە،ئینجا موخلیس لەپەنای زێیەکەوە داخی دڵی خوٚی هەڵدەڕێژیٚ و باسی ناکوٚکی و بێگانەپەرستی کورد دەکات، ئەمەشی بوٚ ئەوەیە کەسەرکردەوگەورە پیاوانی کورد پەندی لێوەربگرن.

دوای گەڕان و سوڕانێکی زوٚر بەدەوری زێ چاوی کامێرا بەرەو هەوراز دەبا و دەمانباتە سەر گردی گردەشێرو بارگەی خوٚی لێدەخاو ووچانیٚ دەدات و لەوسا چاوی بینەران بەرەو دەور و بەری گردەکە ڕادەکێشیٚ و سێرە لەتروسکە ئاگرەکانی ڕەشماڵەکان دەگریٚ ئەو ڕەشماڵانەی کە هی مەرداڕەکانی کوردوعەرەبن، چونکە قەراج لەکوٚنەوە هەندیٚ عەرەب لەگەڵ زوٚرینەی کوردەکان ژیاون.

لەکوٚتاییدا موخلیس بەرەو کوٚڕی کچ و کوڕانمان دەبات لەو دەشتەو کوڕان حەیران دەچڕن و کچان باگوێیان دەدەنەوە،لەلایەکی دیکە کچان بە جەرەوکوندەوە بەرەو گوٚمیلکە ئاوەکان دێن و کوڕانیش لەو دەورو بەرەن و جا کچان مەست دەبن و جەرەیان لەدەست بەردەبێتەوەودەشکیٚ و کوندەکان شەق دەبن. بەمجوٚرە موخلیس پێی وایە هەموو بەهاری کوردستان لەو ناوچەیە بەوشێوەیە بەڕێوە دەچێت.

١- ئەی خودای بەرزوتەواناىدانەری کەون و مەکان
ڕاخەری فەرشی زەمین و ڕاگری هەفت ئاسمان[١]

٢- هێنـــەری هاوین و پایزىبەر لەزستان وبـــووار
خاوەنی عەرشی بڵندو سەڵتەنەت بەخشی جیهان[٢]

٣- بەر لەتوو کەس نەبووە تا بوونت لە ئەو وەرگتبێ
لەودەڤەی دەڕوا هەبونت بێ توو نابیتن چ ئان[٣]

٤- فەیلەسوفانی وەکـو سوقرات و ئەفلاتـــوون و چ کەس
دەرنەچوو لەسەریان لەزات و وەسفی توو هەرچەند دووان[٤]

٥- هەرکەسێکی سەیری ئاساری تەواناییت بکا
ناتوانێ هەڵبکێشێتن لە ڕووت تیغی زمـــان[٥]

---

(١) ڕاخەر: ناوی بکەرەو لەچاوگی (داخستن)ەوە هاتووە. ئاماژەیە بەم ئایەتە ((والله جعل لكم الأرض بساطا))نوح/ ١٩. ڕاگر: ناوی بکەرەو لەچاوگی (ڕاگرتن)ەوە هاتوە، لێرەدا مەبەستی خودایە. ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ((الله الذي رفع السماوات بغير عمد ترونها ثم استوى علي العرش و سخر الشمس والقمر كل يجري لأجل مسمى)) الرعد/٢.

(٢) بووار: بەهار. سەڵتەلەت بەخش: دەسەڵات بەخش: ناوی بکەرە لە سەڵتەنەت+بەخش کە لەڕەگی چاوگی (بەخشین)ەوە پێکهاتووە. عەرش: بارەگای خودا. ئاملژەیە بەم ئایەتە ((الله لا اله الا هو رب العرش العظيم)) النمل/٢٢.

موخلیس لەم بەیتە و لەبەیتی ڕابردوو سێ ناوی بکەری بەکارهێناوە کە کوردی پەتین و بە پاشگری (ەر) لەگەڵ ڕەگی کار دروستکراون، ئەمەش جۆرە گرنگیدانێکە بە ووشەی پەتی و دوورکەوتنەوەیە لە ووشەو زاراوە عەرەبیەکان، ووشەکانیش ئەمانەن (ڕاخەر، ڕاگر،هێنەر) ڕاگر لە دووەکەی دیکە جوودایەو ڕەگی چاووگی (ڕاگرتن)ە.

(٣) لەودەڤە: بەوشێوەیە. ئان: کات. ئاماژەیە بەئایەتی ((قل هو الله احد،الله الصمد)) الاخلاص/١-٢.

(٤) سوقرات: فەیلەسوفێکی یۆنانیە و لە ٤٦٩ پ.ع لەدایکبووە، هەموو زانیارەکانی سەردەمی خۆی زانیوە بەتایبەتی لە زانستی ڕەوشتدا دەستێکی باڵای هەبوە. لەئەنجامدا بەتاوانی تێکدانی ڕەوشتی گەنجان تاوانبارکراو جامێ زەهری نۆش کرد. المدخل الي الفلسفة، صدام زيادى، ج١،ص١٦٧.

ئەفلاتوون: فەیلەسوفێکی یۆنانییە و شاگردی سوقرات بووەو مامۆستای ئەرەستۆ بووە. لەسەردەمی ئەردەشێری کوڕی دارا لەدایك بووە لەساڵی (١٦)ی دەسەڵاتیدا و لە خانەوادەیەکی ئەرستقراتی بووە. المدخل الى الفلسفة/ص١٨٧.

ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە ((تفكروا في خلق الله و لا تفكروا في الله)) فيض القدير، ج٣، ص٢٦٣.

(٥) ئاماژەیە بەم ئایەتە ((ان ربكم الله الذي خلق السماوات و الأرض في ستة ايام ثم استوى علي العرش يغشى الليل النهار يطلبه حثيثا والشمس والقمر مسخرات بأمره الا له الخلق والأمر تبارك الله رب العلمين))الأعراف/٥٤.

٦- ئەو سەرا پەردەی لەسەر ئەو شکڵە داتەمرزاندووە

چۆن موهەندیس وا دەزانیتن بە عیلمی نــارەوان[1]

٧- گومبەدێکی وا بڵند پان و بەبێ تـــاق و عەمـــوود

چۆن بەبێ تێکچون وەها وەستاوە چەند ساڵ وزەمان[2]

٨- وەك ئەلەتریکی لە شوقە بۆ ملوکان هەڵگـــرێ

وایە مانگی چاردە شەو بۆ چاوەڕێی بەزمی شەوان[3]

٩- شەو کە وەك زوڵفی حەبیبان کەوتە سەر ڕووی ڕۆژەوە

جابەترس و لەرزەوە خۆدەردەخەن ئەستێرەگـــان[4]

١٠- وەك لەنێو ئەوقەسری واپیرۆزە ڕەنگ دەردەخات

بووکی نۆ ڕۆژی سەما دێنە سەما پیر و جـــەوان[5]

١١- ئاه و دوودی عاشقانە دەبتە هەوری ژێر فەلەك

قەترە فرمێسکی دووچاوی عاشقن بارانەکان[6]

---

(١) ئاماژەیە بەم ئایەتە ((ویسئلونك عن الروح قل الروح من أمر ربي وما أوتيتم من العلم الل قليلا))الاسراء/٥٨ هەروەها ئایەتی ((الذي أحسن كل شيء خلقه و بدأ خلق الانسان من طين))السجدة/٧.

شاعیر کە دەڵێ (عیلمی نارەوان) چونکە ئەو جۆرە زانستە بەتەواوی سەری لە خولقێنراوەکانی خودا دەرناچێ.

(٢) **گومبەد:** لێرەدا مەبەستی ئاسمانە. ئاماژەیە بە ئایەتی ((الله الذي رفع السماوات بغير عمد ترونها........))الرعد/٢.

(٣) **ملوکان:** پاشاکان، دووجار کۆکراوەتەوە، جارێ بەپێی دەستوری زمانی عەرەبی: (ملك – ملوك)، جارەکەی دی بەکوردی و (ان)ی کۆی خراوتە سەر. ئاماژەیە بۆ ئایەتی ((وجعل القمر فيهن نوراً وجعل الشمس سراجاً))النوح/١٦.

لەنێوان ئەلەتریك و مانگدا لێکچواندنی سادە هەیە. وشەی (لەشەوقە) لەنێوە بەیتی یەکەم واتای تەواو نابەخشێ و (لەشوقە) تەواوترە، چونکە لەدەستنوسەکە ئاوا نوسراوە.

(٤) لەنێوان (شەو و زوڵف)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.

(٥) **پیرۆزە:** بەردێکی شینی بەنرخە ئەکرێ بەنقێم. فەرهەنگی خاڵ ل

لەنێوان(سەما و سەما)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.

(٦) **دوود:** دووکەڵ واتا: ئاخ و هەناسە و دووکەڵی جەرگی برژاوی دڵدارانە دەبێتە هەورو بارانەکەش ئەشکی چاویانە. لێرەدا لەنێوان (ئاه و دوود و هەور)دا وێنەیەکی هونەری جوان هەیە. هەروەها لەنێوان (فرمێسك و باران) لێکچواندنی جەختاو هەیە.

١٢- وەك زەمین فرمێسکی چاوی عاشقانی پەڕیە سەر
زۆر بەدڵ گەرمی و بەنەرمی دەنگ دەکاتە دولبەران[١]

١٣- جابەجارێ ئەو کڵووك و ئەو گـــوڵانەی مردبــوون
دێتە دەر سەریان لەخاك زەردوزەعیف وەك مردووان

١٤- ڕۆژ بە ڕۆژ نازونەزاکەتیان لە ڕوو زێتر دەبـــێ
تاکو دەبنە مەنزەری بەرچاوی مەنزەرپەروەران

١٥- سەیـــــری نەورۆز و بەهاری خاکی کوردستان بکە
گەردەنی خۆت هەڵبکێشە سەیری شاخ و داخەکان

١٦- نەوجەوانانی بەهارت دێتە بەرچاو جێین بەچن
نازك و نازدار و بێگەرد هەروەکو ڕووحی ڕەوان[٢]

١٧- عەکسی ڕەنگی ئەو گیایانە کەوا لێکتر نـــەدەن
چاو دەبێ شۆڕکا ئەگەر تاوس موقابیل بێ بەوان

١٨- شایی شێخانی دەکەن وەقتێ کەبایان لێـــــدەدا
چاو تەماشایان دەکا و دڵ سەربەخۆ دێتە هەژان

١٩- ئەو دەڵێی لێوی بەخوێنی عاشقان سۆرکردووە
ئەو دەڵێی جامی شەرابە چاوەکەی بۆ عاشقان[٣]

٢٠- ئەو سەراسەری ئەتڵەسی سەزموی لەبەر خۆی کردووە
مێزەری زەرد و سپی ناوە لەسەر حاجیلەکـــان[٤]

٢١- ئەو خەناوکەی شەبنمی کردۆتە گەردەن خۆی لەشەو
ئەو لەسەر خۆی لادەبا پەردە لەگەڵ بایی بەیــــــان[٥]

---

(١) **وەك**: کاتێ کە. لەنێوان (گەرمی و نەرمی)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.
(٢) **نازك**: ناسك. ئەوەی ڕاستی بێ (ناسك)ڕ استرە لە (نازك) چونکە دەنگی (ك) کپەوزیاتر لەگەڵ (س) دەگونجێ کە ئەویش کپە.
(٣) **لەو**: مەبەستی لەکوڵیکە لێواری سوور بێت
(٤) **لەتڵەس**: لێرە مەبەستی قوماشی سادەیە. واتا: حاجیلەکان کەزەردوسپین وەکو مێزەری حاجیەکان وان. **مێزەر**: کەشیدە، کوڵی.
(٥) **خەناوکە**: ملوانکە. **شەبنم**: شەونم، خوناو.

٢٢- تێــکەڵاون دەست لەمـــل یێك لێو وزار پڕ پێکەنیـــن
چاوڕەش و ڕوومەت گەش و ڕووبێ نتیقاب وەك مۆدەکان[١]

٢٣- بـــا کە نایەی لێدەدات و ئاسمان دۆل لێدەدا
دەبتە شایی و هەڵپەڕینیان هەرومکو کیژوکوڕان[٢]

٢٤- هەرومکو حەوزی حەمامە بۆ ئەوان هەوری بەهار
ئاو بەسەریان دادەڕێژێ خۆدەشۆن پاشی گەمان[٣]

٢٥- کاکی خۆم دووبارە چاوت هەڵبڕە سەیرێ بکە
پڕ بەچاو بنوارە بەرزی بەژن و باڵای کێوەکان

٢٦- زۆر بە ئاهەستە بڕۆ تا دەچیە سەر تۆقی سەری
پێ بپارێزە،مەفنجێنە بەپێ ڕوویی گوڵان[٤]

٢٧- تاجی شاهانی لەسەرناوە وەکو بەفری سپـــی
تا هەموو کەس تێبگاتن دوژمنی ئەو ڕووسییان[٥]

٢٨- گەر لەپاش باران لەگەرووان وردە وردە سەرکەوی
دێتە بەرچاوت وکو کاشی نقوشی بەردەکان[٦]

٢٩- هەرومکـــو ڕووح وایـــە ژێر گیایان پاك و ڕوون
هەردەڵێی ئاوی حەیاتە ئاوەکەی نێو هەرکەوان[٧]

---

(١) نیقاب: سەرپۆش.
(٢) واتا: دەنگی با وەکو شمشاڵە و دەنگی هەوریش وەکو دوڵ لێدانە، هەرکە گوڵەکان گوێیان لەم دوڵ و زوڕنایە بوو سەربەخۆ وەکو کچ و کوڕ دەست بەشایی دەکەن.
لێرەدا نایە لێدانی با و دوڵ لێدانی ئاسمان خوازەنە و وێنەیەکی هونەری جوانیان پێکهێناوە و جۆرێکە لە (حسن التعلیل) واتا: جوانی هایس
(٣) لەنێوان (حەوزی حەمام و هەوری بەهار)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
گەمە: وازی، یاری. ئەم وشەیە لە(game)ی ئینگلیزیەوە نزیکە.
(٤) ئاهەستە:هێواش،هێدی،لەسەرخۆ.
(٥) لەنێوان(تاجی شاهان و بەفری سپی)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
ڕووسیا: ڕوو ڕەش. لەنێوان (بەفری سپی و ڕووسیا)دا دژیەك هەیە.
(٦) گەرووان: کۆی (گەروو)ە، بەواتی سەرووی شاخ.
نقوش:کۆی(نقش)ە بەواتی نەخش و نیگار. لەنیوان (کاشی و نقووشی بەردەکان)دا لێکچواندنی سادە هەیە.
(٧) لەنێوان (ڕووح و ئاوی ژێر گیا)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
هەرکەوان: کۆی (هەرکەو)ە بەواتا:ئەو چاڵ و قۆرتەی کە لەشاخدا هەیە و پاش باران بارین ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە و گیانداران لێی دەخۆنەوە.

٣٠- ئەو کەوانەی والەسەر کەپکان خەریکی قەپ قەپـــن
زۆر لەدەنگی مۆسیقا و عوود خۆشترە دەنگی ئەوان[١]

٣١- دولبــــەری تۆراوە لێی بانگی دەکا بێدۆزتەوە
هەردەسوڕێ تادەکەوتە داو و بەندی تۆڕەوان[٢]

٣٢- وردە وردە چەند بە شیرینی لەسەر بەردان دەڕۆن
گەردەنی خۆیان لەڕۆیین هەڵدەکێشن سوسکەکان[٣]

٣٣- هێندە بەهێز چاپوکن گەر بێ لەناکاو هەڵفڕێ[٤]
دوور نییە باز بەربداو دەستکا بەبازان بازەوان[٥]

٣٤- سەیری بەرشاخان بکە هەرکۆترە دێت و دەچـــێ
گرمەگرمی کۆتران خۆش دێتە بەر گوێی دڵ کولان[٦]

٣٥- ڕەو دەکەن،دڵ شەق دەکەن،وەك دێ شەقەی باڵیان لەبەر
هـــاتە هـــات و هـاژەهـاژی دەنگی ساچمـــە و ڕاوچیـــان[٧]

٣٦- سەیری ئەو حەیوانە کێویانە بکە چۆن پەرت بوون
هەرکەسە ڕووی خۆی لەلایێ کردووە وەك ئەشقییان[٨]

٣٧- نووسکە نووسکی توولە دێت و ڕێویە وا پێچ دەکا
هـــانە هانی تاژیان دێتن لەدوو کێروشکـەکـــان[٩]

٣٨- هەر سوارە تۆز ئەکاتن وا لەدوو نێچیری خۆی
شیو و چۆم ناپرسی،ناکاتن خەیاڵی وەرگەڕان[١٠]

---

(١) کەپکان: کۆی (کەپك)ە بەواتا:لوتکەی چیا. قەبقەب:دەنگی کەو.
(٢) تۆڕەوان: ناوی بکەرە، ئەوەی تۆڕێ (داوی) ڕاو دەنێتەوە.
(٣) سوسکە: مەلێکە وەك کەو بەڵام بچوکترەو گۆشتی خۆشترە. فەرهەنگی خاڵ/ل ٨١
(٤) لەدەستنوسی شاعی(هەڵفڕی)ە، بەڵام (هەلفڕن) ڕاسترە.
(٥) بازەوان: ناوی بکەرە، ئەوەی باز ڕادەگرێ. لەنێوان(باز و باز)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٦) گرمەگرم: لێرەدا مەبەست دەنگی خوێندنی کوترە و زیاتر (گمە گم)ی پێدەڵێن.
(٧) ڕەودەکەن: بەڕەوە و کۆمەڵ دەڕۆن. ساچمە: قرمە:تفەنگی ڕاوکەر، تاپڕ. لەنێوان (هاتە هات و هاژە هاژ) دا لەگەڵ (ساچمە و راوچی)دا پێچە و بەخشی نارێك هەیە.
(٨) ئەشقیان: چەتە.
(٩) نوسکەنوسك: دەنگی تولەیە. هانە هان: دەنگی تانجی کاتی ڕاکردنی زۆر.
(١٠) شیو و چۆم:کەندولەند. وەرگەڕان: گلان.

٣٩- بابچین ئەوجا دەمێ سەیرێکی دەوزێیان بکەین
بابزانین چۆنە سەیر و دیتنی دەوناوەکـــــان[1]

٤٠- چاوەکەم ئەی ناوی شیرین بۆچی ناوەستی دەمێ
زۆر لەمێژە ئارەزوومان دیدەنی تۆیە بەجان

٤١- ئەو مەڵانەی تۆ کەگەورەت کردوون گەر تۆ بڕۆی
وەك هەتیو لێرە دەمێنن تێك دەچێ هێلانەیان

٤٢- هەستی خۆت ڕابگرە ساتێ ئاگرت تێبەردەبـــــی
هێند بەدڵ گەرمی دەناڵێنن دەمێ نادەن ووچـان

٤٣- ئەو دەڵێ تیتی کەناچە پڕبەدەم هاواردەکــــــا
چەند غەریب و چەند بەسۆزە دەنگی تیتڕواسکەکان[2]

٤٤- ئـــاوی شیرین چەند بەشیرینی جەوابی دایەوە
من کە خاکی خۆم بەجێدێڵم لە ڕق خزم و کەسان

٤٥- ئێـــــوە بێگانە پەرستن خوێن مژن بۆیەکتری
ڕووحی خۆتان،خاکی خۆتان ناوێ بۆ بێگانەکان

٤٦- نۆکەری بێگانەکان وەك ئێوە ئەمنیش نابکەم
تێبگەم چۆنە لەگەڵ بێگانە هەستان و ژیـــان

٤٧- تف لە ژینێکی لەگەڵ دوژمن بەچاوشۆڕی بکـــەی
بەس لەبۆژن خۆشییەژێری و لەسەر پشت ڕاکشان

٤٨- بابڕۆین دەوناو و دەوناو ڕووبەڕووی دەشتی قەراج
دڵگـــــرە وەقتی بەهاران،خۆشە بۆ دەفعی غەمان

٤٩- سەیری ڕێگایان بکە هەر کۆچ و کۆچبارن ئەڕۆن
چەندشل و خاون تەماشا،خانم و خاتوونەکـــان

---

(١) **دەوزێ**: قەراخی زێ.
(٢) **لیق**: دەنگی خوێندنی کەناچەیە. **کەناچە**: پۆڕ.
**تیتڕواسك**: باڵندەیەکی لاق درێژ و لاوازە و لە قەلەڕەشکە بچوکترە.

٥٠- هەردەڵێی ڕۆژن لەسەر کێوان واپڕشنگ ئەدەن

ئەو کچانە بارگە بەستراون لە هێستری بارەبان[(١)]

٥١- زۆر لەمێژە والەڕێگادا دەڕۆین و ماندوو بووین

با لەگردی گردەشێر ئەوشۆ بخەین بارخانەمان[(٢)]

٥٢- سەیری ئەو دەشتی وەها پان و بەرین کە سەربەسەر

ڕەش دەچیتن وا لەبەر ڕەشماری کورد و عارەبـــان

٥٣- شەو لەسەر گردی بوەستی،سەیری هەرچار لا بکە

ئاگری سەرکێوی تووره،ئاگری ڕەشمارەکان[(٣)]

٥٤- تا سعات پێنج وشەشی شەو کیژ و کوڕ تێکەڵ دەبن

دەچنە ژێر عەرشی فەلەك،دەنگی بلوول و نایەیان[(٤)]

٥٥- شەودرەنگە وەقتی خەوتن هاتووە،با پەرتەکەین

دۆل دڕاتەقەی براڕوو بکەینەوە سەر جێگەمان[(٥)]

٥٦- سا ئەوەی یاری هەبێ ئاچێتەوە بۆ ماڵەوە

کۆری دانەڕژاوە هێشتان تا ئەچێتە جێی ژووان[(٦)]

٥٧- حەیفە بۆ ئەو ئەونەمامانەی کە یارێکیان نییە

شەو لەگەڵ غەم دەست لەمل یێکتر ئەکەن تاکو بەیان

---

(١) هێستری بارەبان: ئەو هێسترەیە کەباری لێ دەنرێ و لەهێستری ئاسایی گەورەترە.

(٢) گردی گردەشێر:گردێکە نزیك گوندی گردەشێری قەراج و لەئاقاری گوندی (شریعە)یە. بارخانە: کۆچبار.

(٣) لەنێوان (ئاگری ڕەشمار و ئاگری کێوی توور)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە.

ئاگری کێوی توور:مەبەستی نووری خوایە و ئاماژەیە بۆ ئایەتی ((ولما جاء موسى لميقاتنا و كلمه ربه قال ربى ارنى انظر اليك.قال لن تراني ولكن انظر الى جبل فان استقر مكانه فسوف تراني.فلما تجلى به للجبل جعله دكاً وخرّ موسى صعقا فلما افاق قال سبحانك تبت اليك و انا اول المؤمنين))الأعراف/١٤٣.

(٤) بلوول: بلوێر. نایە: شمشاڵ

(٥) لێرەدا شاعیر ئەم پەندە کوردییەی (دوڵ دڕا تەقەی برا)ی ئاخنیوەتە ناو بەیتەکە و ڕازاندویەتیەوە.

(٦) کۆڕ: کوڵ وەکو: کوڵی دڵی دامرکایەوە.

٥٨- سا کەهات و شەو زرینگاوە ئەتوو گوێ ڕاگرە
بۆ شەوین دەڕوا دەکاتە فیتە فیت کاکی شوان[1]

٥٩- بانگی کابانان دەکاتن شەو درەنگە هەستنەوە
سا لەجێگا دێنە دەر دەبتە زرینگەی بازنان

٦٠- سەیری ئەو چاوە ڕەشەی تێرنەبووە هێشتاکو لەخەو
سەیری ئەو لێوانە کە هێشتا نەکەوتوینە قســــــان

٦١- زوڵفەکەی وەك عوود لەسەر پشکۆیی ڕووی وا بۆن ئەدا
هەرکە سنجاقی ترازا بێ بکەسەیری مەمـــــان[2]

٦٢- سینەکەی وەك سینییەکی زیوە ساف و بێ غەشە
جۆتە فنجانێکی زیوین و سەرەوژێر وا لەبان[3]

٦٣- گفتوگۆی وەسڵ و عیتابە تامی شەکر و قاوەیـــە
وەك شەراب ئەمما دەکا سەخۆش وەمەست پیروجەوان[4]

٦٤- ئەو دەچی کابانی نانە دەست بە ئاردبێژتن دەکا
ئارد نییە هەر ڕووحە ئەیبێژێت و دەیکاتن بەنان[5]

٦٥- ئەو لەبۆ لای مەنجەڵی ماست وادەچی مەشکە لەدەست
سەیری وەك مەشکەی دەژینێ دڵ دەکاتن پڕ لە ژان[6]

---

(١) شەو زرینگاوە: شەو درەنگ داهات. شەوین: چوونی شوانە بۆ مەڕ لەوەڕاندن لەبەیانیان زووەوە.

(٢) عوود: دارێکی قاوەیە کەلەسەر ئاگر دادەنرێ بۆنێکی خۆشی لێ دێ. تێکسق ئەدەبی کوردی/د.محمد نووری عارف، ل١٨.

لەنێوان (زوڵف و عوود)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە، هەروەها لەنێوان (ڕوو و پشکۆ)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە.

سنجاق: قرکێتە، دەرزی قولابە. واتا: چۆن عوود کەکەوتە سەر ئاگر بۆنێکی خۆشی لێدێ، ئاواش زوڵفەکەی یار وەکو عوودە هەرکە دەکەوێتە سەر ڕووی کەوەکو پشکۆی ئاگرە بۆنی خۆشی لێدێت.

(٣) سینە: سنگ، سینگ.

(٤) لەنێوان (وەسڵ وعیتاب و شەکروقاوە)دا پێچەوبەخشی ڕێك هەیە،وەسڵ بۆ شەکر و عیتاب بۆ قاوە.

(٥) لەنێوان (ئارد و ڕووح) دا لێکچواندنی جەختاو هەیە.

(٦) مەشکە: لەپێستی مەڕ یا گاومانگا دەکرێ دوای ئەوەی خۆشەی دەکەن.

٦٦- ئەو دەمەی با دێ کەچارۆگەی لەسەر سەر لادەدا
ناتوانێ ڕۆژ بکا سەیری خەزێم و گوارەکان[١]

٦٧- ئەو هەوارە کۆن بووە با بۆ گۆمی(مارواشان) بچین
جێڕەوی قازوقورینگانە لەگەڵ پۆڕوسییان[٢]

٦٨- هەر کە بۆناو دێنە سەر ئەوگۆمە چین چین کیژوکوڕ
نایەتە بەرچاوی هیچ کەس مەنزەڕی ئەوها جوان

٦٩- هەرکوڕە حەیران دەڵێت و هەرکچە تواهوو دەکا
هەروەکو سەرخۆش دەسوڕێن کۆمەڵی کیژوکوڕان[٣]

٧٠- هەروەکو غونچە دەپشکوون ئەو کچانەی غونچە دەم
کوڕە وەکو بولبول چریکەی دێ لەدەوری سۆرگوڵان[٤]

٧١- بۆ جەڕە و بۆکوندە پڕکردن لەلای خۆ هاتـــــوون
کوندەیە وا شەق دەبات و جەڕەیە دێتە شکان[٥]

---

(١) لێرەدا جۆرە پێوەنانێك (مبالغە)هەیە کە ڕۆژ نەتوانێ سەیری خەزێم وگوارەکان بکا و جۆرێکیشە لەجوانی بایس.

(٢) مارواشان: گۆمێکی خۆشە لەقەراج لە بستی (شەواشینکێ)یە.
گۆڤاری بەیان، ژمارە: ١١٢، ل٥٠.
مارواشان: پێشان گۆم بوو لەخوارووی مەخموورەوئێستا گوندێکە، لەسەرەوەی دێی خەرپانییە، لەخوارەوەی دێی حەدیقەیە. ئەم زانیاریەم لە (حاجی مستەفا تەها) وەرگرت کە ئامۆزای مرخلیسە و خەڵکی مەخموورە.
پۆڕ: پەلەوەرێکی دەشتییە بەزۆری لە گوێ ئاو و ناو شینایدا ئەژیت،کونج ڕەو و گۆشت خۆشە بەقەد (کەو) ئەبێت.
سی: جۆرە قازێکی کێویە.

(٣) تواهوو: هاندانی حەیران بێژە لەدوای هەر بەندێك بۆ بەردەوامبوونی.

(٤) لەنێوان (غونچە و دەم) دالێکچواندنی جەختاو هەیە. لەنێوان (کوڕ و بولبول)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
سۆرگوڵ: مەبەستی کچی وەکو گوڵی سوورە.

(٥) جەڕە: پێشان لەقوڕ دروستیان دەکرد و لەکوورە سووریان دەکردەوەو ئاویان تێدەکرد.
کوندە: لەپێستی ڕەشان(بزن) دوای غاراندنی دروستدەکرێت،ئاوی تێدەکرێ و لەکوندەڵان دادەنرێ و ئاوەکە سارد دەبێت و جاروبار جەفتیشی تێدەکرێ بۆ پاراستنی پێستەکە.
مرخلیس لەبەیتی دووەم (کوندەیە واشەق دەبات و هەرجەڕەیە دێتە شکان) لەجیاتی ئەوەی بڵێ: جەڕەدەشکێ،لەبەر پێویستی سەروا پەیڕەوی لایەنی ڕێزمانی دیالێکتی کرمانجی ژووروی کردووە و کردوویەتە(جەڕە دێتە شکان).

٧٢- ئەو وولاخی بەردەبێت و ئەو خلیسکێکی دەبا
دەبتە قاقای پێکەنین و گۆتن و چەپڵە کوتان

٧٣- ڕۆژ کە هاتەخشخۆکێ بەرەو ماڵ ئەخشن هەموو
سەیری بەزمی ڕێ بکە تا دەچنەوە نێو هۆبەیان[1]

٧٤- بەزم و ڕەزمی وا لەلوبنان و لەئەوروپا نییـــە
ناتوانێ وەسفی ئەو بەزمەی تەواوکا هیچ زمان

٧٥- تا بەهار کۆتا دەبیتن ڕۆژوشەو ئەوها دەکـــەن
(موخلیسا) خۆشە هەڵای کیژ و کوڕی سۆرانییان

---

(١) خشخشۆکێ: مەبەستی خشینی ڕۆژە بەرەو ئاوابوون.
هۆبە: بنە گەورەرەشماڵی مەڕداران.

# بەهاری دەشتی فەراج[1]

کاتی گوڵ و موڵ هاتەوە یەعنی کە بەهارە[2]
بولبـــول دەچریکێنێ برینداری نیـــگارە
سەحـــرا وەکو تاوس وەیە خەملیوە دیارە[3]
چـــۆن پڕبووە ئەمڕۆ لە کچی گوێ بەگوارە
کـــێ گەردەنی گەردەنلغی تێدا نەوە یارە[4]

پیر بوومە گەچی دەم دەمە دڵ دێتە خەیاڵان
سەرکێشی دەکا مەیلی لەبۆ لای کچ و کاڵان[5]
مەست بووم لەقەراجی بەهەوای دیدە غەزالان
وەك جەننەتە ئەمڕۆکە لەبەر حۆری میسالان
هەڵدەستێ هەناسەم وەکو دوو کەڵ لەجغارە[6]

---

(١) ئەم پێنجینەیە عەلی فەتاح دزەیی لەنوسینێکی بەناونیشانی (سێ گوڵ لە باخی لاوانەوە)، لەگۆڤاری کاروانی ژمارە ٣٨ ی ساڵی ١٩٨٥ بڵاوکردوتەوە و.
**لەبەحری هەزەجی هەشتی لەخرەبی مەحزووف:** مفعول،مفاعیلن، مفاعیل، فعولن.

(٢) **گوڵ وموڵ:** گوڵ و شەراب.

(٣) **خەملیو:** رازاوەتەوە. **سەحرا:** بیابان،مەبەستی دەشتی قەراجە.

(٤ ) **گەردەن لغ:** ملوانکە، پاشکۆی (لغ) تورکییە، خشڵێکی زێڕە لە ملوانکە گەورەتر و پان و پۆڕترە. عەلی فەتاح، سێ گوڵ لەباخی لاوانەوە، ل٥٥.

(٥) **سەرکێشی:** رکەبەری، یاخیبوون.

(٦) لێرەدا شاعیر وێنەیەکی شیعری نایابی داهێناوەوهەناسەی خۆی بە دووکەڵی جغارە چواندووە. شاعیر لەم پێنجینانەدا لەزۆر شوێن پەیڕەوی شێوازی هیندی کردووە و یاری بە(کار)ی بەیتەکان کردووە و لەبەر پێویستی شیعری جێی گۆڕیون و بەبەرلادانی ڕێزمانی کەتون. بۆ نمونە لەم بەیتەدا بەپێی ڕێزمان بەمجۆرە وشەکان ریزدەکەین:
(هەناسەم وەکو دوکەڵ لەجغارە هەڵدەستێ) لێرەدا جوانی هونەریی نامێنێ و دەبێتە رستەیەکی ئاسایی و ڕەنگوبۆی شیعر نادات.

چین چین کەدەچن وەك ڕەوە مامز لەبۆ سەرئاو[1]
بەو پەرچەم و ئەگریجە و زولفی وەکو خاوخـــاو[2]
بـــەو قامەتی وا بەرز و شلك هەروەکـــو لاو لاو[3]
هیـــچ حەق نییە لۆمەی بکرێ گـــەر بپسێ لاو[4]
بــــۆ ڕاوی ئەوانـــە دڵەکەم چەندە ســـوارە

وەختـــێ کەلەسەر گۆمەوە گەردەبنەوە ئەمجـــا
ڕەنگ ڕەنگ لەهەموو ڕەنگەوە وەك حاجی لەحەجدا[5]
ئەو کیژ و کوڕانە دەگەڕێن عاشق و شەیـــــــدا
هەر پارچە بەهەشتێکە لەوێندەر بووە پەیـــــدا
خاڵی لەغەمە هەروەکو ئەتڵەس لەستـــــــــــارە[6]

ورد ورد کە دەڕۆن بەم[7] سەری پەنجانە چ شەنگن[8]
چاوبازن و پڕنازن و غەمماز و چەلەنگـــــــن[9]
لێویان لەتەبەسسوم بەمەسەل غونچەیی تەنگن
دائیم بەبرژانگ و بەبرۆ مائیلی جەنگـــــــن
سینەم لەبرین پڕبووە دەرچوو لەژمـــــــارە

---

(١) ڕەوی مامز: کۆمەڵی ئاسك. ئاسك عادەتیانە بەڕەوە دەچن بۆ ئاوخواردنەوە، کچەکانیش بەهەمان شێوە بۆ ئاوخواردنەوە و ئاوهێنان دەچن.
(٢) خاو: جۆرە گیایەکی گوڵ زەردی بۆنخۆشە. خاو: پەرش و بڵاو.
لەنێوان (خاو و خاو)دارەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٣) بەرزوشلك: بڵندو بەناز لەهاتووچوندا. لێرەدا (شلك) جوانییەکی زۆری پێبەخشیوە و ناز ونەزاکەت دەنوێنێ. لەنێوان (قامەت و لاولاو)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
(٤) بپسێ: بڕێ (ئایبەتە بۆ مرۆڤ و ئەو گیانلەبەرانەی کە زۆر دەبەزن)، کاتێ زۆرماندوو دەبن دەڵێن: پسایە، لەدڵداری و ماندوبونێکی زۆردا.
(٥) ئاماژەیە بەم ئایەتە ((و أذن في الناس بالحج يأتوك رجالاً و على كل ضامر يأتين من كل فج عميق))الحج/٢٧.
(٦) ستارە: ئەستێرە. ئەتڵەس: پارچەو ئاوریشمی سادەیە، ئاسمانی نوێەمینە کە بەبێ ئەستێرەیە. فرهنگ سعدی، حامدی ربانی، تهران ١٣٤٥شمسی.
واتا: چۆن ئاسمانی حەفتەم کە ئەستێرەی لێ نییە،لەو سەر گۆمەش ئەوندە خۆشە هیچ خەمی لێ نییە.
(٧) بەم: واتا بەئەم، ئەگەر (بەو) بێ لەڕووی ڕێزمانییەوە ڕاسترە.
(٨) چ شەنگن:چەند جوانن.
(٩) غەمماز: هێماکردن بەچاووبرۆ. لەنێوان (باز و ناز)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

بێری کەلەبۆ بێر دەچێ خۆی وا دەشلێنی[1]
وەك ئارەقــە سەرتابەقەدەم ناز دەرژێنێ
عەییارە هومای پیرو جەوانان دەرفێنـــێ[2]
چۆن دەمری شوان بێری لەبەر بێر دەدوێنێ
جێی ئیمەیە سەر بێر لەشوان زێدە خەستارە[3]

جۆت جۆت لەبەرامبەر یەکەوە مەشکە دەژینن
هەر حەفت تەبەقەی ئەرزوسەما ڕادەهەژێنـن
قاقا بەقسەی خۆشەوە پێك پێ دەکەنینـــن[4]
سونعی ئەزەلینە ئەوەکو سوورەتی چینـــن[5]
بنوارە ئەوەی کەمبەر دار چەند شـــەدەلارە[6]

ئەو تاقمـــــە مومتازە کەوا دێنە زیـــارەت
زۆر دوورنییە بێن جوملە مەلایك بەنەزارەت[7]
هەڵدەسنەوە مردوو دەدەنە یەکدی بەشارەت[8]
وەك دوژمنی دین وانە دەبەن دین بە فەتارەت[9]
پێکیان لەگـــەڵە وای لەگەڵم چەند بە پلارە[10]

---

(١) بێر: مەڕدۆشین. دەشلێنێ: یەنەتقەست بە شەلین دەڕوات.
(٢) عەییار: ژنی زۆرزان و فێڵباز. هوما: مەلی بەختیاری،لێرە بە واتای بیروهۆش دێت.
(٣) سەربێر: ئەو شوێنەیە کە شوان لەسەری دادەنیشێ و سەری مەڕ بۆ کچە بێری دەگرێت تا بیدۆشێت. ئەو شوێنە یالەدوو پارچەداری دوو لق دروستدەکرێت یاخود بە قوڕوخشت بەقەد نیو مەتر بەرزایی، یان لەدەشت بەردێکە پێی دەڵێن: بەردەبێر. لێرەدا موخلیس ڕەشك وحەسوودی بەشوان دەباوئاواتە خوازە خۆی لەشوێنی ئەوبێ، ئەمەش بیرۆکەیەکی ناسك وتەڕوپاراوەودابەزینێکە لە پایەی کۆمەڵایەتی خۆی، بەڵام دڵداری پلەوپایە نازانێت.
(٤) پێك: کورتکراوەی(یەکتر)ە. ئەلەمۆرف مۆرفیمی (یەك)ە.
(٥) سونعی ئەزەلی: دەستکردی خوایی. واتا: ئەو کچ وکاڵانەی کەلەبەرامبەر یەکدی مەشکە دەژینن، هێندە نازدارونەشمیلن، خوا ئاوا بەجوانی خولقاندویانی دەستکردی وێنەگری چینی نین (چین لەکۆنەوە بەوێنەکێشانی نایاب ناوبانگی هەیە).
(٦) کەمبەرە: بریتیە لە پشتێنێکی زیو کە قاش وپلپلەی پێدا دێتە خوارەوە.
(٧) مەلایك: فریشتەکان.
(٨) واتا: کەکچەکان دێنە زیارەتی (سوڵتان عبدوڵا)مردووی گۆڕستانەکە لەگۆڕ ڕاست دەبنەوەومزدە دەدەنە یەکدی بەهاتنیان.
(٩) دەبەن دین بەفەتارەت: فرمانی(دەبەن) خراوەتە پێش و جێی خۆی کۆتایی ڕستەکەیە (دین بە فەتارەت دەبەن) واتا: دین لەناو دەبەن ئەمەش شێوازی هێندیە لەئەدەبدا.
(١٠) پێکیان: یەکێکیان. پلار: توانج، تەوس.

ئەم مەرقەدە ئەمرۆ گەومکو بەیتی خودایە[1]
عالەم دەجمیٚ هەرکەسە مەشغولی دوعایە[2]
یـــاری بەوەفام ئەودەمە ئەمنی لەدڵایـــە
یارەب دڵـی مەشکێنەدڵی قەت نەشکایـە
مەخسووس لەهەموو جەوری زەمان بیدە چەپارە[3]

ڕازاپتەوە هەرکەس بەهەموو چەشنیٚ بەزینەت[4]
وەك ڕۆژ دەتریسکێن هەموو لاوچاك و بەشەوکەت[5]
کیٚ بیٚ کەبەتاس تاسی نەکەن نەیخەنە حیرەت[6]
هەرکەس هەبیٚ زەوقی دەبیٚ مەجبوور بەمەحەببەت
جـــەرگی منی برژانـــدووە ئەو لاســـەرەدارە[7]

وەك یووسفی ساحێب حەشەم و جاە و جەلالن[8]
تاقن لەمەلاحەت هەموو سوڵتانی جەماڵـــن[9]
لێوئاڵی عەقیقن بەبرۆ عەینی هیلالـــــــن[10]
وەك ئەهلی بەهەشتن قسەخۆش و بەکەماڵن[11]
کامەی کەمە سەر ڕوومەتی وەك دەنکی هەنارە[12]

---

(١) مەرقەد: ناوی شوێنە، واتا جێی ڕاکشان، مەبەست گۆڕی سوڵتان عەبدوڵایە. بەیتی خودا: کەعبە کە لەمەککەیە.
(٢) دەجمیٚ: بەیەکدا دەچیٚ.
(٣) چەپارە: لە وشەی (چەپەر)ەوە هاتووە کە پەرژینی باخە.
واتا: پارێزگاریکردن، پاراستن.
(٤) زینەت: ڕازاندنەوە، ئارایش.
(٥) شەوکەت: لێهاتوویی.
(٦) لەنێوان (تاس و تاس)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٧) لاسەرە: جۆرە خشڵێکە ژن لەلایەکی دەسرۆکی سەری دەدات.
عەلی فەتاح،کاروان، ژمارە: ٣٨، ل٥٥.
(٨) یووسف:کوڕی حەزرەتی یەعقووبە. حەشەم: دەست و پێوەند. جاە و جەلال: پلەپایەی بەرز.
(٩) مەلاحەت: جوانی.
(١٠) عەقیق: بەردێکی بەنرخی سوورە. لەنێوان (لێو و عەقیق)دا لێکچواندنی جەختاو و لەنێوان (برۆ و هیلال)دا لێکچواندنی بەرەڵا هەیە.
(١١) ئاماژەیە بەم ئایەتە ((لايسمعون فيها لغواً ولا تأثيماً الا قيلاً سلاماً سلاما)) الواقعة/٢٥-٢٦ هەروەها ((لايسمعون فيها لغوا ولهم رزقهم فيها بكرة و عشيا))مريم/٦٢.
(١٢) لێرەدا جۆرە لەرادە بەدەرییەك هەیە کە ئاشیرنەکەیانی کردوکە هاوتای دەنکی هەنار، واتا: کوڵمی بەدەنکی هەنار چواندووە لەخڕی و سووری و بریقەداریدا. لێکچواندنی بەرەڵا لەنێوان (ڕوومەت و دەنکی هەنار)دا هەیە.

دەیکەم بەفیدای دەشت و قەراج پاریس و لوبنان[1]
پێشکێشی دەکا ئەهلی تەبیعەت هەموو ئێران
سەردەفتەرە لەم فەسڵە لەگەرمێن و لەکوێستان
جێی فەخرە لەڕووی دوژمنەوە بۆ گەلی کوردان
نایەمن بە چ کەس تاوەکو نەدرێن لەقەنارە[2]

جێگایەکە وەك شامە لەخێروبەرەکەتدا[3]
برپاری لەیەك تاوەکو سەد وادەبێ دەڕوا[4]
گەنمی چ گەنم وەك گەنمی ئادەم و حەووا[5]
جۆی بۆ ڕەشی وەك خاڵە لەسەر ڕوومەتی لەیلا[6]
وەك زوڵفەکی شانە بکرێ وایە تەبارە[7]

نانێکی هەیە لایقە بدرێ بەسەلاتیـــــــن
تەنکوسپیەولووسە وەکو کاغەزی نووسین[8]
ئاوی هەموو دەرمانە چ تاڵ بێت و چ شیرین
هێند خۆشە هەوای قەت بە چ کەس نایەتە تەخمین
ئەمڕۆکە لەبۆ خۆشی هەموو دنێ وەکو شارە

---

(١) شاعیر شەیدای دەشتی قەراجەوهەوێنی شیعری وەسف و دڵداریەتی، بۆیە بەهیچ جێیەکی ناگۆڕێتەوەوکردوویەتیە سەردەفتەری هەموو شوێنەکان لەجوانیدا.

(٢) قەنارە: ئەو داروچەنگاڵەیە کە قەساب کەلەشی پێوەدەکات، لێرە مەبەستی سێدارەیە.

(٣) شام: سووریا و لوبنان و ئەردەن و فەڵەستینە،لەناو کورد دا شام بە خێروبەرکەت و ئاسایش بەناوبانگە و دەگوترێ (شامی شەریفە).

(٤) برپار: مەبەستی لەچەندیەتی ئەو دانەوێڵەیە کەبەرهەم دێت، بڕشت.
واتا: وادەبێ ئەگەر تەنەکەیەك گەنم بچێنی،سەدتەنەکەت بێتەدەست.

(٥) گەنمی ئادەم و حەووا:ئەو گەنمەیە کە ئادەم و حەووا لەبەهەشت خواردیان وخوا لەوێ دەریکردن، ئەو گەنمەشی دەنکی گەورەبوو،ئاماژەیە بەئایەتی ((ویا أدم اسكن أنت و زوجك الجنة فكلا في حيث شئتما ولاتقربا هذه الشجرة فتكونا من الظالمين))الأعراف/١٩.

(٦) لێکچواندنی ئاوەڵوژ لەنێوان (جۆوخاڵ)دا هەیە.

(٧) تەبارە: کاتێ گەنم و جۆ دان دەگرن و کاتی دروێنەیان دێ پێی دەگوترێ: تەبارە. لێرەشدا لێکچواندنی ئاوەژۆ هەیە خۆی دەبوایە زوڵفی شانەکراو بەتەبارە بچوێنرێ، بەڵام شاعی بەپێچەوانەی دارشتوە. ئەمە لێکچواندنی پەسەندیدەشی پێدەڵێن و وێنەیەکی هونەری نایابی دەرخستوە.

(٨) لەنێوان (نان و کاغەز)دا لێکچواندنی جەختاو هەیە.

ئەو ئەهلەی لەوێندەر هەنە وەك حاتەمی تەی وان[1]

دایـــــم دەگەڕێن خەڵكی ببەن بیكەنە میــوان

شـــۆراوە پیاڵە هەموو دەم حازرە فنجـــــان

خۆیــان بـكوژن هەروەدەزانن كەمە هێشتـــان[2]

دڵیان لەسەخا سافە بەبێ تۆز و غوبارە

(موخلیس)كەوەها خۆی دەنوێنێ كە جەوانە[3]

هەرچەندە كە شەوقی هەیە ئەمما بەزمانە

جارجارە كە مەشغول دەبێ بەم تەرزە قسانە

بۆ كەیفی دڵی مەجلیس و ئاساری زەمانە

چـــاوی لەدوعای چاكەیە لەم دارودیارە

---

(١) حاتەمی تەی: پیاوێكی بەخشندەی عەرەب بوو لە خێڵی تەی.

(٢) شاعیر بەخشندەیی دەكاتە ڕەوشتێكی مەزنی كۆمەڵی كوردەواری و شانازی پێوەدەكاو لەم ڕێگایەوە ئەگەر بشكوژرێن لایان هیچ نییە كەئەمەش سروشتێكی ڕەسەنی دەشتەكیەكانە.

(٣) واتا: شاعیر كەلەم وەسفە جوانەی بەهاری كوردستان وبەزم و ڕەزمی كچ و كاڵان دەبێتەوە، پێمان ڕادەگەیەنێ كەئەوەی كردوویەتی لەبەر خاتری ئێمەیە و بەدڵی خۆی نییە و هەردەیەوێ وەكو شوێنەوارێك بمێنێ، هەتا خوێنەران لەپاداشتی ئەوەدا دوعای چاكەی بۆ بكەن و یادی بەچاكە بكەنەوە.

# شیعری نیشتمانی

موخلیسی شاعیر ڕۆڵەیەکی بەوەفای کوردستان و شارەکەی خۆ بووە و هەمیشە خۆی بەقەرزاریان زانیوەوقەرزەکەی نەخستۆتە ئەو جیهان و بەهۆی خامەی بەبڕشت وهەست وسۆزی ناسك وغەزەل وقەسیدەپاراوەکانی توانیویەتی شوێن پێیەك لەدەرونی کوردستان و کوردوهەولێر بکاتەوە.

مرۆڤ ئەوکاتەی لەنیشتمان دوور دەکەوێتەوە کوورەی ئەڤینی دەروونی جۆش دەسێنی ودیدەکانی ئەشك دەرێژێ و وهەناسەی ساردی لێ هەڵدەستێ بۆ بست بەبستی خاکی زێدی باب وباپیرانی،هەرکە موخلیس لەساڵی ١٩٦٤ لەگوندی دووسەرە دەڕوات ودەچێتە شاری فەللوجە،هەر لەوساڵەدا بەرەو وولاتی شام دەچێ،دەبینین هەست بەنامۆیی وتەنیایی دەکا وکوڵی دڵی بەغەزەلێکی پڕواتا دادەڕێژێ و یاسای خاك وخۆڵ وسێبەری داران دەکا ولای وایە ئەخۆشیەکەی بەسێو و گەلازو مژمژەو خۆخی باخەکان چاك دەبێتەوە. لەلایەکی دیکە شاعیر دوو دەوروبەری شاری و دەشتی بەیەکدیکەوە دەبەستێتەوەوزۆر شارمزایانە باسی خواردنی ئەو دووهەوارە دەکاو حەزو نارەزووی بەخواردنی کوردەواری دادەشکێ، هەروەها باسی بەروبومەکانی سەرزەوی و ژێرزەوی کوردستان دەکاولەسیاسەتێکی ئابووری گرنگ دەدوێ کەخۆژیانە (ألتفاء ذاتی) وبەرستەی (خۆم بەسم بۆخۆم) دەری دەبڕێ ونایەوێ چیدی دراوی قورسی کورد بۆ بێگانە بڕوات.

شاعیر لە بۆچونەکانی گەشبینە و پێی وایە ڕۆژی سەربەخۆبوونی کورد دوور نیەوبۆیە لەخزمەتکردنی نیشتمانەکەی درێغی ناکاوبۆ پێشکەوتنیان لەتەلاش دایە و نومێدبڕ نیەلەدواڕۆژیان،چونکە لەڕووی سەرخان وژێرخانییەوە شایەنی ئەوەن و ئابووریان بەشی خۆیان دەکاولەڕووی کولتوریشەوە لەمیللەتانی دیکە کەمتر نین ولەوانیش باوەڕدارترن.

بەڵێ مەخلیس مرۆڤێکی ئاسایی نییەوزۆرجار ئێستا بەدوارۆژەوە دەبەستێتەوەو پەردەی نهێنیەکان بەچاوی دەروونی هەڵدەداتەوە و بەرەو ئەودیو جیهانی هەستی پێ دەبزوێنێ.ئەرەستۆ لەم ڕووەوە دەڵێ:شیعر بەرزترە و فەلسەفی ترە لەمێژوو،چونکە بۆ دەربڕینی گشت هەوڵدەدات،بەڵام مێژوو بۆتاك لەبارەی یەکێ لە پێشینیانەی دەڵێ:

**(موخلیسا)نێزیك بووە گوێت لێ بێ سەربەخۆیی وا بەکوردستان درا**

موخلیس لەخۆشەویستی نیشتیماندا شاری هەولێرودەشتی قەراج ودووسەرەی لەبیر نەکردووە.وادیارە عەشقی شاعیر بۆ هەولێر کۆنە و ئێستا واخەریکە عەشقێکی تازەی دەبەڕێتە دڵەوە،ئەویش عەشقی (باداوە)یە کەشوێنی قەسروخوێندنگای مەلائەفەندی بووە،ئەوشوێنەی کەچەندەها مەلای گەورە ئیجازەیان لێ وەرگرتووە و چەندەها پیاوماقوڵ و کاربەدەستی زەمانە ڕوویان تێکردووە،لەبارەیەوە دەڵێ:

**ڕۆژی عەشقی کۆن نەماوە،ڕۆژی عەشقی تازەیە**

**ڕوو لەهەولێر وەردەگێرم،ڕوو لە باداوان دەکەم**

لە(بەهاری دەشتی قەراج)دا تابلۆیەکی وا دەنەخشێنێ دەستی هیچ نیگارکێشێ نەیگاتێ وگیانێکی وای بەبەردا دەکات هەموو دڵێکی بۆ بێتە سەماوسۆزێکی هەتاهەتایی بەمرۆڤە جوانناسەکان دەبەخشێ،بێگومان ئەم سۆزەش لەدڵێکی مشت نەڤینی نیشتمانەوە هەڵدەقوڵێ.

شاعیر بەخامە ڕەنگینەکەی تابلۆی بووکی بەهارێکمان بۆ دەڕازێنێتەوە و نەورۆز دەکاتە تاجی سەر ئەو بەهارە، هەر لەوێ دیمەنی وێنەکە ستوونی بەرەو دوندی چیاکان هەڵدەکشێ و یەکسەر دادەبەزێتەوە سەرزەوی بەشێوەیەکی ئاسۆیی وێنە شیعریەکەی دەکێشێ و پۆلی کوڕان وکچان لەناو ئەو گژوگیایە دادێن و دەچن و شایی شێخانی دادەبەستن و ئینجا وێنەکە دەجووڵێ و ئەو جووڵانە بەرەوناخی شاعیر دەچێ:

**سەیری نەورۆز وبەهاری خاکی کوردوستان بکە**

**گەردەنی خۆت هەڵبکێشە سەیری شاخ وداخەکان**

**شایی شێخانی دەکەن وەقتێ کەبایان لێدەدا**

**چاو تەماشایان دەکاو دڵ سەربەخۆ دێتە هەژان**

وێنەکێشانی سینەمایی لەم قەسیدەدا بەرچاو دەکەوێ،دەمی کامێرە لەجووڵانەوەی یەکسەر ستونی و ئاسۆیی دایەبەرەو لوتکەی شاخەکان دەچێ وبەرەو پێدەشتەکان دادەبەزێ ودیمەنی ڕاوە کەروێشکمان بۆدەگرێ وگیانی بەبەردا دەکات و وەك ڕاوچییەك وێنەی هەنگاوەکان تۆمار دەکات:

کاکی خۆم دووبارە چاوت هەڵبڕەوسەیری بکە
پڕ بەچاو بنواڕە بەرزی بەژن وباڵای کێوەکان
نوسکەنوسکی تولە دێت و ڕێویە واپێچ دەکا
هانەهانی تاژیان دێتن لە دووکێروشکەکان

ئینجا (موخلیس) بەرەو دەوزێ دێ وڕووی تێدەکا و وێنەیەکی ئاسۆیی دەکێشێ و دەوزێ و دەوزێ هەنگاوەکانی گورج دەکاوبەزێیەکە دەڵێت: بۆچی ناوەستی؟ وادیارە (موخلیس) ڤینی لەوەیە کە زێی گەورە کوردستان بەجێدێڵێ وسوودی بۆخۆمان نییە و (کەناچە و تیتراواسکەکان) هاواریانە لەبەر نەوەستانی. پاشان نەوەستانی زێیەکە بەخزمەتکردنی بێگانە دەبەستێتەوە، ئەمەش لەوسەردەمەدا بوێرییەکی مەزنی شاعیرە و زێدە دڵسۆزییەتی بۆ نیشتمانەکەی.

شاعیر لەم هەڵوێستەی دا بە(پیرەمێرد)ی شاعیر دەچێ کە ڕووباری (زەڵم)دەدوێنێ ونیشانی دەدا کە ئەم ڕووبارەش کوردستان بەجێدێڵێ وخاکی ناوی بێگانە بەراودەکات، وەك دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ئاوە جوانەکەی سەرچاوەی زەڵم | بۆچ بەهار لێلی و پایزان پڕتەم |
| ئەڵێی سەرچاوەی بەختی کوردانی | لەسەردا ساردوسەر لە ئاسمانی |
| سەربنێرەوە بە لم وخاکـــــــا | بگری لەبارگەی سەلانی پاکا |
| بڵێ بەقوربان تۆ ئاوت پاکـــــە | بمانخەرە ڕێی یەکێتی و چاکە |

دیوانی پیرەمێردمحمد رەسول هاوار١٣٤

(موخلیس) بەشێوەیەکی زەقتر زێ دەدوێنێ و بەڕاستەوخۆ پرسیاری هۆی نەوەستانی لێدەکات ودەڵێت:

چاوەکەم ئەی ئاوی شیرین بۆچی ناوەستی دەمێ
زۆر لەمێژە ئارەزوومان دیدەنی تۆیە بەجان

ئاوی شیرین چەند بەشیرینی جەوابی دایەوە

من کەخاکی خۆم بەجێنێڵم لە ڕق خزم وکەسان

(موخلیس) زۆر عەشقی نیشتمانەکەی بوومەخەمی بۆ خواردووە و بەئاواتی ئەوە بووە ڕۆژێ سەرۆکی کوردوناڵای کوردستان ببینێ لەکۆتایی ژیانیدا لە دوو بەیتەکیدا داخی ئەوە دەخوا کەدەمرێ و نابینێ ڕۆڵەیەکی کورد بۆتە پاشا:

من کەدەمرم غەمی گەورەم ئەومیە قەت نەگۆترا بەچە کوردی بوو بەشا

بەم پێیە(موخلیس)خەمی ژیان ومردنی خۆی وخەمی ماڵ ومنداڵەکانی ناخوات، بەڵکو خەمی میللەتەکەی دەخوات کەکەسی لێ نەبوومتە پاشا و سەرکردەوسەرۆك دەوڵەتی کوردستان.

ئێستاش لەلایەرەکانی داهاتوودا چەند غەزەلێکی نیشتمانی موخلیستان بۆ تۆمار دەکەین و لەسەریان دەدوێین.

# کوردی موسەقفەف[1]

لێرەوە یاران شەووڕۆژ یادی کوردستان دەکەم
زۆر غەریبی خاك وخۆڵ و سێبەری داران دەکەم[2]

من نەخۆشم بای وەتەن کە هات بەچاکی پێی بڵێن
ئارەزووی سێو و گەراز ومژمژ و خۆخان دەکـــەم[3]

دۆ بەکەشك وکفتەودانەدۆك بە سلقی سەر بـــەڕوون
کەشکەك ودۆڵمەو پڵاوبزۆر بیری خواردنتان دەکەم[4]

گەنم و جۆ و کونجی و برنج،نەفت وشەکروچام هەبێ
خۆم بەسم بۆخۆم،چ مەعنا ڕوو لە بێگانان دەکەم[5]

---

(١) **لەبەحری رەمەلی مەشتی مەخرووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) وادیارە (موخلیس) لەکوردستان و شاری هەولێر بەدوورکەوتوتەوە و کوورەی غەریبی جۆشی سەندووە و یادی خاك وخوڵ و هەموو خواردنێکی کوردستان دەکاتەوە و گوێی نەداوەتە کزی سەرواکانی وزۆربەیان بە (ان)ی کۆ کۆتاییان هاتووە.

(٣) **گەراز:** گەڵاز، هەڵوچکە، هەڵوژە. مژمژ: فەریکە قەیسی.

(٤) **دۆبەکەشك:** ناوی چێشتێکی کوردەواریە و بریتیە لەتێکەڵاوکردنی کەشك وگەنمەکوتا، دوای ئەوەی کەشکەکە لەئاردەکرێ دوسورێتەوە.

**کەشك:** بریتیە لەو دۆیە تیرەی کەلەناو توورەگەدا (جاخ) خەست دەبێت وپاشان دەیکەنە سەلك سەلك وهەڵی دەخەن تا ووشك دەبێ.

**دالدوك بەسلق:** ناوی چێشتێکی کوردەوایەو بریتیە لەتێکەڵاوکردنی داندوك (ترخێنە) لەگەڵ سلقدا. **دالدوك:** بریتیە لەتێکەڵاوکردنی دۆی تیر و (خەست) ساوار، یاخود ماست وساوار، دوای ئەوەی وەکوهەویر دەیشێلن دەکرێتە سەلکی خڕو ووشك دەکرێتەوە بۆ زستان، جا بەوشکی و بەچایە و بە چێشت دەخورێ.

**کەشکەك:** بنەبنی سەلکە کەشکە،دوای ئەوەی کەشکەکە دەسون (کەشکولە)، بەنان و چایەوە دەخورێت وچەوری تێدا نەماوە.

(٥) لێردا (موخلیس) داوای خۆژیان (التفاء ذاتي) دەکات، چونکە لەکۆنەوە ناوچە دوورکانی دوور لەشار خۆیان پێویستیەکانی خۆیان دابین دەکرد، ئەمەش بنەمایەکی ئابووری ز، ر گرنگەو هەر ووڵاتێ پەیڕەوی بکات نیشانەی پێشکەوتنیەتی لەڕووی ئابوریەوە.

قەومی کوردی شێربەچەی خۆم خۆشدەوێ وەك ڕووحی خۆم
بۆ بەپێشکەوتن جیان پێویست بێ خزمەتیـــــان دەکەم
هەر چ قەومێکی کە دەبینم لە کورد بێ دین تره
سا کەوابێ حەز لە بەرزی وسەربەخۆ بوونیان دەکەم
(موخلیسا) گەر کورد موسەققەف بێت و ئەشعاریان بوێ
هەرچی کوردبێ بەڕك وکیسەی پڕ دوڕو مەرجان دەکەم[1]

---

(١) بەڕك: بەری،گیرفان. دوڕو مەرجان: مەبەست لێی شیعرە کە بە دوڕو مەرجانی چواندووە.

# پێشکێشی کوردستان[(١)]

من کەپیرم هەرکە سەیری مەنزەرەی شاران دەکەم
غەم لەبۆ گەنجی دەخۆم وگۆتن وگریان دەکەم

عاشقی پاك گەر فەلەك ببتە مەسیفی دوور نییە
وامەزانە ئەو قسەی وازل بەبێ بورهان دەکەم

عاشق و مەعشوقی وەك مەجنون و لەیلای بێ غوبار
بوونە ئەستێرە لەئاسمان شەو تەماشایان دەکەم[(٢)]

لاوی وەك فەرهاد و وەك مەم چونە ڕێزی قودسییان
من بە ناوهێنانی وان وادەردی خۆم دەرمان دەکەم

یا تەوافی رووت دەکەم، یا دەچمە نێو ئەگریجەکەت
گەر تەوافم لێ مەنع کەن، ڕوو لە کفرســـتان دەکەم[(٣)]

ڕۆژی عیشقی کۆن نەماوە ڕۆژی عیشقی تازەیە
ڕووله هەولێر وەردەگێڕم ڕوو لەباداوان دەکەم[(٤)]

قەسری باداوان دەڵێن بەردی بنی دەرهاتووە
گەر وەهابێ چۆن ئەمن یاری لەگەڵ دەوران کەم[(٥)]

---

(١) **لەبەحری رەمەلی هەشتی مەخرووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) لە ئەفسانەی کوردیدا هەیە کە گوایا لەیلاومەجنون هەرکەمردن، هەردوکیان بونە ئەستێرە لەئاسمان، هەروەها واباوە کە ساڵی جارێك ئەم دوو ئەستێرەیە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دێن و لێك تێدەپەڕن و هەرکەسێ ئەو شەوە دابنیشێ و ئەو ساتە ببینێ کەلێك تێدەپەڕن ولەکاتی لێك تێپەڕینەکە هەرمرازێ بخوازێ بۆی دەبێ، جا عاشقانیش چاوەڕێی ئەو شەوە دەکەن تا مرازی دڵی خۆیان بڵێن.

(٣) **واتا:** موخلیس ڕووی یارەکەی بەکەعبە داناوەو زوڵفەکەشی بەکفرستان، جا ئەگەر نەهێڵن تەوافی ڕووی بکا ئەوا بەرەو کفرستانی زوڵفی دەچێت، چونکە زوڵفی ڕەشەو وەکو کفر کەدژی باوەڕە ڕووناکیین.

(٤) **باداوان:** گوندێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی هەلێر و ئێستا بوەتە گەڕکێك لێی.

(٥) **قەسری باداوان:** ئەو قەسری (مەلا ئەفەندی) یە کە بەگوێرەی بەیتە شیعرێ کاتی خۆی فەقێیەکی نوسیویەتی(هذا قصر ابي بكر) بەحیسابی ئەبجەدب دەکاتە ١٣٣٢ ك/١٩٢٣ ع دروستکراوە و لە١٩٦٤ لەدوای سوتاندنی قەسرەکە ڕوخێنراوەو گەلێ کتێبی بەنرخی تێدا فەوتاوە ودزراوە. ئەم زانیاریانەم لە مامۆستا (ڕەشاد موفتی) وەرگرت.

(*) (مەلا ئەفەندی):ناوی مەلا ئەبوبەکری کوڕی حاجی عومەر بورە،لە١٢٨٠ ك لەدایکبوە و لە ١٣٦١ك/١٩٤٢ع وەفاتیکردووە. ئەم زاتە لە گوندی باداوان دادەنیشت و پایەکی بەرزی کۆمەڵایەتی وزانیاری هەبوە، مەلایەکان زۆریان لەلای ئەو ئیجازەیان وەرگرتووە. هەولێر، تەحسین چیچۆ ز شێرزاد قادر، بەغدا ١٩٨٥، ل٣٠٢.

قەسری باداوان بیلات بوو بۆ ملووکان سەردەمێ

ولاما، من لەو ڕقە واخۆم بەبێ باوان دەکــەم(١)

با لەباداوان لەبۆ لای نیشتیمان بادەینەوە

نیشتمان سەد قەهرەمان و ڕۆستەمت قوربان دەکەم(٢)

هەرکەسێ موژدەم بداتێ نیشتمان ئازاد بووە

باغەڵ وبەرگی لەئەشعار پڕ دوڕو مەرجان دەکەم

خۆشترین چشتە لەدونیا سەربەخۆیی (موخلیســا)

بێ لەدین، دونیا هەموو پێشکێشی کوردستان دەکەم

---

(١) **بیلات**: بارەگای پاشا، واتا: سەردەمێك مەلیك دەهاتە ناو ئەوقەسرەودەبوە میوانی مەلا ئەفەندی، لە١٩٢٤ ع (مەلیك فەیسەڵی یەکەم) هاتە باداوان و لە ١٩٤١ مەلیك فەیسەلی. بچووك لەگەڵ دایکی و پلکەکانی لەترسی (رشید عالی گەیلانی) هاتنە باداوان. ئەم زانیاریەم لە مامۆستا(شاد موفق) وەرگرت. **باوان**: باب وباپیران.

(٢) **قەهرەمان**: پاڵەوانێکی کۆنی ئێران بووەو لەشانامەدا ناوی هاتووە.
فرهنگ عمید/ص٨٠٣

**ڕۆستەم**: پاڵەوانێکی کۆنی ئێران بووەو کوڕی زاڵ بووە، لەکاتی کەیقوبادوکەیکاوس و کەیخوسرەودا جەنگی لەگەڵ تۆرانییەکان کردووە، لە ئەنجامدا (شغاد)ی هاوڕێی چاڵێکی بۆ هەڵکەند و بەئەسپەوە تێکەوت و مرد.
فرهنگ عمید/ص١١٢٩.

(موخلیس) هەر بەتەمای ئەوەبوو کە مژدەی سەربەخۆیی کوردستانی پێ بدرێ و بەلای ئەوەوە خۆشترین شت بوە لەدونیاو ئامادە بووە جگە لەبیروباوەڕی ئاینی هەموو شتێکی بەقوربان بکا.

شاعیر پێشبینی ئەوەی کردووە کەلەوانەیە سەربەخۆیی نیشتیمان لەسەر حسێبی دارمانی پەیکەری بیروباوەڕی ئاینی بێت،بۆیە ئامادە نیە ئاینەکەی بەقوربانی ئەو سەربەخۆیە ڕواڵەتیە بکات.

# ووڵات هەی وڵات[1]

لەقەسیدەیەکی درێژیدا (موخلیس) خۆشەویستی خۆی بۆ نیشتیمانەکەی دەردەبڕێ، سەرەتا بەو گوندە دەستپێدەکات کەزێدگای بووە وهەرچەندە ئاوەکەی سوێر بووە بەڵام لای ئەو دەرمانی دەردان بووە.

ئەم قەسیدەیە باسی ژیانی شاعیر دەکات لەسەرەتاوە تاکو بوونی بەمەلاو ئیجازە وەرگرتنی ودامەزراندنی لە گوندی دووسەرە بەمەلا.پاشان باسی ئاغای ئەو گوندەو کوڕەکانی دەکات کەدڵسۆزی گوندەکەی خۆیان و کوردستان بوونە.

ئێمە لەم قەسیدەیەدا تەنیا ئەو بەیتانەمان هەڵبژاردووە کەبۆنی خۆشەویستی نیشتمانیان لێدێت.ئەمەش چەند بەیتێکە لەو قەسیدەیە:

ووڵات هەی ووڵات کەینێ بتینم — دەست لەهەمیاسەی پشتت وەربینم[2]

من جێگەی پێشوم شۆڕە زەردکەیە — ئەو شۆڕە زەرتکەی کە ندێناوەیە[3]

دێیەکی زۆرەبزۆر خۆش هەوایە — ئاوەکەی شۆری وەك دەرمان وایە

پیشەی گوردانە لەوێ وابووە — هەرکەس مەرداربێ بۆ قەراج چووە

---

(١) ئەم قەسیدەیە لەسەر کێشی خۆماڵی کوردییەو (١٠) بڕگەیە: ٥+٥=١٠.

(٢) هەیاسە: پشتێنێکی زیو یان زێڕە و ژن لەپشتی خۆیان دەبەستن.

لێرەدا (موخلیس)کوردستانی بە ژنێکی شۆخ و نازدار داناوە کە هەیاسەی لەپشتەو ئەویش دەیەوێ لەباوەشی بکات وبەسینگی خۆیەوە بگرێت، ئەمەدەکەوێتە خانەی بەگیانکردنی بێ گیانەوە.

(٣) شۆڕە زەردکە: دێیەکە لە کەندێناوە و سەربەناحیەی دیبەگەیە لەکوردەواری بە (شۆڕە زەرتکە) بەناوبانگە لەلایەنی فۆنۆلۆجیەوە لە (شۆڕەزەردکە)ڕاسترە، چونکە (ت،ك)کپن لەگەڵ یەکدی دەگونجێن.

من وەك ئێستا کووم،هەر بەمناڵی  خاك ونەتەوەم کەوتە خەیاڵی[1]
دیتم کە خاك ونەتەوەی واچاك  بویتە ژێر دەستی دوژمنی ناپاك
دڵ چرای بەزم و رەزمی کوژاوە  بۆیە هەموو دەم تەنیا و داماوە[2]
بەڵان کەزانیم ڕێی دەرچون دوورە  بەخۆم خۆم ون کرد غەم بوو بەشوورە
وام نەکرد بچمە بەندی و تەویلە  دوژمن پێم خۆش بی پێم بڵێن: دیلە
خۆم تەوانەدا زۆر بەدەست و برد  گەرچی هەژار بووم خوێندنم دەکرد[3]

.................

وولاتمان خۆشە هیچ عەیبی نییە  بستە خاکێکی بێ فایدە نییە
یا کشت و کێڵە یاخۆ پاوانە  یا رەز و باخە یا دارستانە[4]
ئەو فائیدانەی لەسەر پشت هەنە  سەیری نێوزگی یەکسەر مەعدەنە[5]
وولاتی ئێمە وەك دار گوڵ وایە  گوڵ بۆ بێگانە ،خار بۆ ئێمەیە
بێگانە وایکرد نابێ وەتەنمان  بەزمانی کوردی بدوێ لەگەڵمان
بست بە بست خاکمان کەشفی کرایە  نموونەی ئێستا لە ئەوروپایە[6]

---

(١) کووم: چونم. (موخلیس) هەر لەمناڵیەوە خۆشەویستی نیشتمانی لەمێشکدا بووە و هەستی بەزۆروستەمی داگیرکەر کردووە،ئەمەش بۆ مناڵێکی دەشتەکی هەتیو جێی پرسیار و سەرسوڕمانە.

(٢) شاعیر کە بینی وولاتی داگیرکراوە، ئیدیچرای خۆشی و شادی کوژاوەتەوەو خەم و پەژارە دایگرتووە و دڵی نارەحەت بووە و ئۆقرەی نەگرتووە.

(٣) واتا: موخلیس کە هەستی کردووە ڕێی ڕزگاربوون لەدەست دوژمن دوورە، بۆیە ڕێگەی بەخۆی نەداوە بەنەخوێندەواری بمێنێتەوە و وەکو ئاژەڵ بخرێتە تەویلەوەودیل بکرێت، بۆیە تانی لەخۆی داو سەرەڕای هەژاریەکەی چووە بەرخوێندن، چونکە ڕێگەی خوێندن ڕوونترین و کورتترین ڕێی ڕزگاربونە.

(٤) کشت وکێڵ: کشت وکاڵ. بەڕای من (کشت وکێڵ) لە (کشت وکاڵ) ڕاستترە چونکە (کێڵ) ڕەگی چاوگی (کێڵان)ە. پاوان: لەوەڕگا.

(٥) جۆرە لادانێکی ڕێزمانی لە (لەسەر پشت هەنە) هەیە،دەبوایە (لەسەر پشتی هەیە) بوایە، بەڵام لەبەر کێشەکەی (ی) فڕتاوە.

(٦) وادبارە موخلیس ئاگاداری هەوڵی ڕۆژئاوایە کەدەیانەوێ هەموو کوردستان بەتایبەتی و ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بەگشتی بزانن، بۆیە لەپەنای ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە هەموو جۆرە کارێکیان ئەنجام داوە ولەوانەش شارەزابوون لە جوگرافیا و شوێنی کانزاکانی ئەو وولاتەی کە ڕووی تێدەکەن، ئەمەش بوتەوەی لەکاتی داگیرکردنیان زوو ئەو شوێنانە بگرن و بیپارێزن.

شەقڵی کردووە شەقڵی مەشکێنە    لەخۆت خۆش ببە ئەوجا بشکێنە[1]
بەبەردی خۆمان سەرمان ئەشکێنێ    بەنەوتی خۆمان ئەمان سوتێنێ
دەمان خنکێنێ بە دیجلە و فورات    ویجدان چۆن وایە خوا لەناوت بات
هەروەکو زێروو دەمژێتن خێنمان    دەرناکەوێتن جێگەی برینمان[2]
وڵات هەی وڵات کەینێ بتبینم    دەست لەهەیاسەی پشتت وەرینم
ڕوومەتت ماچ و نێو دەمت بۆن کەم    بەدیتنی بەرزیت چاوی خۆم ڕۆنکەم
وڵات هەی وڵات لەناوەڕاستت    دەشتی هەولێرو چیای بەڕاستت
سەیری کێوان کە کژی بوواران    دڵ دەلەرزێنن  هەروەك نازداران
هێندە جێ زەردە،هێندە جێ سوورە    هەندە جێ سەوزە،هەندە جێ مۆرە
هێندە جێ ئاگر،هەندە جێ نوورە    پاك و خاوێنی وەك کێوی توورە[3]
هەندە جێ سپی ،هەندە جێ شینە    چۆن تەخمین بکەی هەوراز تەخمینە[1]

---

(١) **شەقڵ**: دارێك بوو بەقەد ماڵەیەك و چەند نەخشێ لەسەر ڕووەکەی کرابوو، پیاوی ئاغا (سەرکار) دەهات و ڕەوسەکەی پێ مۆر(شەقڵ) دەکرد نەخۆ جوتیارەکە یان یەکێکی دیکە لێی بدزێ.

**ڕەوسە**:کاتێ گەنم یا جۆ کە لەکا جودا کرایەوە، بەگەنمەکە یا جۆیەکەیان دەگوت ڕەوسەگەنم، ڕەوسە جۆ. بەکایەکەشیان دەگوت: تارمەی کا، ڕەندەی کا.

**واتا**: ئەورووپیەکان هەموو شوێنەگرنگەکانی وڵاتەکەمانیان شەقڵ کردووەو ئەوەی بەوێ شەقڵەکە بشکێنێت دەبێ دەست لەخۆی بشوات و لەناو دەچێت.

(٢) **زێروو**: زەروو. کرمێکی ڕەشی ئاوی دەم تیژە ئەگیرێتە جەستە بۆ هەڵمژینی خوێنی پیس. فەرهەنگی خاڵ ل ٢٣٠.

هەروەها زەروو بچێتە ناو زاری هەرکەسێ، بە ئاسمانی گەروویەوە دەنوسێ و خوێنی دەمژێ و ئەگەرچارەی نەکرێ ودەرنەهێنرێت دەیکوژێ.

(٣) دوای ئەوەی شاعیر باسی دەشت و کێوەکانی کوردستان دەکات بەتایبەتی لەبەهاران کە ئەو هەموو گوڵ و کوڵوکە ڕەنگاوڕەنگە تێکەڵ یەکتری دەبن و دیمەنیان بە ژنێکی ڕازاوە دەچێت، ئینجا جۆرە پیرۆزیەك دەداتە کێوەکان و بەکێوی تووری دەچوێنێ، ئەو کێوەی کە نووری خوای لێدەرکەوت.

**کێوی توور**: ئەو شاخەیە کە حەزرەتی موسا موناجاتی لەگەڵ خودای مەزن کرد و داوای لێکرد خۆی نیشان بدات، ئاماژەیە بەم ئایەتە (( ولما جاء موسى لميقاتنا وكلمه ربه قال ربي ارني انظر اليك ،قال لن تراني ولكن انظر الى الجبل فأن استقر مكانه فسوف تراني،فلما تجلى ربه للجبل جعله دكا وخر موسى صعقا فلما افاق قال سبحانك تبت اليك وأنا اول المؤمنين)) الأعراف/١٤٣.

بەهەشتی کوردان دامەزراوە رێك　　　بیری نایگاتێ هیچ موهەندیسێك

دەشتی قەراجی دەشتێکی پانە　　　جێی راوکەران و چاو غەزالانە

سەیری بوواران چەند رەنگاورەنگە　　　شۆقەی بووکانە پڕ شۆخ و شەنگە[2]

چین چین تەماشا هۆبەورەشماڵە　　　ئەو هەموو هۆبە پڕ کچ و کاڵە

ئەو کیژی رووگەش وەك خونچەی سەحەر　　　هەرچی دەبینی مەیلت دەچتە سەر

هەر لەدووکچان ئەمن عەوداڵم　　　بێ کچ و کاڵان بێ دەنگ و لاڵم[3]

بچیە خۆشناوان سەرسوڕدەمینێ　　　خۆت گەر بێیەوە دڵ جێ دەمینێ[4]

ئەو رەز و باغی وا ناسك و نازدار　　　ئەو کێوی بەرزی هەزار بە هەزار

ئەو میوەهاتی لەوێی بار دەکەن　　　لوبنان و تانیف شەرمەزار دەکەن

وڵات هەی وڵات کەیێ بتبینم　　　دەست لەهەیاسەی پشتت وەربینم

روومەتت ماچ و نێو دەمت بۆنکەم　　　بەدیتنی بەرزیت چاوی خۆم رۆنکەم

---

(٤) تەخمین: گوترە، جەڵەبی. دیاریکردنی شتێ بەهۆی بۆچون و گومانەوە.

(١) شۆقە: ئەو ژوورەی بۆ بوك دەرازرێنێتەوە.

(٢) وادیارە مەخلیس ئەم قەسیدەیەی لەسەردەمی لاوێتیدا داناوە و ئەو کاتەسەر بەرێبازی نەقشبەندی نەبووە، چونکە عەوداڵی دوو کچ و کاڵانەوبێ ئەوان زمانی لاڵە.

(٣) لەم بەیتە جۆرە لادانێکی رێزمانی بەرچاو دەکەوێ لە (بچیە خۆشناوان)، مەبەستی ئەوەیە بڵێ (بچیە خۆشناوەتیان)، بەڵام لەبەر کێشی بەیتەکە ناوەکەی بەکارهێناوە (خۆشناوە) نەك ناوی شوێن (خۆشناوەتی).

لەم قەسیدەیەدا شاعیر وەسفێکی نایابی کوردستان دەکات بەدەشت و کێویەوە، بە بەهارو هاوینیەوە، بە کانزا و بەروبومیەوە، وەسفەکە جۆرە پێوەنانێکی پێوە دیارە، بەڵام ئەمەش لەبەر خۆشەویستی وڵاتە. قەسیدەکە دوور و درێژە و تەنیا ئەوەی پەیوەندی بەخۆشەویستی کوردستانەوە بوو تۆمارکراوە، ئەوانی دیکە پشتگوێ خراون. (قەسیدەکە لەگۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،١٩٧٣، بەرگی یەکەم بڵاوکراوەتەوە.

# کورد[1]

قەومی کورد بۆچ ئێوە قەت نابنە برا
بەسیەتی پشتتـــان لەدونیـــــا دابڕا
کوردی ئێران وعێراق وتورك وشام
بۆلە وەقتی خۆی وەها جێ جێ کرا
بۆچی یەك ناگرنەوە یەك پارچە بن
چەنگە باز بن بۆ هەموو لا ئاشکرا
بێ سیاسەت کەس نییە هەر ئێوەنە
وا لەتاریکی دەسوڕێن بێ چـــرا
چاوەڕێم ئاڵایی کوردان هەڵکـــــرێ
هەرچی هات پێشکەوت و ئاڵای هەڵکرا

(١) لەبەحری رەمەلی شەشەمی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(موخلیس) لەم غەزەلەدا ڕووی دەمی لە میللەتەکەی دەکا و دەپرسێ:بۆچی نابنە برا ئەی کوردینە؟ پاشان دەپرسێ:بۆچی کوردستان دابەشی سەر ئێران وعێراق وتورك وشام کرا و بۆچی یەك ناگرنەوە، هەرچەندە وەڵامێکی ڕاستەوخۆی نەداوەتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هۆیەکەی بۆ نەبوونی سیاسەتی دەسەڵاتدارەکاندە گێڕێتەوە،کەواتە شاعیر ئاگاداری ڕووداوەکانی کۆن و تازەیە بۆیە گلەیی نەبوونی زمانی سیاسەتیان لێدەکات.

موخلیس وادیارە بەدواداچونی سەربەخۆیی میللەتانی هەیە، بۆیە چاوڕێی هەڵکردنی ئاڵای کوردانە هەرچەندی خۆی نەیدی بەڵام هیواو ئاواتەکانی هەندێکی هاتەدی کە هەڵکردنی ئاڵایە.

لەلایێکی دیکەوە گلەییان لێدەکات کە سەرکردەکان سەر بۆیەکتری دانانەوێنن وناکۆکن، ئەمەش دووبارەکردنەوەی هەمان بیروڕای ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیە.

ناتەبایی پشتی کوردانی شکاند
بۆ سەرۆکی کەس بە کەس نایێتە ڕا
هەر دەیان وێ باری خەلقی هەڵگرن
ئاوها بن نابنە خاوەن ســــەرا[1]
قەت مەڵێ بێ دینە کوردی وا نەزان
کورد لەبێ دینیشەوە هەر پاشخرا[2]
چۆن سەرۆکی کورد دەبێ بێگانە بێ
بۆ پشیلە قەت بەزی پێ نەسپێررا[3]
با سەرۆك کورد بێت و خوێنت هەڵمژێ
نـــەك بەبێگانە بڵێن کورد لێی درا[4]
(موخلیسا)نێزیك بووە گوێت لێ بێ
سەربەخۆیی وا بەکوردستـــان درا[5]

---

(١) وادیارە خزمەتکردنی بێگانە لەلایەن کوردەوە میراتێکە بۆمان ماوەتەوە و موخلیس پێمان ڕادەگەیەنێ هەتا خزمەتی خۆمان نەکەین نابینە خاوەن سەراوادەوڵەت. بێگومان ئەم گلەییەش لەسەرکردەکانی کورد دەکات چونکە ڕەش و ڕووتی میللەت هیچی لەدەست نییە و ئەوان ئاراستەی دەکەن و دیجوڵێنن.

(٢) شاعیر هێندە داخدراوە لە کورد و سەرکردەکانی، بۆیە دەڵێ: وامەزانن کورد لەبەر بێدینی نەیوتە خاوەن دەوڵەت، ئەورووپا زۆر لەکورد بێ دینترە بەڵام لە ڕووی زانستەوە پێشکەوتووە و گەیشتونەتە مافی خۆیان،کەچی کوردی نەزان گەر بێ دینیش بێ لەنەزانینەوەیەو خاوەن زاستی دونیایی نییە تاکو کاروبارەکانی بێ ڕێك بخات.

یاخود موخلیس مەبەستی ئەوەیە بڵێ: سەربەخۆیی میللەت پەیوەندی بە بەدینی و بێ دینییەوە نییە و ئەم مەسەلەیە شتێکی دونیاییە و هەوڵ و خەبات و لەخۆ بوردەیی گەرەکە.

(٣) شاعیر پێی سەیرە کە سەرۆکی کورد بێگانە بێ، ئەمەش لەوپەڕی دڵسۆزی شاعیرە بۆ نیشتمانەکەی، دوایی دێ نیشتمان بە بەز دەچوێنێ و سەرۆکیش بە پشیلە وئەوجا دەڵێ: ئایا پشیلە بەزی پێ دەسپێردرێ کە ئاگاداری بکات؟ بێگومان نەخێر.پشیلە لەوەتی هەیە بەزخۆرە،سەرۆکی بێگانەش پشیلە ئاسایە.

(٤) موخلیس دوور دەڕوانێ و پێشبینی ئەوەدەکات کە ڕۆژێك لەڕۆژان کورد سەرۆکی دەبێت وداد‌پەروەری بەرپا ناکات، بەڵام شاعیر هەر پێی ڕازیە و پێی لە سەرۆکی بێگانە باشترە.

(٥) موخلیس پێی وایە سەربەخۆیی کوردستان نزیك بووە،کەواتە شاعیر گەشبینە و باوەڕی بە میللەتەکەی هەیە کە ژێر دەستی قبوڵ ناکات.

# شیعری کۆمەڵایەتی

موخلیس ڕۆڵەی کۆمەڵگایەکەی خۆی بووەوهەرگیز لێی دانەبڕاوە و بێزاری لێنەکردووە،لەگەڵ ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتە ژیاوەوتا توانیویەتی بە ئامۆژگاری و شیعرەکانی ڕێگەی ڕاستیی پێیان نیشانداوە و چەوتیەکانیانی ئاشکراکردووە و چارەسەری بۆ داناوە.

لە ووتووێژو هەڵسوکەوتدا زۆر نەرم ونیان بووە وبەپێی ئاستی ڕۆشنبیریی ئەو خەڵکە لەگەڵیان دواوە.گەلێ لە شیعرەکانی ڕەخنەئامێزن و ڕەخنەکانیش بەزۆری ئاڕاستەی چینی کاربەدەست کراون،جا چ کاربەدەستی ڕەسمی یان کۆمەڵایەتی یاخود زاهید وشێخی تەریقەتەکان.

ئێستا لەولاپەڕانەی کە دادێن چەند غەزەلێکی شاعیر تۆمار دەکرێن و ئاماژە بەلایەنە کۆمەڵایەتیەکانیان دەکەین.

# ویرونەدەب[1]

یاری کەس ناکا فەلەك تا ناکەس وسفلە هەبی
بەوکەسەی نادا ڕووەت، مەشهوربی وێرونەدەبی[2]

هەرکەسێ چەرخی فەلەك کردیە قارِوونی زەمان
هەر تەماشای بکە بۆخۆت و مەپرسە سەبەبی[3]

بێ بوخار نابی چ بەحر و بێ درِی نابی چ گوڵ
وەك چرای موستەفایی و دووکەڵی بوولەهەبی[4]

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) رووەت: ناوبانگ، نرخ. وێر: ئەدەب، گرانی لە خورِەوشتدا.

واتا: فەلەك هەرکە لەگەڵ مرۆڤی سفلە دەگونجێ و ئەوکەسەی خودان رِەوشتی بەرزبێ ناوبانگی ناداتێ. لێرەدا مەبەستی لە فەلەك دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەیە نەك شەووڕۆژی ئاسایی.

(٣) قاروون: دەوڵەمەندێکی جولەکە بووەوکورِی مامی حەزرەتی موسا بووە، لەخۆبایی بووەوخواش قینی لێگرتووە، دارایی و سامانی بەناخی زەویدا بردووە. قصص الأنبياء، اسماعيل بن كثير، ص٤٢٠-٤٢٣.

هەروەها قاروون ئاماژەیە بە ئایەتی ((ان قارون كان من قوم موسى فبغى عليهم وأتيناه من الكنوز ما ان مفاتحه لتنوء بالعصبة اولي القوه.....))القصص/٧٦.

هەندێ جار هەندێ کەس خودای مەزن بەلێشاو نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا دەرِژێنێ،کەچی ئەو لەجیاتی سوپاسگوزاری خودا کوفرانەی نیعمەتەکانی دەکاومستەحەقی قینی خودا دەبێت و لەناودەچێ بەسامانەوە.

(٤) چرای موستەفایی: مەبەست ئاینی ئیسلامە، لێرەدا پێچەوبەخشی نارێك لەنێوان (بەحروگوڵ) و (چرا و لەهەب)دا هەیە، واتا بەحرو لەهەب, گوڵ وچیا. درِی: درِك.

هەرکەسێ خۆی نەوێ بۆتۆببە خاکی بەری پێی

کوردە یاخود عەرەبە بۆ چتە ئەسڵ و نەسەبی[1]

(موخلیسا) یار هەیە لوتفی بەزمان و بەقەلەم

نابی هیچ شوکری لەبیر بکرێ بەکوردی و عەرەبی[2]

---

(١) واتا: تۆ سەیری کردەوەی مرۆڤ بکە وحەقت لەرەگەزی نەبێت،ئەگەر باش بوو،ببە خاکی بەری پێی.ئەمە ئاماژەیە بەم ئایەتە ((یاأیها الناس انا خلقناکم من ذکر و أنثی وجعلناکم شعوبا قبائل لتعارفوا أن اکرمکم عند الله اتقاکم) الحجرات/١٣.

هەروەها ئاماژەیە بەم فەرمودیەی پێغەمبەر(ص) کە دەفەرموێ ((خیر الناس انفعهم للناس)) فیض القدیر، المناوي، ص٤٨١.

(٢) واتا: موخلیس مەبەستی لەیار شێخ مستەفای نەقشبەدیە کە رابەری بووە، چونکە زمان و قەڵەم هێمایە بۆ ئەو کەنوسینیشی هەبووە.

بەمجۆرە شاعیر رەخنە لەچینی دەسەڵاتدار دەگرێ کە پشتی مرۆڤی سفڵە و کەم وێردەگرن و لەهیچەوە بەرزی دەکەنەوەودەسەڵاتی پیدەبەخشن، پاشان ئامۆژگاریمان دەکات کە ببینە خاکی بەری پێی ئەو کەسانەی کە بەرژەوەندی گشتیان دەوێت جا لەهەر میللەتێك بن گرنگ نییە.

# پلکە سەوەر[1]

نەبە مەندیل و حەڵاڵی بەشەری — نەبەکەسك و نە بە ڕیش موعتەبەری[2]
مەکە ئیزهاری ویلایەت بە درۆ — دەمی ئاگا بە برنج کەربە کەری[3]
کە بە چاو پێت نەکرێ بچیە چیا — دەبێ بێ چاو بکرێ بچیە سەری
مەخە سەر زار و دەمی خۆت قسەیێ — کە نەزانی چیە نەفع و زەرەری[4]
قسەیێکی مەکە لای ئەهلی شعوور — کە لەتوو زێدە بی قەدر و قەدەری[5]
بەهەوڵدان دەگەیە ئەهلی هونەر — بە قسە هەر کوڕی پلکە سەوەری[6]

---

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزوومە: فاعلاتن فعلاتن فعلن.
ئەم غەزەلە ڕەخنەیەکی کۆمەڵایەتیە و لەشێخێك یان سەیدێکی مەلاو حاجی گیراوە و وادیارە ئەو پیاوە قسە و کردەوەی یەك نەبووە و بۆیە شاعیر هیچ ڕێزێك بۆمەندیل و حەڵاڵی و شاڵی سەوزو ڕیشی درێژی دانانێ و بەمرۆڤی نازانێ و دەیخاتە ڕیزی درندەکانەوە.

(٢) حەڵاڵی: چەفیەی حاجییان. کەسك: شاڵی سەوزی سەیدە کەلەپشت دەبەسترێ یاخو لەسەر دەنرێ.

(٣) ویلایەت: زاراوەیەکی سۆفیانەیە و پلەوپایەکە کە سۆفی لەمەقامی فەنا وەستانی بەحەقەوەیە ویلایەت دوو بەشە: ویلایەتی گشتی کە هاوبەشە لەنێوان باوەڕداران، ویلایەتی تایبەتی کە تایبەتە بە ڕێبوارانی گەیپو کە لەحەق فانی بووینە و بە حەق ماونەتەوە. فرهنگ اصگلاحات عرفاني، د. سيد جعفر سجادي، ص٧٩١.
واتا: تۆ کە شایانی ویلایەت نیت بەدرۆ خۆت وادەرمەخە کە شایەنتە، چونکە برنج شایانی کەر نییە و کەر دەبێ جۆ بخوات.

(٤) ئەم بەیتە ئاکاژەیە بۆ ئەم پەندە کوردیە ((قسە بیگێژە، بیبێژە، بیوێژە)). پەندی پێشینان، شێخ محەمەدی خاڵ ل٠٣١.

(٥) ئەم بەیتە ئاماژەیە بۆ ئەم پەندە کوردیە ((قسەیەك بکە کەڵك بگرێ، مەنێك بێوە سەربگرێ)) پەندی کوردی، خاڵ ل٣١٣.

(٦) ئەم بەیتە ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز ((وان ليس للأنسان الا ما سعى و ان سعيه سوف يرى)) النجم/٣٩-٤٠.
شاعری پێی وایە کە خۆهەڵکێشانی بەقسە لەپلە و پایەی مرۆڤ نزم دەکاتەوە و لێرەدا (کوڕی پلکە سەوەری) بۆ پایە نزمی مرۆڤ بەکارهاتووە، چونکە لەناو کوردەواری واباوە کە کوڕێ بەباوکی هەڵبدرێ نەك بەدایکی، خۆ جاری واش هەیە کە ژن سەرکردایەتی ماڵ دەکا و بەسەر پیاوەکەیدا زاڵە. بەڵام لێرەدا موخلیس مەبەستی لە کوڕی پلکە سەوەر بۆ پایە نزمییە.

| | |
|---|---|
| که ئەتوو هەروەکو ژن ئەچیە دەرێ | بە چ تووو هەروەکو ئەهلی هونەری |
| وەکو یەك نین خەزەف و دورِی سەدەف | کە ئەتوو فەرقی ئەگەی جانەوەری[1] |
| بەتەمای غونچە بی ساتێ مەخەوە | بگرە دامەنی بادی سەحەری |
| دڵی خۆت ڕاگرە بۆ یار چ دەکا | حەرەسی شاهی مەبزوە لە دەری[2] |
| بە قسە(موخلیس)ی بێ نوور و نەزەر | وەکو شەخسێکی بەنوور و نەزەرەی |

---

(١) **خەزەف**: کاسە و گۆزەی قورِ کە لە کوورە سوورکرابێتەوە.
**دورِ**: مرواری گەورە. **سەدەف**: شتێکی سپی سەختی بریقەدارە قۆپچە و شتی تری لێدروست دەکرێ.

(٢) **واتا**: تۆ کە لەژێر باڵی شێخی تەریقەت دای، دڵی خۆت بدەرێ، چونکە تۆ وەکو ئێشکچی دەرگانەی پاشا وایت، نابێ بزویت و بڕۆی.

# باربەر[1]

قەت لەگەڵ ئینسانی کەم یاری مەکە | گەر ببیتە باربەرت، باری مەکە[2]
غەیری سفڵە گەر کەسێکت دەست نەکەوت | گەر لەتۆفان دابی هاواری مەکە
چاکە هەر چاکە لەگەڵ سفڵەش بکە | مارە ئەمما قەت برینداری مەکە[3]
عاقڵێکت دەستکەوێ بیکە بەدۆست | قەت لە دۆستایەتی بێزاری مەکە
(موخلیسا) هەر یاری تەنیایی بکە | پێت ئەڵێم چیدیکە لاساری مەکە[4]

---

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزوومە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٢) کەم:کەم. ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیە ((انما مثل الجلیس الصالح وجلیس السوء کحامل المسك و نافخ الکیر، فحامل المسك اما ان یحذیك واما ان تبتاع منه واما ان تجد منه ریحا طیبة، ونافخ الکیر واما ان یحرق ثیابك واما ان تجد منه ریحا خبیثة)) فیض القدیر/ج١،ص٤.

لەنێوان (یاری و باری) رەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

(٣) لەنێوان (سفڵە و مار) دا لێکچواندنی حەختاو هەیە.

شاعیر داوا دەکات کە چاکە لەگەڵ سفڵەشدا بکەین و خراپەی لەگەڵ نەکەین ئەمەش پێچەوانەی ئەم پەندە کوردیەیە کە دەڵێ (نان بدە بەسەگ مەیدە بە سفڵە). پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا،کەریم شارەزا، ل١٤٠.

(٤) موخلیس هاورێیەتی عاقڵی پێ چاکە چونکە زیانی لێ نابینێ،گەر عاقڵ بەدەست نەکەوت داوای ژیانی تەنیایی و دوورەپەرێزیەکا، چونکە لەو کاتەدا دەتوانێ خۆی لەزمانی زمان درێژان بپارێزێ.

# ناکەس[1]

لەو زەمانە گوێ مەدە خوتبەی خەتیب | جوببەکەی دەفرۆشێ بۆ مەی(عن قریب)
وەعزی وەك ئاگر لەدەم دێتە دەری | قەلبی ساردی کاری لێ ناکا لەهیب[2]
هەر لەبۆ دونیایە بەحسی دین دەکا | دۆستی ڕاستی کەس نییە دینی غەریب[3]
کەس نییە بۆ یاری ئەوڕۆ دەست بدا | هەرچی دێ بۆ کاری خۆی ئەتدا فەریب
ئاشنایی قەت لەگەڵ ناکەس مەکە | گەر لەدونیا قات بێ ئینسانی نەجیب[4]
هەرکەسێکی عیشقی دونیای کەوتە سەر | دەردەچێتن کاری ناکا هیچ تەبیب
(موخلیسا)خۆت تالیبی دونیا مەکە | نەك ببی ڕۆژی قیامەت بێ نسیب[5]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی شەشی مەقسوورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.
شاعیر ڕووی دەمی لەو ووتاربێژانە دەکات کە گوتە و کردەوەیان یەك نییە و سەرقۆزی بن ئاڵۆزن و لە پەنای دین دنیا دەخۆن.

(٢) ئەم بەیتە ئاماژەیە بەم ئایەتە ((یا ایها الذین امنوا لم تقولون ما لاتفعلون کبر مقتاً عند الله ان تقولوا ما لاتفعلون)) الصف/٢-٣.
لەنێوان (سارد و لەهەب)دا دژیەك هەیە.

(٣) واتا: دینەکەی بۆ دونیا دەفرۆشێ. ئاماژەیە بەم ئایەتە ((ولا تشتروا بعهد الله ثمناً قليلا انما عند الله هو خير لكم ان كنتم تعلمون))النحا/٩٤.
لێرەدا (تشتروا) بە واتای فرۆشتن دێت و جیاوازی لەگەڵ کڕیندا نییە. المصحف المفسر،محمد فريد وجدى، ص٣٥٩.

(٤) قات: لە(قحگ)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، واتا:نەبوون یان کەمی هەر شتێ بەتایبەتی خواردەمەنی.

(٥) ئەم بەیتە ئاماژەیە بۆ ئەم فەرمودەیە ((ان الدنيا ملعونة ملعون مافيها سوى ذكرالله تعالى وما والاه وعالماً أو متعلماً). فيض القدير، ص٣٢٦.
کەواتە ئەوەی بەدونیا خەریك بێت قیامەتیشی بەنسیب نابێت چونکە فەرامۆشی دەکات.

# بازی بێ ڕنۆك[1]

ئەمن چ بکەم لەدەست نەفسی گەڕۆکم　　لەدەست ئەو نەفسە هەروەك فڕفڕۆکم
تەمایتی بۆتەمەع ڕامان بکێشێ　　لەلای وایە چرێس و چاوچنۆکم[2]
نە دێلێ پاشەکەفتیمان ببیتن　　ئەوایە هەستی بەرداتن بەرۆکم
خەریکی گرتنی دونیامە ئەمما　　وەکو بازێکی بێ باڵ و ڕنۆکم
ئەگەرچی زۆر تەمەع کارم لە دڵدا　　بەهەندێ چاکە یەکجا ترسنۆکم
لەڕەوسەی عومرەکەم چم بۆ نماوە　　دەبینی وا خەریکی خاپەڕۆکم[3]
لە خۆ نابیتەوە (موخلیس) لەتەدبیر　　کەچی ڕۆحم دەگاتە خنخنۆکم[4]

---

(١) لەبەحری هەزەجی شەشی مەحزوومە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.
موخلیس وەکو موسڵمانێك و سۆفییەك دژایەتی نەفسی خۆی دەکات و بێزارە لەدەستی، چونکە سۆفی دەبێ نەفسی خۆی بکوژێ و بەسەریدا زاڵ بێت بۆئەوی یەکەیەکە قۆناغەکانی سۆفیانە ببڕێت.

(٢) تەمایتی: بەتەمایە. چرێس: چلێس.

(٣) ڕەوسە: گەنم و جۆی ڕووت و بێ کا. خاپەڕۆك: بێ خەرمان، پاشماوە.
موخلیس لێرەدا وێنەیەکی شیعری داهێناوە و تەمەنی خۆی بە ڕەوسە چواندووە لە ڕەوسەکە چی بۆ نەماوە و بەناو ساڵ کەوتوە، بۆیە وا خەریکە خاپەڕۆکی تەمەنی کۆدەکاتەوە و هێشتا تەماعی دونیا بەری نەداوە.

(٤) خنخنۆك: گەروو، بینە قاقا.
واتا: هەرچەندە موخلیس بەناو ساڵ کەوتوەو پیربووە، کەچی هێشتا بۆ کاروباری دونیا لەتەگبیرکردن دایە و ئومێدی بە ژیان ماوە، چونکە مرۆڤ تا گەورە دەبێت لەتەمەن ئەوەندە حیرسی ژیانی زیاد دەبێت، جا موخلیس هێشتا لە تەگبیرکردن و هەڵسوڕاندنی کاروباری ژیانی نەبۆتەوە کەچی مەرگ بینەقاقای دەگرێ و بەناخی زەویدا دەکات.

# چاوەڕێی فرسەت[1]

**فیکری نێوچونە جەهەننەم هاتە نێو خانەی خەیـــاڵ**
**دەرس و دەوری لێم مشەوەش کرد غەمی ماڵ و منالّ[2]**

**ئەی فەلەك تۆ چیت لەگەڵ من خۆ ئەمن کافر نەبووم**
**خستومتە زیندانی عەجز و سیلسیلەی ئەهل و عەیال[3]**

**گەر بەچەنگاڵ گۆشت لە قەلبم هەڵکەنێ پێم خۆشترە**
**نەك لەبەینی سی هەزار ساڵ فکری ماڵم بێتە مـــاڵ[4]**

**گەرچی خۆ زۆر زەحمەتە تەرکی وەتەن کردوومە من**
**زۆر مونافینە لەگەڵ یێك کەسبی عیلم و کەسبی ماڵ[5]**

---

(١) **لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزوومە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.**
کاتێ کە موخلیس لە (کفری) بووە نامەیەك بۆ فەتاح ئاغای دووسەرە دەنوسێ و ئەم شیعرە لەناو نامەکەدا دەبێت. ئەم زانیارییەم لە عەلی فەتاح دزەیی وەرگرت.

(٢) موخلیس لەم غەزەلەدا بێزاری لە ژن و منداڵ دەردەبرێ و پێی وایە وەرگرتنی زانست و زانباری و خێزانداری ناگونجێن،وادیارە شاعیر لەبارێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی دا بووە سەرباری باری سۆفیانەکەی و هەردوکیان وایان لێکردووە شار و ماڵی بەجێبێڵێ و بەرەو کفری بچێت.
لەم بەیتەدا مەبەستی لە (جەهەننەم) ژن و منالّە.

(٣) **عەجز:** تەمبەڵی. **سیلسیلە:** زنجیرە. **عەیال:** خێزان.

(٤) لەم بەیتەدا (سی هەزار) ساڵ جۆرە پێوەنانێك (مبالغە)یە.
لەنێوان (ماڵ و بال)دا رەگەزدۆزی لاحیق هەیە.

(٥) **تەرکی وەتەن:** مەبەست لێی دوورکەوتنەوەیە لە (دووسەرە و هەولێر).
ئاماژەیە بۆ ئەم پەندە کوردیە(دوو گندۆرە (کاڵەك) بەدەستەکی هەڵناگیرێت)). پەندی کوردی، خاڵ، ل٢٢٦.

مەنشەئی فیتنە و بەڵای دونیا و قیامەت هەر ژنە

(فا نظروا هل اني فی هذا المقال في الضلال؟)

شاهیدم ئادەم لە جەننەت تاکو خۆی بوو چاکی خوارد
هەرکە حەووا هاتە لای لێی تێکچوو سەیری عەرز و حاڵ[1]

(موخلیسا) واچاکە بۆخۆت دابنیشی بێ قسە
فائیدەی نادا ئەمێستا گفتوگۆ و حوزن و مەلال[2]

(١) شاعیر لە بەیتی پێنجەمدا ژن دەکاتە سەرچاوەی فیتنە و بەڵای دونیا،بەڵام نەك هەموو ژنێ،بەڵگەشی ژیانی حەزرەتی ئادەمە لە بەهەشت هەرکە بەتەنیا بوو لەوێ دەژیا ،کە حەووا لێی پەیدا بوو هەردوکیان توشی خواردنی بەری دارە قەدەغەکراوەکە بوون لەبەهەشت دەرکران،هۆیەکەشی گوایە حەزرەتی حەووا بووە لەسەرتا ئەو خواردویەتی بەڵام لە قورئاندا هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەمە نییە و خوا دەفەرموێ ((یا أدم اسکن أنت و زوجك الجنة و کلا منها حیث شئتما ولاتقربا هذه الشجرة فتکونا من الظالمین، فاضلها الشیطان عنها فأخرجهما مما کان فیه)) البقرة/٣٥ – ٣٦.

(٢) لەمێستا: ئێستا. مەلال: خەم و پەژارە.

# غەزەل[1]

لەب شەکەر من تەزکەرەم ڕۆژی ئەزەل وەرگرتووە

بۆچی ئەمڕۆ کە بیتاقەم نادەیێ؟چـــم کردووە؟[2]

مەتڵەبت گەر ڕیشوەتە فەرموو ئەفەندم چت دەوێ

ماڵ و ئەولاد و سەری من وا لەپێش دەستی تووە

وانەکەی ئەمما ڕەقیب لەم مەسئەلە دەوری هەبێ

چونکە زوڵم و مەکری هەروەك ئاغە واتان فێربووە[3]

نەقدی رووحی من لەمن وەرنەگری بۆ تۆ خۆی ئەخوا

قـــــەندی لێوی تووشی گەر وەرگرتبێ وایکردووە

دڵ کەوا مەئلوفی چاکەی وەسڵی تۆیە بەینێکە

چایەچی و چایەی نەدیوە سەبرو ئارامی چووە[4]

هەرچی مەئمونی ئیدارەی حوسنی تۆیە یەك بە یەك

گەربکەی کەشفی دەزانی هەرکە خائین دەرچووە

---

(١) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزوومە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
ئەم غەزەلە لە ڤۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٩٤، ل ٣٨-٤٠ بڵاوکراوەتەوە.

(٢) بیتاقە: مەبەستی بیتاقەی شەکر و چاو زەخیرەیە باسی قڕی و فاتی جەنگی دووەمی جیهانی دەکات.
واتا: لەڕۆژی ئەزەلەوە خودا رۆزیی منی نوسیوە و کەچی تۆ دەتەوێ بیبڕی و پسولەی خۆراکم نەدەیێ.

(٣) هەرچەندە موخلیس زۆر خۆشەویستی فەتاح ئاخای دووسەرە بووە،ئەویش ئەو ئاغایەی خۆشویستووە، بەڵام لێرە ئاماژە فرت و فێڵ و ستەمی هەندی لە ئاغایەکان کردووە، چونکە لەو سەردەمەدا ستەمەیان بەناوبانگ کردووە.

(٤) مەئلوف: هۆگر. وادیارە موخلیس ماوەیەکە شەکروچای نەدیوە و تامی چای نەکردووە چونکە پسولەی خۆراکی پێنەدراوە.

تۆ کەوا سوڵتانی، شاهم مەیلی زوڵمت گەرنەبی
دەفعەیێ پسیار نەکەی ڕەعیەت کەوا حاڵی کووە

سەیری ئەم گورگانەکە ئەم عاشقانەچۆن ئەخۆن
بێ خەبەر ماوە ئەمیرمەستە یاخۆ نوستووە[1]

شاری تۆیە عاسیمەبۆ شاری مەعشوقانی تر
عاسیمە جێی عەدلە جانابزوڵمی کەی تێدابووە؟![2]

گەر موسڵمانن بە فەخری ئەنبیاتان سوند دەدەم
گەر نەسارانە بە عیساکەی دیانەت وابـــووە[3]

وایە عیشقی دولبەران دەخلی بەسەر دیندا نییە
خۆت و ویژدانت تەماشاکەن چمان لێهاتـــووە[4]

ئەی خودا هاوارە هەرخۆت زوو بەهاوارمــــــان وەرە
گەر ئەتوو لوتفێ نەکەی دەستمان لەرووحمان شوشتووە

مەسئەلەی تەموینی عشقت غەدری زۆر تێدا هەیـــــە
چەند کەسی وەك موخلیسی حەقداری مەحرروم کردووە

---

(١) موخلیس ڕەخنە لەدەسەڵات (عەبدول ئیلاه) دەگرێ کەوا ئاگای لەخەڵکی رەمەکی نەماوە و وادیارە ئەمیش مەیلی لەزۆر و ستەمە، ئەگینا پرسیاری حاڵی میللەت دەکات.
ئەمیر: مەبەستی لە عەبدول ئیلاهە.

(٢) شاعیر عەبدول ئیلاه دەدوێنێ کە لە بەغدای پایتەختەو ئاگاداری دەکاتەوە کە پایتەخت دەبێ پایتەختی دادپەروەری بێ نەك پایتەختی زۆرداری.

(٣) وادیارە موخلیس هێشتا لەگومان دایە کە ئەو لێپرسراوە ئایا موسڵمانە یا مەسیحیە؟ بەڵام پێدەچێ مەسیحی بوبێ چونکە لەبەیتەکەی دیکەدا دەڵێ: عەشق دەخلی بەسەر دیندا نییە.

(٤) واتا: ئەوەی توشی عەشقی دولبەران بوبێ، عەشقەکەی وای لێدەکات ئاگای لە ئاینی دولبەر نامێنێ وجاری وا هەیە کە موسڵمانێ عەشقی دیانێ دەبێت یان بەپێچەوانەوە، هەروەکو شێخی سەنعان کە گیرۆدەی داوی دولبەرێکی تەرسایی بوو.
ئەم غەزەلە دیمەنێکی باری ئابوری ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی بەدیاردەخات، کەخەڵکی توشی قڕی و قاتی بونە و ژیان کەوتوتە سەر پسولەی ئازووخە و ئەوەی ئەو پسولەیەی نەبووە بەرەو ئەتوتی مردن چووە.وادیارە موخلیس و چەندانی وەکو ئەو لەو پسولەیە بێبەش بوونە، بەڵام شاعیر وەستایانە و پسپۆڕانە بۆ مەسەلەکە چووەو ڕاستەوخۆ نایلرکێنێ بەڵکو تەموینەکەی بەتەموینی عەشق داناوە و جۆرە پەردەیەکی خستوتە سەری بۆ ئەوەی واتایەکی سادە و کرچ و کاڵ نەداتە دەستەوە.

# خانەدان[1]

له دونيا نەما هيچ ئاشنايـــى      زەمينى گرت غوبارى بێ وەفايى
هونەرمەندان لەبەر دەستى خەسيا      دەبينى وا له تەنگ حاڵى و گەدايى[2]
ئەوەى دوێنى له دونيا خانەدان بوو      ئەوا توشى بوو ئەورۆ نانەوايى
بەچـــاوى عاقڵان بڕوانە ئافاق      لـــەهيچ جێگا نەماوە ڕۆشنايى
زمانت(موخليس) بگرە له شەكوا      بەسەر دەڕوا سەبرکە بێ نەوايى

---

(١) له بەحرى هەزەجى هەشتى مەحزووفن: مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن فعولن.
(٢) خەسيان: کۆى (خەسيس)ە بەزاڵاى هيچ وپوچ دێت.
بەگشتى موخليس باسى زەمانەوخەڵکەکەى دەکات کەوا پياوى ڕەندومەند ماڵى خۆى نەدراوەتێ و کەوتوتە ژێر دەسەڵاتى مرۆڤى پڕوپوچ و لەدونيا لەبەر بێ دادپەروەرى ڕەش هەڵگەراوەوڕووناکيى تێدا نەماوە.
هەر دەڵێى موخليس لەسەدەى بيست ويەکەم دەژى و ئەوەى ئاکار و ڕەوشتە بارى کردووە و بێ ئاکارى بارکوڵەى خۆى داخشتووە.

# مونافیق[1]

| | |
|---|---|
| بەبێ دین نامەوێتن موڵك و میللەت | چ قەومێك ناچتە[2] درە بێ دین لە زیللەت |
| هەتا نەکرێ بەچاکی خدمەتی دین | خودا نانێتە سەرکەس تاجی عیزەت |

---

(١) لەبەحری هەزەجی هەشتی مەحزوومە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.

موخلیس لەم شیعرەدا باسی واقیعی ئاین دەکات لە کۆمەڵگای کوردەواری و پێی وایە گڵۆڵەکەی سەرەولێژە، بۆیە بە ئاشکرا ڕایدەگەنێ کە بەبێ ئاین سامانی دونیاومیللەتی ناوێ، واتە ئەگەر سامانداری و میللەت بونە هۆی لەناوچونی ئاین و ئەو دەست بە ئاینەکەیەوە دەگرێت، چونکە لەو باوەڕەدایە هیچ میللەتێك بەبێ ئاین لە زیللەت دەرناچێت.

لێرەدا شاعیر هەمان بۆچونی ئەحمەدی خانی دووبارە دەکاتەوە کە ئەگەر کورد لەناوخۆ یەکبن و سەرۆکیان هەبێ ئەوا دین و دەوڵەتیان دەبێت،کەوتە خانی دەوڵەتی بێ دین نەویستووە،هەروەك دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تەکمیل دکر مە دین و دەوڵەت | تەحسیل دکر مە عیلم و حیکمەت |

(مەم و زین، ئەمینێ ئوسمان، ل٥٣)

موخلیس سیاسەت و ئاینی پێکەوە دەوێت و لەوباوەڕەیە هەر سیاسەك بەبێ ئاین هەوڵبداوخۆی هەڵبکێشێ لە ئەنجامدا تێدەچێ و هیچ بە هیچ ناکات، بەڵگەشی ئەوەیە کە موسڵمانەکان کاتی خۆی بە ئاین بەسەر دوژمندا سەرکەوتن،ئێستا کوردو موسڵمانەکان گەر بۆ ئاینەکەیان نەگەڕێنەوە هەمیشە ژێردەست دەبن و سەرناکەون.

شاعیر لەوکاتەدا هەست بە نەبوونی هێمنی و ئاسایش و بەختەوەری دەکات و پێی وایە دووڕوویی و ناسیۆنالیستی کوێرانە دوو هۆی سەرەکین بۆ لە ناوبردنی هێمنی و بەختیاری،چونکە ناسیۆنالیستی ئەگەر توندڕەوی و تاکڕەوی پێوەدیاربوو و سنوری ئازادی خەڵکی بەزاند ئەوا دەبێتە بەڵا لەسەر خۆی.

موخلیس لەبەرئەوەی مەلایە و سەر بەتەریقەتە بۆیە خەم لەوە دەخوا بنەمای فەرمان بە چاکەونەهی لەخراپە نەماوە و کەس لەسەر گوناه و تاوانی شەرعی سزا نادرێت و قەساس جێبەجێ ناکرێت. پاشان لەڕوانگەی ئاینەوە سەیری جولەکە دەکات و داخ لەوە دەخوا جولەکە لە دیلێتیەوە ئێستا وا خەریکە موسڵمانان بەدیل دەکەن و داوامان لێدەکات کە نابێ بەوە دڵخۆشبین کە جوولەکە بەسەر موسڵماناندا زاڵ بێت. هەروەها موخلیس دژی ئەو تێکەڵبونەی نێرو مێیە کە سنووری شەرع دەبەزێنێ و نافەتی لێدەکەوێتەوە،بەتایبەتی تێکەڵبوونی کوڕوکچ لەقوتابخانە و زانکۆکان.

(٢) ناچە: ناچێتە. لەمە داڕشتنی ناوچەییە و لەبەر کێشی شیعرەکە بەکاری هێناوە.

لەدونیا گەر نەمێنی سێبەری دین   لەکوێ عالەم دەکاتن ئیستیراحەت

بەبێ دینی کەسێ خۆی هەڵبکێشێ[1]   ملی دەشکێ لەمەیدانی سیاسەت

کەسێ بۆ دین نەبێ کوشتن و بڕینی   خودا قەت کەیفی خۆشی ناکا بەنەسرەت

کەسێکی نەفسی فیرعەونی هەبێتن   دەبێتە جووی جوان[2] بێ قەدروقیمەت

بەهێزی دین نەبێ تازە موسڵمان   بەسەر کەس ناکەون تا قیامەت

موسڵمان تا موناڧق بن لەگەڵ یێك   ئەوەی دەست بۆ ببەن دەبتە[3] نەدامەت

کە خوا فەرمووی برانە ئەهلی ئیمان   لەنێو ئەسحاب ئەما غەش و خیانەت

لەبۆچی بوو کەسەرکەوتن لە عالەم   لەبەر ئیمان و ئیخلاس و سەداقەت

نیفاق و قەومییەت ئەورۆکە وایکرد   بەجارێکی لەکیسی داین سەعادەت

وەرە مەمرە کە جوو بتوانێ ئەورۆ   موسڵمانان ئەسیرکاتن بە قووەت

کەسێکی پێی خۆش نەبێتن جوو نزم بێ   خودا نزمی دەکا و دەیکاتە عیبرەت

موسڵمان گەر موسڵمان بن بەڕاستی   وەها ناکەونە نێو چاری[4] ڕەزالەت

لەهیچ جێگا لەنێو جەهش و ئەهالی   لەسەر بێ شەرعی کەس ناکرێ ئیهانەت

مومەزەف قەتعی راتب بۆچی نەکرێ   نوێژی گەر چواند بێ عوزر و عیللەت

شەراب خۆر بۆ جەزا بار ناکرێتن   سفوور چۆن ڕێدەداتن ئەهلی غیرەت

کچ وکوڕ پێکەوە بۆچی بخوێنن   لەگەڵ یێك نێرومێ بچنە زیارەت

تەماشای سینەماو مەلهایەکان کە   ژن و پیاو پێکەوە ڕووت وەك قیامەت

موسڵمان بۆیە وەك جووی پێشوو ئەورۆ   هەموو کەوتونەتە نێو تەیهو[5] حیرەت

هەتا دەمرن دەبی لەو حاڵە دابن   هەتاکو نێنەوە سەر ڕێی حەقیقەت

---

(١) هەربکێشێ: هەڵبکێشێ. دارشتنی ناوچەی هەولێرە.

(٢) جووی جوان: ووشەی (جوو) لەکوردەواریدا وەکو ئیدیەمێك بەکاردێت بەمەبەستی ترسنۆکی، چونکە جوولەکە کەمینە بوون بۆیە بە ترسنۆك ناویان دەرچوو بوو. پاشان جوو سەلماندیان کە ترسنۆك نین.

(٣) دەبتە: دەبێتە، ووشەیەکی ناوچەییە و لەبەر کێشی شیعری هاتووە.

(٤) چاری: چاڵی. وشەیەکی ناوچەییە.

(٥) تەیه: سەرلێشێوان، گیرۆدەبی.

# ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات[1]

گەیمەچەرخێکی دەورە دۆرابێ | دوورە دەربچی لەسەر دۆڵابی[2]
ژوور کەوتۆتە ژێر ،ژێر کەتۆتە ژوور | کار وا شێواوە کەس پێی چانابی
ئەوڕۆ سیاسەت ئەو کەس دەگێڕی[3] | گەر پێی بڵێی گەرنگەر ڕازی نابی
بێ دین سیاسەت وەحشەت دەداتێ | چاکە سیاسەت دینی تێدا بی[4]
دونیات کەبۆ هات تەنیا خۆت مەیخۆ | نەیدەی بەژێردەست گەورییت نابی[5]
تاجی گەورەیی بۆتۆبێ بەسیە | نیعمەت و خۆشی با بۆ گەدا بی

---

(١) ئەم غەزەلە لەسەر کێشی خۆماڵی کوردیە و ١٠ بڕگەیە: ٥+٥=١٠.
هەرچەندە لەڕووی کێشەوە غەزەلەکە خۆماڵییە بەڵام سەرواکەی ستونییە و پەیڕەوی شیعری کۆنی کردووە.
موخلیس گلەیی لەپیاوانی سیاسەتی سەردەمی خوی دەکات و پێی وایە لە عەڵبەی دنکەکی تێناگەن وکەس نازانێ کوڕی کێن، بۆیە وەکو نەدی و بدی چنگیان خستوتە کەلاك و تەماعی دونیاوخۆیان و خەڵکیان لەبیر کردووە و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوونەتە ڕووگەیان، بۆیە وا بەگژ ئایندا دێن و پێیان وایە دین پەیوەندی بەسیاسەتەوە نییە و لەم ڕووەوە زوڕنای دەرەرەوە لێدەدەن و هێندە سەنگین نین کە بزانن هەر دەوروبەرێك سیاسەتێکی تایبەتی گەرەکە.
(٢) دەورەدۆڕاب: شەق و پەق، تێکشکاو. دوڵاب: چەرخی ئاوێ،گرگرە .
(٣) ئەوکەس دەگێڕی: لەڕووی زمانەوە ناتەواوە و (ئەوکەس دەیگێڕی) ڕاستە.
موخلیس هەربەجارێ پایەی سیاسەتوانانی ئەوسەردەمەی نزم کردوتەوەو کەریش پێی قایل نییە. لەوانەیە لەبەر ئەڵقە لەگوێی و نۆکەرایەتیان بەمجۆر هێرشی کردبنە سەر.
(٤) موخلیس لەوباوەڕەیە کە دین و سیاسەت بەیەکەوە دەتوانن خزمەت پێشکەش بە جەماوەر بکەن، گەر لەیەکدی جودا کرانەوە بێهودە دەبن.
(٥) وادیارە ئەوانە تازە دونیایان بۆ هاتووەو کەوتونەتە ناو نازونیعمەتەوە بۆیە دەڵێ: بەشی ڕەش وڕووتی جەماوەریش بدەن. هەرچەندە ئەم غەزەلە ساڵی نوسینی لەسەر نەنوسراوە بەڵام کورد تەنیا لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧٤ توانییان دەم لە سیاسەتی بەڕێوەبردن بدەن و ڕەوسەی تەماع دەرچوو و گەلێ) لێپرسراوانی ئەو سەردەمە تەماع کوێری کردن و کوردو کوردستانیان فەراموش کرد.

تۆی پاکژ بدە، پاکژ شین دەبی    تۆی بیژیایەتی کەس نابتە بابی[1]
گەر خۆشیت دەوێ لەو جێگای کە لێی    نابی لەگەڵ کەس هیچ ناتەبا بی
چت لەڕۆژئاواو چت لەڕۆژهەڵات    ناژی بەخۆشی گەر ڕووت لەولابی[2]
دوو چشت پێویستە ئینسان هەیبیتن    دونیا و دینێکی خوا پێی ڕەزابی[3]
باقی چ بکەی شەرمەزار دەبی    بۆ تەمەع مەحوو شەرمەزار نابی[4]

---

(١) موخلیس داوایان لێدەکات تۆوی برایەتی و ئازادی بدەن نەك تۆوی ناکۆکی ودووبەرەکی چونکە لەوسەردەمەدا حکومەت هەوڵی دەدا هەندێکیان بەپارەو تەماع بکڕێ وبەگژ یەکیان دابدات.

(٢) موخلیس پێی وایە هەتا کورد پشت بە وڵاتەکانی سۆشیالیزمی و سەرمایەداری ببەستێ ژیانی خۆش نابێ و ئاگاتە ئامانج چونکە هەرئەوانە بوون کەوا کوردستانیان پارچە پارچە کرد.

(٣) هەمیسان شاعیر لەوباوەڕەیە کە دونیاودین بەیەکەوە ژیانی هاووڵاتیان خۆش دەکەن چونکە دین هەمیشە لەخزمەتی میللەتان دایە بەڵام دینی ڕاستەقینە نەك دینێکی پینەکراووموورتەبەکراو.

(٤) وادیارە لێپرسراوانی ئەو سەردەمە زۆریان تەماعکار بوونە بۆیە لەم غەزەلەدا لە چەند شوێنێك ئاماژەی پێدەکات.

# هەربژی درۆ[1]

(١) ئەم قەسیدەیە لەسەر بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

ئەم قەسیدە(٤٧) بەیتەی موخلیس لەدوو سەردەمی جیاواز نوسراوەو بریتیە لەرەخنەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی.بەبڕوای من لەنێوان ساڵانی ١٩٥٩-١٩٦٣ نوسراوە چونکە ڕووداوەکانی سەر بەودوو سەردەمەن.باڵا دەستبوونی شیوعیەکان لە ١٩٥٩ سەریهەڵدا و توانیان بچنە ناو جەماوەرەوە و مژدەی گەلێ شتیان پێ بدەن که باری ژیانیان بگۆڕێ،لەوانەش هێنانی ئاووکارەباوتراکتۆرودەڕاسە و دروستکردنی گوندی نوێ و.....هتد.بەڵام هاتنی شێخ عەواس بۆ ناوچە کوردنشینەکان و ئاوارەبوونی خەڵك و تاڵانکردنیان لەساڵی ١٩٦٣ ڕوویدا.

موخلیس بەپێی قەناعەتی خۆی باوەڕی بەم مژدانە نیە و پێی وایە درۆیە وادیارە درۆی حیزبەکان لەو سەردەمەدا زۆربووە بۆیە شاعیر لەکۆتایی هەربەیتێك رستەی (هەربژی یاخوا درۆ)ی دووبارە دەکاتەوە, لەلایەکی دیکەوە شاعیر پێی وایە هەوڵی ئەو کەسانە هیچی بۆ خێروبێری ڕەش ورووتی میللەت نیە و هەمووی بەیەکەوە هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی دینی میللەت،چونکە بەپێی قەسیدەکە دیارە کۆمەڵێ لەوکاتە پەیدابوون بۆ زیندوو کردنەوەی ئاینی زەردەشتی و بۆ ئەمەش ئاگری نەورۆزیان کردوتە ڕەمزی ئەو ئاینە و هەرلەبەر ئەوەیە شاعیر دژی ئەو ئاینە وەستاوە بە وشەی (نەورۆز چییان)ناوی بردوون.

قەسیدەکە بەگشتی لەسەر چەند تەوەرەیەك دەدوێ لەوانەش:

أ- سەرەتا باسی درۆ دەکات کە لەو سەردمەدا بوتە گەنجینەو لەڕێگەی درۆی زلەوە ژیانی خۆیان مسوگەر کردووە و خەڵکی سادەی پێ هەڵدەخەڵەتینن.

ب- لەو درۆوبانگەشانەی کە حیزبەکان دەیکەن بۆ ئەوەی جەماوەری نەخوێندەوار لەخۆیان کۆ بکەنەوە ،هێنانی ئاووکارەبا و تراکتۆرودەڕاسە ودروستکردنی نەوشخانەورێگای قیرتاوو قەسرو قەمەرە بۆ دێهاتیان و مژدەپێدانی حەسانەوەیانە لەجوتکردن و دروونەوتێلەکێشان و کاروباری سەر جۆخینیان.

ج- ئامادەبوونی خەڵکە لە ئاهەنگە حیزبیەکان و دەرخستنی بێکاری ئەوانەیە کە ژیانیان لەسەر قەردەو کەچی ناچاریان دەکەن بێنە ئاهەنگەکان و لەبەیانی هەتا ئێوارە چەپڵە لێدەن و پاشان یارمەتی حیزبیشیان لێدەستێنن و ئینجا لەکۆتایی دواندەرێ چەند قسەیەکی لووسیان بۆ دەکا بەچەند بەڵێنێکی درۆ بەرێیان دەکەن.

د- شاعیر لەوە نارەحەتە کە لەو ئاهەنگ و کۆبونەوانە ژن وپیاو تێکەڵن و ئادابی ئەو سەردەمەیان تێکداوە و بەدوڵ و زوڕنا هەڵیان دەپەڕێنن.

ه- موخلیس باسی ئەو دەربەدەری و تاڵان و بڕۆیانە دەکات کە عەرەبەکان لەساڵی ١٩٦٢-١٩٦٣ کردیان و قەراج وکەندێناوە و هەندێ لەدێهاتەکانی مولکیە و ناوچەی ساڵەیی گرتەوەیەکێ لە سەرکردەکانیان شێخ عەواس بوو کە گوندی کوردەکانی داگیرکردبوو.جا شاعیر وەسفی ئەو خەڵکە دەکات چۆن دەربەدەر بوون و چۆن توشی نەخۆشی و برسەڵی بوون و تانەش لەو حیزبانە دەدات کەهیچ

**هەر درۆ ئەورۆکە ژینە،هەربژی یاخـــوا درۆ**

**بۆ بەشەر بویتە خەزینە، هەربژی یاخوا درۆ**

**هەردرۆیە کارەبای دنیاتی وا ڕۆن کردووە**

**لۆکس و فانۆس چ نینە، هەربژی یاخوا درۆ**

**دێ نییە ئەورۆ لەدنیاتان کە ئاویژگە نەبی[1]**

**دەغڵ ودانی زۆر بچینە، هەربژی یاخوا درۆ**

**هەر تەرەکتۆری درۆیانە دەسوڕێ ڕۆژوشەو**

**جۆت وجۆتیار لێ کەتینە[2]، هەربژی یاخوا درۆ**

**سەیری دەڕاسەی درۆیان چۆن تەبارەی دایتە بەر**

**چەندە پان وچەند بەرینە، هەربژی یاخـــوا درۆ**

**کاك سەپان وتێلە کێشمان،وا لەماڵ دانیشتوون**

**ئەو مەم وئەو خوشکە زینە، هەربژی یاخوا درۆ**

**پاش ئەوەی ناو هاتە دنیات،هیچ نەمات هەڵناگری**

**سەیری جۆخینیان[3] ببینە، هەربژی یاخـــوا درۆ**

**بۆ هەژاران وا لەدنیات،خەستەخانە نیش دەکات**

**کـــا ئەوەی خاوەن برینە؟ هەربژی یاخوا درۆ**

---

ڕوڵیکیان نەبووە لە هێور کردنەوەی ئەو باروزرووفە ناهەموارە.پاشان ڕویان تێدەکاو دەڵێ:کوا ئەوانەی کوورەی درۆیان دەجۆشاندوبۆچی دیارنین و بۆ بەگژ ئەو عەرەبانە دا ناچنەوە؟

و- شاعیر ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو درۆیانەی ئێمەیان هەڵخەڵتاند وا خەریکە ڕوو لەووڵاتی حیجاز دەکاودەیەوێ ئەوێش تێکبدات.موخلیس لەبەر ئەوەی مەککەومەدینە لەو ووڵاتەیە و شوێنی حەجی موسڵمانانە بۆیە خەمی ئەوەیەتی بیری سۆشیالیزمی بەرەو ئەوێ بڕوات.

ز- موخلیس ناوی شارە کوردیەکانی هێناوەوپێی وایە موصل و هەولێروکەرکوك وسلێمانی کوردستانەوهەموویان بوونەتە شوێنی لەقەنارەدانی کوردان و سەربڕینیان.

(١) **ئاویژگە:** بەراو،تێراو.

(٢) **لێ کەتینە:** لێی کەوتونە،پەکیان کەوتووە.

(٣) **جۆخین:** خەرمان.

وا خەریکن هەرچی دێیە جادەیەکی بۆ ببەن
تا بڵێی پان وبەرینە، هەربژی یاخـــوا درۆ

هەرچی ماڵ بی نابی سەییارەی خسوسیی پێ نەدەن
تـــــــۆزی ڕێگا بەس ببینــــە، هەربژی یاخوا درۆ

بەسیە تاگەی وا لەخانووی خشت و قوڕ ئەوها دەژین
خانووەکەی خۆت هەر وەشینە[1]، هەربژی یاخوا درۆ

وا موهەندیس دێتە دێهات جێ قەسری دیاری بکا
جـــێ بناغەی هەڵقەنینە، هەربژی یاخوا درۆ

قەسرکان هەرکە تەواو بوون،مۆدەیان ڕاکێشنە نێو
کاکی خۆم خۆت ڕاوەشینە، هەربژی یاخـــوا درۆ

هەرکە وەقتی حەفلە هات،عالەم لەدێیان دێنە شار
عاشقی حەرد[2] وزەوینە، هەربژی یاخـــــوا درۆ

دەچنە پێش دەست ئەو کەسەی دەستەبەری ئەو کارەیە
بـــەو جلی وا پینــە پینــــە، هەربژی یاخـــــوا درۆ

کەس لەوانە خاوەنی فلسێك نییە بۆ شار کەدێ
قەرد لەبۆی ئەسبابی ژینە، هەربژی یاخوا درۆ

ڕۆژی جومعەی ڕەمەزان کۆبوونەوەی ئەو حەفلەیە
دۆڕ کوتان و هەر پەڕینە[3]، هەربژی یاخوا درۆ

ئەو براو خوشکانە وەك بزن و تەگە تێك بەردەبن
مرقە مرق و.... هەربژی یاخوادرۆ

پێشڕەوی چینی ژن و چینی پیاو لەو حەفلەیە
کەسك و زەردوسەر سپینە، هەربژی یاخوا درۆ

---

(١) هەروەشینە: هەڵوەشێنە.

(٢) حەرد: زەوی. موخلیس لەهەموو شیعرەکانی لەجیاتی (عەرد) وشەی (حەرد) بەکاردێنێ و جۆرێکە لەشێوازی شیعرەکانی.

(٣) دۆڕ: دوڵ / هەرپەڕینە: هەڵپەڕینە.

پاش ئەوەی شایی تەواو بوو یێك بە یێك پێیان دەڵێ
کاك فلان شاباشی بینە، هەربژی یاخوا درۆ
هەرچی پێویست لەبۆ سندووقی حیزبی دادەنێن
هەر بژی و هەر ئافەرینە، هەربژی یاخوا درۆ
باسی کشت وکێر[1] دەکەن تا پارەکەی وەردەگری لێی
بەو قسە جەرگی برینە، هەربژی یاخوا درۆ
ئیشی خۆیان هەرکە دیت ئەوجا خەتیبی بانگ دەکەن
پێی دەڵێن خوتبە بخوێنە، هەربژی یاخوا درۆ
بەو زمانی لووس کەوا دێ دەست دەکاتە خوێندنەوە
ڕوو لە دونیای پشت لەدینە، هەربژی یاخوا درۆ
بۆنی ئینسانییەت و دین ناگرێ لەو خوتبەیە
گوێ بدێ سەرهەرتەکینە[2]، هەربژی یاخوا درۆ
هەرچی خۆی ونەفسی وشەیتان ئارەزوویان بێ دەڵێ
تەرکی دین و خوێن مژینە، هەربژی یاخوا درۆ
بەر لەپێغەمبەر چ دینێکیان بووە ئەویان دەوێ
ئاگری نەورۆز ببینە، هەربژی یاخوا درۆ
عالەم و خۆیان سووتاند ئاگری نەورۆزچییان[3]
دووکەڵی تاریك و شینە، هەربژی یاخوا درۆ
ئەو هەموو عالەمەیان چۆن کردە ئاردی نێودڕك
شێخ عەواسیان جێ نشینە، هەربژی یاخوا درۆ
سەیری ڕێگایان بکە هەر باربەکۆرە[4] دێ لە ڕێ
ڕۆژوشەو هەر تێك پەڕینە، هەربژی یاخوا درۆ

---

(١) **کشت وکێر**: کشت وکاڵ
(٢) **سەرهەرتەکینە**: سەرهەڵتەکێنە.
(٣) **نەورۆزچی**: ئەمە دارشتنێکی تازەی شاعیرە، واتا: ئەوەی ئاهەنگی نەورۆز ڕێك دەخات.
(٤) **باربەکۆر**: باربەکوڵ

چەند کەشمنگ و چەندە برسی و چەندە تینوونە دەڕۆن
دەنگـــی منداڵ و گریـنـــە، هەربژی یاخوا درۆ
چەیش وفووەت چوو لەبۆ هەرچێ قیامەت دێتە وێ
گوێ بدێ گریان و شینە، هەربژی یاخوا درۆ
هەر درۆیە وا دەسوڕێ دین و دونیا تێك دەدا
دوژمنی دونیاودینە، هەربژی یاخوا درۆ
موصڵ و هەولێروکەرکوك و سلێمانی هەموو
جێ قنارەو سەربڕینە، هەربژی یاخوا درۆ
ئەو درۆی ئەو کارەساتەی کرد بە ئێمە،پێومیە
بچتە لای مەککە و مەدینە، هەربژی یاخوا درۆ
تا ئەوێش تێك بەربدا یێکجاری دونیا پیس بکا
بۆ فەساد برسی وخورینە، هەربژی یاخوا درۆ
ڕووی زەمینی گرت درۆبرۆیی گەیشتە ئاسمان
وا لەلای مانگ دابەزینە، هەربژی یاخوا درۆ
بۆ درۆ هەر سەگ دەنێرێ بچتە ئاسمان تێ بگە
چونە ئاسمان سەگ وەڕینە، هەربژی یاخوا درۆ
ئەی براگەی دین پەرست وباب موسڵمان و عەزیز
خەونی بێبەر بەس ببینە، هەربژی یاخوا درۆ
بەربدە پێقەی درۆزن موچەخۆری بۆ مەکە
موچەکەی کوژران و خینە، هەربژی یاخوا درۆ
ئەو کەسانەی ئەمن و تۆیان پێدەوێ بۆ دین نییە
هەر لەبۆ تێکدانی دینە، هەربژی یاخوا درۆ
بۆ دیارنین بێنە مەیدان گەفکەری ئێمەی هەزار
هەستە دوژمن هەرقەنینە[1]، هەربژی یاخوا درۆ

---

(١) هەرقەنینە: هەڵقەنینە.

کا[1] ئەوەی دەیویست ئێمە لێ بخاودەرمان بکا

خوا هەیە ئێوە چ نینە، هەربژی یاخوا درۆ

ئەو کەسەی کوورەی درۆیانی دەجۆشاند کێوەچوون[2]

عالەمێك سوتای ئەوینە، هەربژی یاخـــــوا درۆ

ئەو کەسەی دوونێ دیاربوو کەوتووە ئەورۆ لەماڵ

چاوەکەی حیزت هەڵینە، هەربژی یاخـــوا درۆ

ئەو کەسەی ئەو عالەمەی تێکدا لەبۆچـی نامرن[3]

هەر خەریکی زۆر وەرینە، هەربژی یاخوا درۆ

عەیبە وەك خاتوون لەبەرچاوی خەڵك خۆت بادەدەی

دوژمنیـــــشت وا خەنینـــە[4]، هەربژی یاخوا درۆ

---

(١) کا: کوا.

(٢) چوون: ڕاستەکەی (چوو)ە چونکە بکەر (کەسە)و تاکە.

(٣) نامرن: ڕاستیکەی (نامرێ)ە چونکە بکەر (کەسە)و تاکە.

(٤) خەنینە: لەخۆشیدان، شاگەشکەبوون.

# شیعری لاواندنەوە

شیعری لاواندنەوە ئەو شیعرەیە کە بۆ مردنی کەس وکاروخزم و دۆست و هاوڕێیان دەهۆنرێتەوە و لەو جۆرە شیعرانە ستایش و وەسف تێکەڵ دەکرێ و مردووەکەی پیدەلاوێنرێتەوە. بێگومان ئەمجۆرە شیعرەش خودییە و هەست وسۆزی شاعیری تێدایە بەچەند پلەیەکی جیاواز،چەند ئەو مردووە لە شاعیرەوە نزیك بێ و خۆشەویستی بێ هێندە زیاتر سۆزوهەستی دەجوڵێ و کوورەی دەروونی دەجۆشێ و شیعرەکە لەڕووی هونەرییەوە دەوڵەمەندتر دەبێت.

موخلیسی شاعیر شیوەنی بۆ دوو کەسان کردووە،یەکێکیان لەخۆی گەورەتر بەتەمەن و ئەوی دیکە کوڕی مەلایەکی هاوساڵی خۆی بووە.گەر بەراوردێ لەنێوان شیعرەکەی بۆ (شێخ جەلالی ترپەسیپانی)و شیعرەکەی بۆ (ئەبوبەکری کوڕی مەلا محمدی عەرهادی) بکەین،کۆمەڵێك جیاوازی بەدی دەکەین کەئەوەی بۆ (ئەبو بەکر)ی نوسیوە لەڕووی سۆزوخەیاڵ وهەستەوە گەلێ بەگوڕوخۆشترە لەوی دیکە.

لەشیوەنەکەی بۆ (شێخ جەلال) ئەو هەست وسۆزە بەتینە بەدی ناکرێ وتەنیا لەسەرەتا بەبای بەیانی ڕادەسپێرێ کە هەستێ و سەلام لە هاوڕێیانی بکاو تێیان بگەیەنێ کە شێخ جەلالی هاوڕێیان ماڵئاوایی لێیان کردووە،پاشان مردووەکە بەدەنگ دێنێ و دەڵێ:ئەمە ڕێگای هەموانەوهەمومان لای خودا بەیەك دەگەینەوە.

ئینجا دێ هەندێ ستایشی دەکاو ڕوونی دەکاتەوە کەلەڕووی بنەچەوزانستەوە بێ چوونەوە هەموو سیفەتێکی کەماڵی مرۆڤی هەبووە.

# شیوەن بۆ مەلا جەلالی[1] تریپسیپان[2]

ئەی بادی سەبا هەستە وەکیل بە لەسەلامان
یاران بەخەبەر بینە کە عاجز بووە شامان[3]

بابێن هەموو بۆخزمەتی ئەوشۆ بەکۆمەڵ
عەزمی سەفەری کردووە گیرنابی لەلامان

قوربان ئەتوو ئەوتەرزمیەنی، ئەگری تکای کەس
ئێــمە هەموو هاتوینە، دەبی بگری تکـــامان

فەرمووی ئەمە ڕێگایەکە تەنیا نییە بۆ من
من نیمرۆ دەچم، ئێوە سبەی دێن بەدوامان[4]

بۆ فیرقەتی دووڕۆژی مەبن عاجزوغەمگین
وەسڵی ئەبەدیمان هەیە لای زاتی خودامان[5]

---

(١) مەلا شێخ جەلال:کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ مستەفا کوڕی شێخ حوسێنی (کانی کوردە)یە لە قەزای کۆیە،لە ١٢٩٧ك لەدایکبووە و لە ١٩٤٥ع وەفاتی کردووە. مەلای گوندی ترپەسیپان بووە وپایەکی زانستی بەرزی هەبووەوزۆر مەلای گەورەی وەکو (مەلا عومەری لۆمەر گونبەدی ومەلا محەمەدی چروستانی ومەلا خەلیلی موخلیس و.....)لایان خوێندووە.
ئەم زانیاریەم لە مەلا جەوادی کوڕی وەرگرت.

(٢) ترپەسیپان: گوندێکە لەخوارووی هەولێروسەر بەناحیەی قوشتەپەیەو ٢٤ کم لە هەولێرەوە دوورە.
ئەم شیعرە لەبەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوومە: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن.

(٣) شامان: شای ئێمە، مەبەستی شێخ جەلالە.

(٤) ئیشارەتە بەم فەرموودەیە ((سلام لله علیکم دارقوم مؤمنین وأن انشاء لله بکم لاحقون))دلیل الفالحین،محمد بن علان الصدیقي الشافعي،القاهرة ١٩٢٨ ص٩.

(٥) واتا: ئەوەی ماوە هەر دوو ڕۆژی دیکە دەژی و ئەویش کۆچباری تێکدەنێ،شاعیر ژیانی دونیای بە دوو ڕۆژ داناوە((دونیا پێنج و دوو ڕۆژێکە دەڕوا)) پەندی کوردی، عومەر شێخەڵا، ل١٤٢.

پێی خۆشبوو لەپشتی نەبی چیدی لەبەری کا
ئەو خاکەکەوا داکەبەڕاست بۆ هەموو لامان[1]

ئەی دایکی حەقیقی دەبێ زۆر حورمەتی بگری
زاتێکی بە حورمەت بووە لای خاس و عەوامان[2]

ئەولادی عەلی و فاتیمەیە تاقە لەجێی خۆی
نابیتەوە تازە وەکو ئەو لە چ دامان[3]

گەر بێتو تەعەسوب نەبیءیا جەهلی بە قووەت
ئیقرار ئەکرێ تاج بوو لەبۆ شێخ ومەلامان

کێ غەیری ئەوی جامیعی ئەوساقی کەماله
نابیندرێءبا وانەبی قەت ئێمە تەمامان

زۆر عالیم و زۆر عامیل وزۆر فازیل و داهـــی
بۆ زوڵمەتی هەر مەجلیسەکی ئەو بوو چرامان[4]

بەحری کەرەم و عیلم و ویقار،کۆهی نەجابەت
ئەمری وی موتاع بوو لەهەموو شوێن و مەقامان[5]

دەستی کەدەکرد وا بەوەعزدان و نەسیحەت
بەحرێ بوو پڕی دوڕ بوو لەئەنواعی کەلامان

ناحەق نییە تاماوە جیهان تاری ببیتن
ئاوابووە بەیەکجاری ئەوا ڕۆژی زیامان[6]

(داخل بە بهشت وابوو) لەتەئریخی وەدەر کەوت
واهاتووە بۆ (موخلیس)ی بێ هۆش و هومامان[7]

---

(١) واتا: ئەو خاکە کەوا دایکی هەموومانە حەزی نەکرد (مەلا شێخ جەلال) لەسەر پشتی بژی و خستیە باوەشی خۆیەوە تا باش بحەسێتەوە.

(٢) خاس: شێخ ومەلایەکان. عەوام: خەڵکی نەخوێندەوار.

(٣) واتا: سەیدەو ئەو زاتەکان لە کیس چوو، تازە چ دایکێك وەکو ئەوی نابێتەوە.

(٤) داهی: ناوی بکەرە، واتا لێزان.

(٥) کۆه: کێو. نەجابەت: بەڕێزی. موتاع: بە گوێکراو. مەقام: پایە.

(٦) ڕۆژی زیامان: زیا: چیاو، واتا ڕووناکی.

(٧) هوما: باڵندەیەکی ئەفسانەییە، گوایە لەسەر سەری هەرکەسێك بنیشێتەوە دەبێتە پاشا، لێرەمەبەست ژیروهۆشە، هەروەها ڕستەی (داخل بە بهشت وابوو) بەحیسابی ئەبجەدی دەکاتە ١٣٥٩ك/١٩٤٠ع کە ساڵی مردنی ئەو بەڕێزەیە.

# شیوەن بۆ ئەبوبەکری کوڕی مەلا محمەدی فەرهادی[1]

ئەی تازە گوڵی باغی ئەمەل بۆچی وەهـا زوو
ڕۆیشتی بەجێت هێشت لەبۆ ئێمە کەسەروسوو[2]

گەنجیم سەمەرێکی نەبوو پیریم بەسەرا هات
ئاگام چ لەپیری نەبوو ڕۆڵەم لەهەوای توو[3]

---

(١) ئەم شیعرە لەبەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوومە: مفعول مفاعیل مفاعیلن فعولن.

موخلیس لەسەر داوای باوکی جوانەمەرگ ئەم شیوەنەی هۆنیوەتەوە و بەناوی ئەوەوە کوڕەکەی دەلاوێنێتەوە.

موخلیس لەم قەسیدەیەدا چووەتە ناخی دەروونی باوکی ئەبوبەکرو گەر کوڕی خۆیشی بمردبایە باوەڕناکەم لەمەی زێتر بۆ بهاتبایە. ئەم بەناخدا چوونە بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەباوکی ئەبوو بەکر هاوڕێی موخلیس بووەو کوڕەکەی خۆشویستووە و مەرگی ناوەختی کوڕەکەی دەروونی جۆشداوە و کۆمەڵێ ووشەو دەستەواژەو رستەی ناسکی بۆ هەڵبژاردووەو لاواندویەتیەوە.

هەر لەسەرەتادا تاکو کۆتایی بەناوی باوکی دەدوێ و کۆمەڵێ وێنەی شیعری ناسکی نەخشاندووەو لەیەکەم هەنگاو کردویەتیە گوڵی تازەی باخی هیوای خۆی و ماری ئەجەل هاتوو ئەنجن ئەنجنی کردووەو ئاخ و هەناسەی وەك دوکەڵی شینەو فرمێسکی چاوی سولاوکەیەو پشتی چەوگان ئاسایە ..... ئەم هەموو ووشە ناسکانە لەدەروونێکی بێگەرد و مشت خۆشەویستی نەبێ نایێتە دەرەوە.موخلیس لەم شیوەنەدا سنوری شەریعەتی نەبەزاندووە و هێندە ڕێشمەی خامەکەی شل نەکردووە و لەکۆتاییدا ڕەزامەندی باوکی دەردەبڕێ بەرامبەر بەو موسیبە تەو نایەوێ خۆی بێ پاداشتی خوایی بکات،چونکە کوڕەکەی لەدەست چووە با پاداشتەکەی لەدەست نەچێت،ئەمەش بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ص) دەگەڕێتەوە کەلەکاتی مردنی ئیبراهیمی کوڕی فەرمووی ((ان العین لتدمع وان القلب لیحزن وأنا علی فراقك یا ابراهیم محزونون ولانقول مما یغضب الرب)) واتا:چاو فرمێسك دەڕێژێ ودڵ غەمبار دەبێ ئەی ئیبراهیم لەبەر کۆچت زویرین و هیچ شتێ ناڵێین کەخودا پێی ناخۆشبێت.

(٢) کەسەروسوو: خەم وخەفەت.

(٣) لەنێوان (گەنجی وپیری)دا دژیەك هەیە.

چەندبەینە ئەمن مونتەزیری فەسڵی بووارم
گۆیا بگەڕێم لەو دەرودەشتانە بەهەرسوو[1]
کاتێ لەسیاحەت دەگەڕام دەنگی قەزا هات
بابەسبێ سیاحەت کە بوواری توو بەسەرچوو
توومەز کە ئەبوبەکری منە ماری ئەجەل دێ
دەی هەنجنێ یەك دەفعە لەسەر تاوەکو ئەستۆ[2]
ئەی وای چبوو هێنای بەسەرم تالعی ئەحسەم
شادیم بووە غەم مەجلیسی بەزمم بووە ڕۆڕۆ
باراندی فەلەك بۆمنی بێچارە موسیبەت
دەورەی منی گرت میحنەت و ئەندۆهـ وەکو ئۆردوو
دێتە دەرێ وەك دوکەڵی شین ئاهـ و هەناسەم
دێتن لەهەناوم کە پڕی ئاگـــرە بۆن سۆ
تك تك نییە گریەم وکو سولاوکەیە چــــاوم
پشتم وەکو چەوگان وەیە دەستم کەتە ئەژنۆ[3]
ڕووناکی دووچاوان و کزەی جەرگ و هەناوم
دڵ وارسی یەعقوبە کەوا یوسفی ونبـــــوو
تێرم ئەدی ئەو شتڵە ئەمامی قەدی بەرزت
ئەو ڕوومەتەکانی دەبریسکان وەکو پشکوو
هەرچەندە دەکەم ناچی خەیاڵی لە خەیاڵم
وای چەندە جوان بوو کە دەڕۆیی وەکو ئاهوو

---

(١) بووار: بەهار. شاعیر لەهەموو شیعرەکانیدا لەجیاتی (بەهار)ووشەی (بووار) بەکاردەهێنێ کە وشەیەکی کوردەوارییە. سوو: لا، شوێن.
(٢) موخلیس لەچوار بەیتدا سەروای گۆڕیوەو لە واو درێژبوتەوە بۆ (ۆ).
(٣) تك تك نیە گریەم: لەئەسڵدا بەمجۆرەیە (فرمێسکی گریەم تك تك نییە)،بەڵام لەبەر کێش (فرمێسك) لابراوە،یاخود بەئەنقەست وایکردووە تاکو بە قەرینەی (گریە)ەوە (فرمێسك) بێتە بەرچاومان.

ئەی ڕۆڵە ولاشت هەموو بۆ مەدرەسە ڕۆییـــــن
هەستە وەرە دەر بۆچی درێژ بووی وەکو نوستوو[1]

ئەسبابی تەرەقیت قەڵەم و دەفتەرو ئەشیـا
پەژموردەو و شێواینە لەپاش خاوەنی خۆشخوو[2]

چاوێکی هەڵێنە لە من و دایکی زەعیفـت
بنواڕە چ زەردین و چ باریك وەك یەك موو[3]

دوو بولبولی یەك تاقە گوڵی تاق و جوانی
نابین لە چریکەو لە سەناخوانی چ ماندوو[4]

ئەو مامە جوانانەی کە شێوای غەمی تۆنە
شنگیان لەبەدەن دا نییە بێهۆش وەك مردوو

ئەو تاقمە مومتازە لەمەکتەب کە رەفیقن
وەستاینە لەسەر قەبروجەنازەت لەبەیانوو[5]

تەکلیف بکە بابچنەوە بۆ مەنزلی خۆیـــان
چونکە بە ئومێدن کە هەموو نەچنەوە بێ توو

بۆ ڕۆیی بەتەنیا و منت هێشتەوە تەنیـا
کەی وەعدە لەبەینی من و توو ڕۆڵە وەها بوو[6]

من پیروزەعیف بووم لەبۆ ئەو ڕێگەیە چا بووم
تۆ گەنج و جوان بووی چ دەمی ئەو سەفەرەت بوو

---

(١) **ولاش**: هاوڕێ.
(٢) **تەرەقی**: پێشکەوتن. **پەژموردە**: سیس وژاکاو.
(٣) لەنێوان (زەردی و باریکی و موو)دا لێکچواندنی سادە هەیە.
(٤) لەنێوان (تاق و تاق) دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٥) لەبەر سەروا (بەیانی) بوکە (بەیانو).
(٦) لەبەر کێش لەجیاتی (ڕۆیشتی) نوسیویەتی (ڕۆیی)کەلەڕوی زمانییەوە ناشێت و جۆرە دەستکاریکردنێکی زمانییە.

ئەی خاکی وەتەن زۆر لەگەڵی مەرحەمەتت بێ
ئەو چونکە لەمەیدان بوو سەری هەردەمە بۆ توو

مەمنوون و ڕەزامە بەتەمای ئەجروسەوابم
یاڕەب نەچی ئەولایە لەکیسم کە ئەوم چوو[1]

تەئریخی بووە (فوري قضا لێ بوة میـــوان)
موخلیس کە شەریکی غەمە بۆی هێندە پەیابوو[2]

(١) ئیشارەتە بۆ ئایەتی ((ولنبلونكم بشيء من الخوف و الجوع ونقص من الأموال والأنفس والثمرات وبشر الصابرين،الذين اذا أصابتهم مصيبة قالو انا لله وانا اليه راجعون))البقرة /١٥٥-١٥٦.

(٢) ئەم ڕستەیە (فوری قچا لێ بوە میوان) بە حیسابی ئەبجەدی مێژووی مردنی بەدیار دەخات کە دەکاتە ١٣٦٧ك/١٩٤٧ ع.

# شیعری ستایش

ستایش یەکێکە لەبابەتەکانی شیعری لیریکی و بریتیە لەستایش و وەسفکردنی یەکێکی پایەگەورە،جا چ لەڕووی ئاینیەوە بێ یا زانستی یا کۆمەڵایەتی یا سیاسی.

موخلیس لە شیعرەکانیدا چەند نمونەیەکی شیعری ستایشی هەیەویەکێک لەوانە غەزەلێکە کە شتایشی کاك ئەحمەدی شێخی کردووە کە ڕابەری تەریقەتی قادری بووەوکوڕی شێخ مارفی نۆدەییە.

شاعیر لەیەکەم بەیتدا دەیکاتە شوێنی دابەزینی نوری خودایی ودەرکەوتنی ڕۆژی ڕێنماییکردن و ڕێپیشاندەری موریدانی ڕێبازی قادری و ڕووگەی هیواوئاواتی خەڵك و گەنجینەی حیکمەت وغەوسی زەمان.

# کاك ئەحمەدی شێخ[1]

مەهبەتی نووری ئیلاهی پێشەوایی عاریفان
مەتلەعی ڕۆژی هیدایەت، ڕەهنەمایی سالیکان[2]

قیبلەی ئامالی خەڵك و کەعبەی حاجاتی گـــەل
مەزهەری ئەلتاف و گەنزی حیکمەت و غەوسی زەمان[3]

هەروکو کیبریتی ئەحمەر بوو وجودت بۆ ئەنام
مەرقەدت ئێستا مەزارە بۆ عمومی ئینس وجان[4]

---

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسوورە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان.
"کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدەیە لە ١٢٠٨ك/١٧٩٣ ع لەدایکبووە و لە ١٣٠٥ك/١٨٨٧ ع مردووە. لەخزمەتی باوکی خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لەپاش مردنی باوکی دەرسی وتوتەوەو ئیرشادیشی کردووە. بنەماڵەی زانیاران مەلاعبدلکریمی مودەڕیس ، ل٣٠٥.

(٢) مەهبەت: ناوی شوێنە واتا شوێنی هاتنە خوارەوە.
عاریف: دانا، خواناس، شارەزا لە ڕەمزو وردەکاریەکان، ئەوەی کە خودا ئەوی گەیاندوتە پایەی دڵبینی خود و ناوروسیفەتەکانی، لەم مەقامەش لەڕێگەی حاڵی کەشفەوە بۆی پەیدا دەبێ نەك زانستی موجەڕەدوناسینی حاڵ.
فرهنگ اصطلاعات عرفاني ابن عربي،ص٥٠٧.
مەتلەع: ناوی شوێنەواتا شوێنی بەدەرکەوتن.
ڕەهنەما: ڕێنیشاندەر
واتا: کاك ئەحمەدی شێخ شوێنی دەرکەوتنی نووری خوایە و پێشەوای عاریفەکانی خوایە و (عاریف لە پلەوپایە زۆر لە سۆفی بەرزترە چونکە نووری خوا چوکە دڵەوە وڕووناکی کردوتەوە) ڕابەری موریدانی ڕێبازی قادریەوبەئاسانی دەیانگەیەنێتە قوتاغی خۆیان.

(٣) ئامال: کۆی (أمل)ە، واتا: هیواکان. ئەلطاف: کۆی (لطف)ە، واتا: نەرمی ونیانی.
غەوسی زەمان: بەهانا هاتووی سەردەم، ئاماژەیە بە شێخ عبدلقادری گەیلانی.
غەوس: لای ڕێبوارانی سۆفیگەری بریتیە لە قوتب وپەناگەی مرۆڤ کە لەوەلییەکانی خودان.
فرهنگ اصطلاعات عرفاني /سيد جعفر سجادي، ص٦١٠.

(٤) کیبریتی ئەحمەر: گۆگردی سوور، درکەیە لەبێ وێنەیی و نایابی.
ئەنام: خەڵك/ ئینس: مرۆڤ/جان: جنۆکە،ئەمەچێز.

هاتنـــم بۆ دیتنی شاری سلێمانی نییـــــــه

جەلبی کردوومە مەحەببەت بۆ حزوور شاهی جیهان[1]

باب وباپیرم کەوا حەلقەی بەگۆشی تۆ بوون

هەروەکو هەوری بەهار باریوە لوتفت بۆ ئەوان

یەك لە مامانم کە مەشهوورە لەتەحسیلی علوم

هیممەتی تۆ بوو خودا کردیە (مشاری بالبنان)[2]

ئاخری چونکە لەگەڵ ئێوە وەفاداری نەکـــــرد

ڕۆیی‌هەوتا بووبە دیدار عەزرەتی خزم و کەسان

ئـــــەو وەزیفەی تۆ بەوانت داوە بۆ ئەو هاتووم

چونکە میراتی چ کەس نادرێ بەغەیری واریسان[3]

بابفەوتێم گەر منیش لامدا لەسەر ڕێگەی وەفا

بابڵێن ئەوجا بەڕاستی تیرمێکی بێ وەفـــان

ئێمە مەشهووین بەکۆمەڵەی حەزرەتی کاك ئەحمەدی

مەحرەمم، مەمکە بە مەحرووم، هەروەکو نامەحرەمان[4]

تاکو ئیزنی وەرنەگرت (موخلیس) لە کاك ئەحمەد نەچوو

بۆ چ لایێ چاو بگێڕێتن لە شێـــخ و موڕشیـــــدان[5]

---

(١) مەحەببەت: خۆشەویستی، لێرە مەبەستی خۆشەویستی سۆفیانەیە کە سۆفی هەموو بوونی پێشکەشی شێخەکان بکات.

(٢) مشاری بالبنان: ئیدیەمێکی عەرەبیە، بەواتا: لەبەر گەورەیی ئاماژەی بۆدەکرا.

(٣) وادیارە باب وباپیروومامی موخلیس سەر بەڕێبازی قادری بوونەودەروێشی کاك ئەحمەدی شێخ بوونە، موخلیسیش خۆی بەیەکێ لەوانە دادەنێ و پێی وایە ئەو دەروێشیە بەمیرات بۆی ماوەتەوە.

(٤) مەحرەم: ئەندامی خێزان، پلەی یەکومی خزمایەتی/مەحرووم: بێ بەش.
لەنێوان (مەحرەم و مەحرووم)دا ڕەگەزدۆزی لاحیق هەیە، هەروەها دژیەکیش هەیە.

(٥) وادیارە موخلیس چوتە سەرگۆڕی کاك ئەحمەدونیزنی لێوەرگرتووە ئەویش ئیزنی داوە کە ڕێبازەکەی بگۆڕێ و بچێتەسەر ڕێبازی نەقشبەندی (ئیزن وەرگرتنەکەش دەبێ بەخەون بێ).

# دزەیی[١]

سەردەمێ خۆشبوو وولآتی دزەیی — خۆش حەیاتێ بوو حەیاتی دزەیی[٢]
نەبوو هیچ قەومێك لەنێزیك و لەدوور — نەگەییبا بە بەراتی دزەیـــــــی[٣]
دەبومە حفووز بێ سەرومالی کەسێ — بگەییبایە قەلآتی دزەیـــــــی
لە قەبیلەو (لە)[٤] عەشایر کەم و زۆر — نەبوو هەیبێ دەسەلآتی دزەیی
چ وجودێکی نەبوو لەشکری زۆر — لە بەرابەر بە غەباتی دزەیی[٥]
لەهەموو شۆڕوشەڕێ ناوی هەبوو — کەلەن و سەبرو سەباتی دزەیی[٦]
هەموو ڕۆژ،ڕۆژ وەکو شەو تاریك دەبوو — لە غوبـاری حەرەکاتی دزەیی[٧]
(موخلیسا)ئاخری تێکچوو چ نەما — بە خراپە و بە قەباتی دزەیی[٨]

---

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووفە: فاعلاتن فعلاتن فعلن.
هەروەها لەدەستنوسی (أ.ر) یە.
(٢) دزەیی: بریتیە لەدەشتی خوارووی هەولێر کەبە مولکیە بەناوبانگە و ئاغاکانی ئەو گوندانە پێی دەڵێن دزەیی و بەدەشتی خۆیانی دەزانن،سنورەکەشی گوندەکانی ناحیەی قوشتەپە دەگرێتەوە کە دەکەونە ڕۆژئاوای جادەی کەرکوك و هەتا سنوری زورگەزراو و ناحیەی (گوێر) دەڕوات.
(٣) بەرات: خێروبێر، ئاماژەیە بە پازدەی شەعبان.
(٤) لەدەستنوسی (أ.ر،خ.د) نوسراوە (لە قەبیلە و عەشایر)، وادیارە ئامرازی (لە)ی لێکەوتووە.
(٥) غەبات: خەبات، زبارە.
(٦) شۆڕوشەڕ: هەڵگەڕاوەی (شەڕوشۆڕ)ە، شاعیر بەمجۆرە بەکاری هێناوە و جوزە لادانێکەو پێویستی شیعری نییە./کەلەن:کەلێن.
(٧) شاعیر بەشێوەیێ وەسفی ئەو ناوچەیە دەکات کەزۆر قەرەباڵغەو هەمیشە لە بزاوتن و هاتن وچون دایە و داسەکنانی بۆ نییە، جا جوڵانەوەکان هەردوو لایەنی چاپوکی و شەڕەنگێزی دەگرێتەوە،شاعیر زیاتر مەبەستی شەڕەنگێزیە هەروەکو لەبەیتی کوتاییدا دەردەکەوێت.
(٨) قەبات: خراپەکاری. ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە ((وما کنا مهلکي القری الا واهلها ظالمون)) القصص/٥٩.
موخلیس لەم غەزەلەی ڕابردوودا ستایشی ناوچەی دزەیی (مولکیە) دەکات و باسی ئەو خێروبێرە دەکات کە لەسەردەمێکدا بەشی خۆی و بەشب دەورروبەری دەکرد.
هەروەها لەڕووی دەسەڵاتەوە ڕوونی دەکاتەوە کە لەوسەردەمەدا تاك بووە لەو دەورروبەرەو هەرکەسێ هانای بۆ ببردایە دەیپاراست و لەڕووی لەشکروهێزیشەوە سەرپشك بووە.
بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە پشتیان لەخودا کردو ڕوویان کردە خراپەکاری بۆیە خودا ئەو نیعمەتەی لێیان سەندەوەوهیچی لەدەست نەما ((ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیر ما بأنفسهم))الرعد/١١.

# شیعری داشۆرین

ئەم جۆرە شیعر لای گەلێ لە شاعیرە کۆنەکانمان بەدیدەکرێ و سەرقافڵەیان شێخ ڕەزایە. داشۆرین ئەو شیعرەیە کە شاعیر کەسێکی یا گروپێکی پێدەشکێنێ و کام ووشە تابۆوجەرگبڕەبەکاری دێنێ و موبالەغەی زۆر تێدایە.

لەکۆنەوە واباوە کە مەلاوشێخەکان دانوویان لەگەڵ یەك ناکوڵێ و دژی یەکن.بەڵام ئەم دژایەتیە گشتی نییە وبەتایبەتی ئەگەر شێخ خوێندوار و مەلا بێ ئەم ناکۆکیە بوونی نییە چونکە لەیەکدی دەگەن و هەردوکیان تەواوکەری یەکدین.

وادیارە (موخلیس) لەسەردەمی خۆی دڵی لەهەندێ شێخ ودروێشان ئێشاوەو کاری نابەجێی لێ دیون کە لەگەڵ شەریعەت ناگونجێن.بۆیە بەغەزەلێك هێرشیان دەکاتە سەر و بەخراپەکار ناویان دەبات.نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کەشاعیر خۆشی سەر بەتەریقەتە و سۆفی بووە بەڵام دوور نییە ئەم غەزەلە لەپێش بەسۆفی بوونی بووبێت.بەهەرحاڵ هەرچەندە (موخلیس) بەگشتی ناویان دێنێ بەڵام مەبەستی چەند کەسێکەوبەس، چونکە بنەماڵەی موخلیس بەگشتی سەر بەرێبازی قادری بوون و لەبەر ئەوە دژیان نەوستاوە کە شێخ ودەروێشن. لەگەڵ ئەمەش وامان بەچاك زانی کە شیعرەکە بڵاونەکەینەوە نەخۆ دڵی هەندێك بڕەنجێت.

# دوو بەیتیەکان

دوو بەیتی لەداهێنانی ئێرانیەکانە و یەکەم شاعیری کورد کە بۆ یەکەم جار دوو بەیتی نوسیبێ باباتاهیری هەمەدانییە ۱۰۰۰ع - ۱۰۵۸ع، لە ئەدەبیاتی گۆراندا دوو بەیتی کەمە و مەولەوی هەندێکی نوسیوە،لە کرمانجی ژووروش دوو بەیتی هێندە باو نەبووە لە کرمانجی خوارووش مەحوی ناوڕێکی لێداوەتەوە.

هەرچەندە لەئەدەبیاتی فارسیدا چوارینەو دوو بەیتی جودان و لەڕووی کێشەوە جیاوازیان هەیە. باباتاهیر دوو بەیتیەکانی لەسەر کێشی هەزەجی شەشی مەحزووف نوسیوەوخەیامیش لەسەر کێشی (لاحول ولا قوە الا باللە) چوارینەکانی داناوە.بەڵام لەلای کورد هەردوو بابەتی دووبەیتی و چوارینە تێکەڵ بووینە و هەر شاعیرێك بەپێی حەزی خۆی ناویان دێنێ.

موخلیس یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بەسەدان دووبەیتی نوسیوەوزۆربەی هەرەزۆریان لەسەر بابەتی کۆمەڵایەتییە،ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەشاعیر لە کۆمەڵگاکەی خۆی دانەبڕاوە و لەگەڵیان ژیاوەو زۆر بەووردی کەموکورتی و کێشە کۆمەڵایەتیەکانی دەستنیشان کردووەو زیانەکانی دەرخستووە.ئێستاش وا لەهەر بابەتێك چەند نمونەیەك دەخەینە بەردیدی خوێنەران.

## (۱) کۆمەڵایەتی

هەرکەسێکی عیلم و عەقڵ و فەزڵی بوو بابەری
کەس نییە ئەوڕۆکە بیناسیت و قەدری بگری[۱]

دین و دونیا کەتە دەست تەرزە کەسێکی وا ئەگەر
پێی بڵێی: کەر، کەر لەتاوان خۆی دەخاتە ئاگری

* * *

(۱) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە:فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن. موخلیس گلەیی لە ئەهلی دین و دونیایە، پێی وایە ئەوانەی کە کاروباری ئاینی و دەسەڵاتیان لەدەستە شایەنی ئەو جێگەیە نین و بە کەری داناون،بۆیە مرۆڤی خاوەن زانست و ژیروفەزڵ لەکۆمەڵگەدا نەناسراون و کەس رێزیان ناگرێت و بۆ مردن باشن.

پیٚ لەدەشت ساتمە لەخاك و خۆر دەکا
چاو لەشار ساتمە لەزەردوسۆر دەکـــا[1]

چاوەکەی ساتمەی دەکا باکی نییـــە
پێی ئەگەر ساتمە بکا،چاو شۆڕ دەکا[2]

* * *

ئەوکەسانەی دەگەڕێن بۆ چێشتی خۆش و لەقسان
بۆچی قەت شەقیان نەبرد و بۆچی جارێك نەپسان[3]

واعیزو سامیعی لاسار مونتەفیع نین بەوەعـــز
تیغ ئەگەر ئاسنی خراپ بوو نەفعی بۆنادا هەسان[4]

* * *

عیلم ومال و کەسك و ڕیش جیٚ ناگرن بیٚ عەمەل ئەسبابی چوونە ناگرن
هەرچی دەیبینی بەوانە ناز ئەکا وا دەزانـــن کەڵەشێرن نامـــرن[5]

* * *

---

(١) ئەم دوو بەیتە لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە:فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

خۆر: خوَل واتا:ئەوەی لەدەشتیٚ دەژی پێی ساتمە لە خوَل و کەستەك دەکات،بەڵام خەڵکی شار چاویان ساتمە لەجل وبەرگ و ڕەنگ ورووی سوورو زەرد دەکات.مەبەستی ئەوەی هەیە کەمرۆڤ لەدەشتیٚ هەر خوَل و بەردی دێتە پێش و لەشاریش مۆدێلی ڕەگاوڕەنگ.

(٢) واتا: هەرکە چاوی ساتمە لە ژنی جوانی ڕەنگاوڕەنگ دەکات باکی نییە و پێی ئاساییە چونکە باوەرەکەی کزە،بەڵام ئەگەر پێی ساتمە بکا ئەوا چاوی پیٚ شۆڕ دەبیٚ و بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە.کەچی لەڕاستیدا! حەقی ئەوەیە ئەگەر چاوی ساتمەی کرد وئەزەری کرد پێی ناخۆش بیٚ نەوەکو کە پێی ساتمە دەکات.

(٣) ئەم دووبەیتە لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

(٤) سامیع: گوێگر/تیغ: تیخ، چەقۆ، سیکارد، کەڵەغ، خەنجەر/هەسان: بەردێکە تیغی پیٚ تیژ دەکەن بەتایبەتی بۆ داس تیژکردن بەکاردێت.

واتا: ئەگەر وەعزدەروگوێگر لاسار بن ئەوا سوود لە ئامۆژگاریەکە وەرناگرن، واتا: هەردوکیان دەبیٚ لە ڕەچەڵەکدا باش بن، چونکە تیغ ئەگەر ئاسنەکەی کەڵکی نەبوو،هەر هەسانی لێبدە سودی نییە.ئاماژەیە بۆ ئەم بەیتەی (مەلای جزیری):هەر گل و سەنگ دەبتن زێر ب تەدبیری حەکیم قابیلییەت کونەبت حیکمەتی ئوستادی چ کت

دیوانی جزیری، سادق بەهائەدین، بەغدا ١٩٧٢، ل١٤٧.

پێچەوبەخشی ڕێك هەیە لەنێوان (چێشتی خۆش وقسان لەگەڵ شەق بردن و پسان) چێشتی خۆش بۆ شەق بردن، قسان بۆ پسان.

(٥) ئەم دوو بەیتە لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

کەڵەشێر: شێری گەورە/کەسك: مەبەست ئەو شاڵەیە کە سەیدەکان لەپشتی دەبەستن. بەیتی یەکەم ئاماژەیە بەم پەندە کوردیە(بە ڕیش نییە بە ئیشە). پەندی پێشینان، خاڵ، ل١١٣.

هەروەها ئاماژەیە بەم ئایەتە (یاأیهاالذین آمنوا لِمَ تقولون ما لاتفعلون کبرا مقتاً عند الله ان تقولوا مالاتفعلون)الصف/٢-٣.

**ئەو کەسەی تاکو دوێنێ دەگەڕا بەستەزمان**
**تۆقی زێڕی لەملی کردووە ئەمڕۆکە زەمان**
**غەم مەخۆ، پێبکەنە،عادەتی دەوران ئەمەیە**
**ڕوودەداتن بەکەسێ، دەنەچێ عەقڵی لە قەپان**[1]

★ ★ ★

**زۆر لەگەڵ یەکتر جوانن ڕووی سپی و موویی سپی**
**ئەو دووانە جوانترن یا مووی ڕەش و ڕوویی سپی**[2]
**ڕووی ڕەش ومووی ڕەش ئەگەرچی زۆر گرێتن پێکەوە**
**نابێ قەت بێنە تەرازووی ڕووی ڕەش و موویی سپی**[3]

---

(١) **لەم دووبەیتە لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
**بەستەزمان:** زمان بەستراو، بێ دەنگ، ئاژەڵ / **دەوران:** دونیا.
**واتا:** سامانی دونیا بەژیری وزانایی نییە،زۆر هەنە تادوێنێ نان نەبوو بیخۆن و مێشك بەتاڵ بوون،کەچی ئەمڕۆکە بوونەتە قارونی زەمان.
لەدوای ئەمە موخلیس دڵی خۆی دەداتەوەو بەخۆی دەڵێ: پێی ناوێ غەم بخۆی ،زەمانە ئەمە پیشەیەتی و هەمیشە پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە کە عەقڵیان بۆشەو لەقەپان دەرناچن.
ئەمەش ئاماژەیە بە بەیتە شیعرێکی (حافزی شیرازی) کە دەڵێ:
**اسپ تازی شده مجروح بزیر پالان**
**طوق زرین همه در گردن خر می بینم**
دیوان حافظ، علی بهائی شرفعلی، بمطبع محمدی بمبی/ص١٨٢.
**واتا:** پشتی ئەسپی ڕەسەن ڕێشدارە لەژێر کورتانی ئیش،ملوانکەی زێڕین لەگەردەنی کەر دەبینم.
(٢) **لەم دوو بەیتە لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
**ڕووی سپی:** دەم وچاوی سپی و جوان، ئاکاری جوان، لەخواترس.
**مووی سپی:** پیری بەساڵا چوویی.
**مووی ڕەش:** گەنجی، لاوی.
موخلیس لەم بەیتەدا بەراوردی دوو شت دەکات لەڕووی جوانیەوە، یەکەمیان بەراوردی پیرێکی لەخواترس دەکات کە ڕوویی و مووی هەردوکیان پاك وچاکن لەگەڵ گەنجێکی موو ڕەشی کارچاك وئینجا دەپرسێ: ئایا کامەیان جوانترن؟ بێگومان گەنجە ڕوو سپیە کارباشەکە جوانترە لەپیرێکی کارچاك،چونکە هەر لەگەنجیەوە لەگەڵ چاکە خەریکە.
(٣) **ڕووی ڕەش:** پیاوی خراپ، بەدکار، ناشیرن وپێست ڕەش.
**مووی ڕەش:** گەنجی، لاوی / **کریت:** عەیب و عار.
هەمیسان موخلیس دوو شتی دیکە بەراورد دەکاو بەڵام ئەمجارە وەڵامەکەشی داوەتەوەو دەڵێ: ئەگەرچی گەنجی موورەشی پێست ڕەش بەیەکەوە ناشیرنن و دیمەنێکی جوانیان نییە، بەڵام هەرگیز نایەنە تای تەرازووی پیاوێکی پێست ڕەشی پیری خراپەکار.
مەبەستی شاعیر ئەوەیە مرۆڤ تا گەنجە ئەگەر خراپەیەکیشی کرد ئەوا جۆرە بیانوویەکی هەیە، بەڵام پیری و بەدکاری کەس شەفاعەتی بۆ ناکات.

## ٢- سۆفیانە

**کە ساقی هات مەزەی هێنا، هەنارو خۆخ و بێی هێنا**

**شەرابێکی غەریبی دا، عەجایب مام لە کێی هێنـــا**

**موریدی پیری مەیخانەم، لەمن عاجز مەبە واعیـــز**

**کە وەعدەی کەوسەرت دامێ توو، پیر وا بەجێی هێنا**(١)

★ ★ ★

**شـــەوقی من گەرمی دیارە لە قسان ‌ ‌ ‌ سۆز دەخاتە مەجلیسی رووحانییان**

**عیشقی حەق گەر بخەنە ژێر مەنجەنیق ‌ ‌ ‌ دەبتە گوڵشەن مەنجەنیق بۆ قودسییان**(٢)

★ ★ ★

**دیتنی دۆست گەر لە جەننەت دانەبی**

**بۆ بەهەشت بۆ غەم بخۆم هەر بانەبی**

**ئاگری نەمروود لەگەڵ دۆست جەننەتە**

**دۆست کە بوو، دونیاو قیامەت بانەبی**(٣)

---

(١) **لەبەحری هەزەجی هەشتی تەواوە:** مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن، کێ: کوێ،
**ساقی:** مەیگێڕ، لێرە مەبەستی رابەری تەریقەتە.
**مورید:** ریبواری سۆفیانە / **پیر:** رابەری رێبازی سۆفیەتی. **مەیخانە:** لێرە مەبەستی خانەقایە چونکە نەقشبەندی بووە. کەوسەر: ئاوی کەوسەر ((انا اعطیناك الکوثر)) الکوثر/١.

(٢) **لەبەحری ڕەمەلی شەشی مەخروولە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
**شەوق:** تاسەو ئارەزوو/ **رووحانی:** عاشقی خوایی
**عیشقی حەق:** عیشقی خوایی / **مەنجەنیق:** ئامێرێکی کۆنی جەنگ بوو بۆ هاوێشتنی بەردو ئاگر بەکاردەهات. /**قودسی:** فریشتە، بێ گوناح
**واتا:** تاسەی من بۆ عەشقی خوایی هێندە گەرمە لە قسەکانم ڕا دیارە و کۆڕی خواپەرستانی حەق گەرم دەکاو سۆزی دەخاتێ. خۆ ئەگەر عەشقێ بێ پێچ و پەنا بێت، خاوەنەکەی گەر بشخەنە ناو ئاگرەوە بۆی دەبێتە گوڵزار، هەروەك حەزرەتی ئیبراهیممان خستە ناو ئاگرەوە و زیانی پێ نەگەیشت. ئاماژەیە بەم ئایەتە ((قلنا یا نار کونی بردا وسلاما علی ابراهیم)) الانبیاء/٦٩.

(٣) **لەبەحری رەمەلی شەشی مەخرولە:** فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

* * *

ئارەزووی یار و بوار و دەنگی خۆش و مەی دەکـــــەم

هەر وەکو دەروێش لە تاوان ڕۆژ و شەو حەی حەی دەکەم

سەرفی بەزمی مەجلیسی ڕەندان نەبی ماڵ بۆ چییە

عومرەکەم لەو ڕێگەیە وەك حاتەمی تەی تەی دەکەم[1]

* * *

وەرە ئەی شێخی پاك و عالی هیممەت

لەگەڵ ڕەندان دەمێ بدوێ بەحیکمەت

مەپرسە کەعبەو بتخانە ئەی شێخ

تەهارەت گەر نەبی ناگەی بە عیسمەت[2]

---

دۆست: لێرە مەبەستی خودایە / نەمروود: نەمروودی کوری کەنعانی کوری کووش کوری سام کوری نووحە، پاشای بابل بووە، (٤٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە و فەرمانی سووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیمی داوە.

قصص الانبیاء، ابو الفداء اسماعیل بن کثیر، ص١٤٢

موخایس لەم دوو بەیتەدا ئاماژە بەسووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم دەکات کە ئاگرەکەی بۆ بووە بەهەشت, چونکە یارمەتی خودای لەگەڵ بوو (( قلنا یا نار کونی بردا و سلاما علی ابراهیم)) الانبیاء/٦٩، هەر لەبەرئەمەشە شاعیر رای وایە ئەگەر لەبەهەشت خودا نەبینێ بەهەشتی ناوێ. لەم بارەیەوە (ملا پەریشان) دەڵێ:

یەك نەفەس وە ئەولەر ڕووبەڕوو بووم

کافرم ئەگەر جۆیای سینوو بلوم

تێکستی ئەدەبی کوردی، د. محمد نوری عارف، ل ٢٥٩.

(١) لەبەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

موخلیس لەم دوو بەیتەدا ئارەزوویەکی دەروێشانەی هەیە و کەژی بەهارە و حەزی لە ئاوازی خۆشە و شەو ڕۆژ لە حەی حەی دایە، واتا: لە یادکردنەوەی خودا دایە بەسەما و دەنگی دەف، کۆرەکەی پێ خۆشە چونکە کۆری ڕەندانە و چاو لە حاتەمی تەی دەکات، چۆن حاتەم هەمووماڵەکەی بەخشییەوە، ئەویش گلۆڵەی تەمەنی دەپێچێتەوەو هەمووی بە قوربانی بەزمی ئەو کۆرە دەروێشییە دەکات.

(٢) لە بەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.

ڕەند: کەسێکە کە هەموو مادیاتێك لە خۆی دوور دەخاتەوە و سەرفرازی هەموو جیهانە و پلەو پایەی هیچ خولقێنراوێك بەلا ناگات. فرهنگ و اصطلاحات عرفانی، د.سید جعفر سجادی، ص٤٢٥.

## ٣- ئایینی

گەر بزانم دەبمە سوڵتان، خدمەتی سوڵتان بکەم
نامەوێتن سەڵتەنەت، با خدمەتی قورئان بکـــەم
عەهدی من وایە لەگەڵ یار، لەو دەمی (قالوا بلى)
تا لەدونیادا بژیم، هەر مل کەچی فەرمان بکـــەم[1]

★ ★ ★

مینبەرو میحراب کە جێی پێغەمبەرن
جێی ئەوانەن لە سەفا بێ خەتـــەرن
حەیفە ئەورۆ کە ئیمام و خوتەبـــا
ریش تراشان و لە دین بێ خەبەرن[2]

---

حیکمەت: مەبەست لە حیکمەت لای سۆفیەکان وردبوونەوەیە لە هەموو شوێنەوارە خواییەکان تاکو شهوودی عیرفانیی کامڵ بەدەست دێت. فرهنگ اصطلاحات عرفاني، د.سيد جعفر سجادي، ص٣٢٦.

بتخانە: درکەیە لەجیهانی لاهووت, واتا: یەکێتیی گشتی، هەروەها بە واتای دەرکەوتنی خودی ئەحدیەتیش دێ. فرهنگ اصطلاحات عرفاني، ص١٨٥.

تەهارەت: پاکی و بێگەردی و، ئەمەش دوو بەشە: پاکی دیارو پاکی دڵ، چونکە بێ پاکی جەستە نوێژ دروست نابێ و بێ پاکی دڵ مەعریفەت دروست نابێت. فرهنگ اصطلاحات عرفاني، ص٥٥٨.

عیسمەت: قەدەغە، گەرانەوە، چاودێریکردنی نەفەس لە گوناه و تاوانکردن.

موخلیس لەم دوو بەیتەدا چووەتە ناو ناخی سۆفیگەریەوەو خۆی لە شتە رواڵەتیەکان دوور خستۆتەوەو داوا لە شێخ دەکات کە زۆر بەوردی و حیکمەتەوە لەگەڵ رەندانی رێگەی سۆفیگەری بدوێ و دڵی خۆی بە حیکمەتی خوایی پاك بکاتەوەو لەوە نەپرسێ ئەمە کەعبەیە یان بتخانەیە, چونکە ئەوەی توانی دڵی خۆی پاك بکاتەوە لە رێگەی پاکی جەستەوە ئەوا ئەو جۆرە پرسیارانەی نایەتە سەر زار و لە کەعبەو بتخانە ناپرسێت, چونکە هەمووی خوای لێ دەپەرسترێت.

(١) لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

یار: لێرە مەبەستی خوایە / قالوا بلى: ئاماژەیە بە ئایەتی ((واذ أخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم و اشهدهم على انفسهم قال: الست بربكم؟ قالوا بلى شهدنا)) الاعراف١٧٢.

واتا: هەر لەو دەمەی خودا کە گیانی هەموو ئادەمیزادی کۆکردەوەو لێی پرسین: من خواتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ خوای ئێمەی، پەیمانم لەگەڵ خودا داوە تا بژیم گوێرایەڵی فەرمانەکانی ئەو بم و لەژێر چاودێری قورئان دابم.

(٢) لە بەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

موخلیس پێ ی وایە مینبەرو میحراب شایانی هەموو کەسێك نیە چونکە جێگای پێغەمبەرەو (ص) زۆر حەیفە مەلایەکانی ئەمرۆ هەندێکیان بەپێ ی سونەتی پێغەمبەر (ص) هەڵس و کەوت ناکەن و ریشی خۆیان دەتاشن و وەك بڵێی هەر هیچیان

## ٤- دژایەتیکردنی نەفس

هەر کەسێ ئیعلانی حەربی کرد لەگەڵ نەفسی دەبی
ڕۆژو شەو ئاگای لەخۆ بیتن چ دەم غافڵ نەبـــــی
بـــێ موبالاتی لەگەڵ ئەو دوژمنە نابێ بکەی
دوژمنت بەس ئەو بی، نابی چیترت دوژمن هەبی[1]

* * *

قەت لەنەفسی خۆت ئەمین بوونت نەبی
لێی ئەمین بی شەرمەزاریت تووش دەبی
گەر بەنەفسی خۆت بوەستی کەس نییە
پێت بوەستیتن، ئەگەر شێر بەچە بی[2]

## ٥- ئیشتیمانی

بەرگی شادیم قەت لە قۆڵ هەڵنەکشا
دامەنی نازم لە عارد قەت نەخشـــا
من کە دەمرم غەمی گەورەم ئەوەیە
قەت نەگۆترا بەچە کوردێ بوو بە شا[3]

---

نەکردبێ وایە. ریش هێشتنەوە یەکێکە لە سونەتەکانی پێغەمبەر (ص) بەلاّم بەمەرجێ زۆر درێژ نەبێ و چەنگی لێ گیربێت بەسە.

(١) لە بەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
موخلیس جەنگی لەگەڵ نەفسی خۆی ئاشکراکردووە و پێمان رادەگەیەنێ کە نابێ لێ ی خافڵ بین و بێ موبالاتی لەگەڵ بکەین، چونکە ئەگەر نەفست دوژمنت بێ ئەوت بەسەو بەشی هەمووان دەکات، واتا: مرۆڤ گەر هەوڵی دا خۆی لە دوژمنایەتی کردنی نەفس پاراست ئەوا دوژمنەکانی دیکە سەربەخۆ نامێنن.

(٢) لە بەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
هەر کەسێ بەنەفسی خۆی بوەستێ واتە بە هەموو شتێ وەستاوە ئەگەر بەچکە شێریش بێت بەسەریدا زاڵ دەبیت.

(٣) لە بەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
بە پێی گوتەی مامۆستا ئیسماعیل عومەرِ سنجاوی ئەمە دوامین دوو بەیتی موخلیسە کە لە پێش مردنی دایناببێت.

## ٦- فەلسەفەی ژیان

**ئەجەل وەك قاوەیی سافە، فەلەك وەك قاوەچی وایە**
**عەجایب قاوەخانێکە، سەرای ئەو کۆنە دونیایـــــە**

**خەیاڵت وانەبێ (موخلیس) لە دەستی قاوەچی دەرچی**
**هەزار سوڵتان و شاهەنشای بەیەك فڕ قاوە قاو دایـــــە[1]**

---

لەم دوو بەیتەدا موخلیس دوورە لە شادی و دامەنی نازی لە خاك نەخشاوە و لەم ژیانە خەمی هەرە گەورەی لەوەدایە کەوا نەیبیستوە بڵێن: فلانە کورد بووە پاشاو سەرکردە.

موخلیس لە شوێنی دیکە گەشبینە و دەڵێ: (هەر بزانە ئالآیی کوردان هەڵکرا)، بەڵام لێرەدا رەشبینەو لە خەمی ئەوە دایە بەم خەمەوە سەر بنێتەوە.

(١) **لە بەحری هەزەجی هەشتی تەواوە:** مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن.

لەنێوان (ئەجەل و قاوە) دا لێکچواندنی بەرەلاّ هەیە , هەروەها لە نێوان (فەلەك و قاوەچی) دا،

لەبەرئەوەی قاوە تاڵە بۆیە ئەجەلی پێچوێنراوە، چونکە مردنیش تاڵە. لە نێوان (قاوە و قاو) دا رەگەز دۆزی ناتەواو هەیە.

# تاك بەیتی

تاك بەیتی بریتی یە لە بەیتێکی عەرووزی کە بابەتەکانی ئاینی و سۆفیانەو کۆمەڵایەتی و فەلسەفەی ژیان دەگرێتەوە . بابەتێکی کورتەو شاعیر لە چوارچێوەی تاکە بەیتێکدا دای دەرێژێ.

تاك بەیتیش لە ئەدەبیاتی کوردیدا کەمەو لە ئەدەبیاتی لوڕی نیەو لە ئەدەبیاتی گۆران پێش مەولەوی نەنوسراوەو مەولەوی گرنگی پێداوەو لە کرمانجی ژووروو جزیری و خانی نەیان نووسیوە لە ئەدەبیاتی کرمانجی خواروو هەندێ گرنگی پێدراوە.

موخلیس یەکێکە لەو شاعیرانەی کە زۆرترین تاك بەیتی نووسیوە و ژمارەیان بە سەدانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شاعیر لە ژیانیدا وورد بووەو هەرچی هاتبێتە پێشی فەرامۆشی نەکردووە و خستوویەتیە ناو چوارچێوەی تاکە بەیتەوە.

ئێستاش وا بە پێ ی بابەتەکانی تاك بەیتی لای موخلیس بۆ هەر یەکێ نموونەیەك یان زیاتر نیشان دەدەین:

## ١- کۆمەڵایەتی:

زۆرترین بابەتەکانی تاك بەیتی لای (موخلیس) بابەتی کۆمەڵایەتییە، ئەمەش ئەوە دەسەلێنێ کە شاعیر لەناو کۆمەڵگایەکەی خۆی ژیاوە و دوورە پەرێز نەبووە و ئاگاداری هەموو کون و قوژبنێکی بووە و هەر شتێکی هاتبێتە پێش بە تاك بەیتی دایرشتووە، ئەمەش چەند نموونەیەکە:

هێندە کەس هاوار دەکاتن من وەلیم

تۆ وەلی بی، کێ بلێ من کێوەلیم[1]

* * *

(١) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
ئەمە لە بابەتی رەخنەی کۆمەڵایەتی + ئاینییە. وا دیارە یەکێك خۆی بەوەلی زانیوە، شاعیر بە گاڵتەپێکردنەوە دەڵێ: گەر تۆ وەلی بی ئەی کێ کێوەلیە؟ لە کۆمەڵی کوردەواری کێوەلی بەبێ ئاین و ئابروو بەناوبانگن.

حەقیە دڵ بۆ پارە، پارە پارە بێ     هەر فڕەی بێ، پارە باسەر پارە بێ[1]

لەسەر دونیا نەکەی ئەزیەت بدەی کەس
نەوەك گەر بۆ بەهەشت چووی، پێت بڵێن: تەس[2]

* * *

ئەو کەسانەی ئومەران و عولەمان و خوتەبان
هەرچی ئەورۆکە لەوانە هەنە ئەغلەب کونەبان[3]

* * *

بچیە رێ ی حەج هێندە چۆلە شێت دەبی
بچیە رێ ی ناحەق بە زەحمەت جێت دەبی[4]

---

(١) لە بەحری شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
ئەم بەیتە مۆسیقایەکی نایابی هەیەو وشەی ( پارە ) پێنج جار دووبارە بوەتەوە و پارەی یەکەم دراوە پارەی دووەم و سێ یەم پارچە پارچەیەو پارەی چوارەم دراوە پارەی پێنجەم سەر پاڵەیە (سەرپاڵە ئەو کەسەیە کە لەکاتی دورنە کردن دەکەوێتە لای راستی پاڵەکان و لەبەرئەوەی لەوان نازاترە بە قەد نیو مەتر لەپێش ئەواندایە).
(٢) لەبەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.
موخلیس پێ ی وایە وشەی ( تەس) شایانی ئەو کەسانەیە کە ئازاری خەڵکی دەدەن، خودا لەمافی خۆی خۆش دەبێ بەلاّم لەمافی خەڵکی خۆش نابێ. لە کوردەواری وشەی (تەس) بە واتای (بکشێوە) دێت بەلاّم بۆ کەر و هێستر و ئەسپ و ماین بەکاردێت نەك بۆ مرۆڤ.
(٣) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
موخلیس رەخنە لە سێ توێژی بەرزی کۆمەڵگا دەگرێ کە زۆربەیان درۆ لەگەڵ جەماوەری رەش و رووت دەکەن، توێژی دەسەلاّتدار کە میرەکانن، توێژی خوێندەوار کە مەلا و مامۆستایەکانن، توێژی دواندەرەکان کە دواندەری ئاینی و رامیاری دەگرێتەوە.
(٤) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
شاعیر باسی واقیعی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی دەکات کە خەڵکی بەگشتی روویان لە رێ ی ناحەقەو قەرەپەستانەیە، بەلاّم رێ ی حەق چۆڵەو ئەوەی پێدا بڕوا سامگرتی دەبێ و ترسی لێ دەنیشێ.

## ٢- ئاینی:

هەتا نەرزی نەفس وەك (تۆ) لەژێر خاك
بەیا نابی لەوێ قەت خەسڵەتی چاك[1]

* * *

هەرچی نەفسی نەوسنی خۆی، کردە کابانی بەدەن
رۆژی خۆی نەعزایەکانی، لەعنەتی زۆر لێدەکەن[2]

* * *

کەس لەخوا چاکتر سەلەم ناداتەوە          کەم دەباتن بێ حیساب دەتداتەوە[3]

---

(١) ئەبەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.
موخلیس داوای شکاندنەوەو دارزانی نەفسی خۆی دەکات، چونکە تۆ گەر نەکەویتە ژێر خاك بەرهەمی نابێت، نەفس شکاندنیش کاری موسڵمانی لەخوا ترسەو سەرەتای ڕێبازی سۆفیانەیە.

(٢) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
موخلیس داوای ئەوە دەکات کە مرۆڤ نەفسی خۆی بگرێ و بەرەڵڵای نەکات، چونکە ئەگەر بەرەڵلا بکرێ دونیا بەشی ناکات و بەرەو حەرام دەچێ و لە ئەنجامدا دەچێتە دۆزەخەوە.

(٣) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.
موخلیس لەم بەیتەدا باسی سەودایەکی نێو کوردەواری دەکات ئەویش (سەلەم) ە، سەلەم ئەوەیە کە پێشتر پارە بەسەر شتێك وەربگری. بۆ نموونە جوتیارەکان لە زستان پارەیان نەدەما و دەچوون پارەی سەلەمیان بەسەر گەنم و جۆ دەهێناو لە هاوین دەیاندایەوە.
شاعیر هاتووە بەراوردی سەلەمی کردووە لە نێوان خەڵك و خودا، ئینجا ڕوونی دەکاتەوە کە خودا لە خەڵك زۆر چاکتر سەلەم دەداتەوە و هەر کارێکی خێر بکەیتە سەلەم لای خودا یەك بە دەیە ((من جاء بالحسنة فله عشرا مثالها)) الانعام /١٦٠.

## ٣- سۆفیانە:

لە خەرابات نییە جێ ی بێ ئەدەبان    ئەوی لێرەن هەموو شاهو ئودەبان[1]

* * *

ناگەیە سەڵتەنەتی جاهو جەلال    تا لە دڵ نێتە دەرێ جەنگ و جیدال[2]

## ٤- فەلسەفەی ژیان:

لەو دە خانووەی وا دەبینی کامە قەسرە، لەو دەیە

نامەوێ هەر کامەیێکی پێم ببەخشی لەو دەیە[3]

* ** *

ژیان مەعنای وەك نیسمی لەژان قەت نابی خالی بی

کەسێکی هاتە نێو دونیا، دەبێ غەمگینی حالی بی[4]

---

(١) لەبەحری هەزەجی شەشی مەحزووفە: مفاعیلن مفاعیلن فعولن.

خەرابات: کەلاوە، بریتیە لە خراپبوونی سیفەتەکانی مرۆڤ و لەناو چوونی بوونی جەستەیی. خەراباتی پیاوێکی کامڵە کە بەبێ ویستی خۆی زانینی خوایی لێ دەردەچێ. فرهنگ اصطلاعات عرفانی، ص٣٤٢

لەم بەیتەدا مەبەست لە خەرابات خانەقایە، چونکە هەروەکو موخلیس دەڵێ جێی شاهو ئەدیبەکانە.

(٢) لەبەحری رەمەلی شەشی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

جەلال: سیفەتی قەهرو قینی خواییە، سیفەتە نادیارەکانی خوا جەلالەو سیفەتە دیارەکانیش جەمالە.

هەر کەسێ لەبواری ئایینی و سۆفیەتی ئەگەر دەمەتەقێ لەدڵی دەرنەکات ناگاتە پایەی جەلالی خوایی، واتا: لە سیفەتە نادیارەکانی خودا ناگات.

(٣) لەبەحری رەمەلی هەشتی مەحزووفە: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

فەلسەفەی ژیانی شاعیر لەسەر قەنەعات بنیات نراوە و قەسری لەلا لەودەی کایە. لەم بەیتەدا یاری کردنێکی جوان بەوشەی (لەودە) کراوە، لەهەردووکیان بەدوو واتا لێك دەدرێتەوە، یەکەم: لەودەی کا، دووەم: لەودە خانووە.

(٤) لەبەحری هەزەجی هەشتی تەواوە: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن.

لەنێوان (خالی و حالی) رەگەزدۆزی موازیع هەیە. واتا: فەلسەفەی ژیان لەسەر خۆشی و ناخۆشی بنیات نراوەو ژان لە ژیان وەرگیراوەو هەرچی بژی لە ژان خاڵی نابێت.

# سەرچاوەکان

## عەرەبیەکان


١- الاتجاهات الادبية في العالم العربي الحديث، ط ٥، أنيس المقدسى، دار العلم للملايين، بيروت ١٩٧٣.

٢- الادب المقارن، د.عبدة عبود.

٣- الادب المقارن، د. محمد غنيمى هلال، القاهرة، ١٩٧٣.

٤- تأريخ السليمانية و أنحائها، محمد أمين زكى، ترجمة: جميل رؤذ بەیانی، بغداد ١٩٥١.

٥- التاج، الجامع للآصول فى أحاديث الرسول، الشيخ منصور على ناصيف، بيروت ١٩٧٥.

٦- ترجمان الاشواق، ابن عربي دار بيروت للطباعة والنشر، بيروت.

٧- التصويف الاسلامى، د. زكي مبارك، دار الجيل، بيروت.

٨- التعريفات، الجرجانى، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد ١٩٨٦.

٩- التفسير، د. محسن عبدالحميد و قحطان عبدالرحمن الدوري، بغداد ١٩٨٠.

١٠- حياة الحيوان الكبرى، كمال الدين الدميرى، دار الفكر، بيروت.

١١- دراسات في الادب المقارن الطبيقى، د.داود سلوم.

١٢- دليل الفالحين، محمد بن حلان، القاهرة ١٩٢٨

١٣- ديوان ابن عربى، دار الطباعة الباهرة ببولاق، مصر ١٢٧١ هـ.

١٤- ديوان ابوبكر الشبلي، د. كامل مصطفى الشيبي، بغداد ١٩٦٧.

١٥- ديوان الحلاج، ط ٢، د.كامل مصطفى الشيبي، ط١، بغداد ١٩٦٧.

١٦- ديوان الشافعي، محمد عفيف الزعبي، بيروت ١٩٧٤.

١٧- الشعر الصوفى، عدنان حسين العوادي، دار الرشيد للنشر، بغداد ١٩٧٩.

١٨- شعر الطبيعة في الادب العربي، د. سيد نوفل، مطبعة مصر القاهرة ١٩٤٥.

١٩- صحيح سنن ابن ماجة، محمد ناصرالدين الالباني، ط ١، بيروت ١٩٨٦.

٢٠- طبقات الاولياء، ابن الملقن سراج الدين المصرى. تحقيق: نورالدين شربية.

٢١- الطبيعة في الشعر العراقي الحديث، حسين عبود، رسالة الماجستير، كلية الاداب، جامعة البصرة ١٩٨٤.

٢٢- الطبيعة و ما بعد الطبيعة، يوسف كرم، دار المعارف، القاهرة ١٩٥٩.

٢٣- الطواسين، الحلاج، تحقيق: ماسينيون، باريس ١٩١٣.

٢٤- عشرة آلاف كلمة، الامام على، النجف، مطبعة الغري الحديثة.

٢٥- العقد الجوهرى في شرح ديوان الجزرى، ط٢، ملا احمد الزظنطى، مطبعة الصباح، ١٩٨٧.

٢٦- الفلسفة الصوفية في الاسلام، د. عبدالقادر محمود، دار الفكر العربى، ١٩٦٦.

٢٧- فيض القدير شرح الجامع الصغير، المناوى، ط١، مصر ١٩٣٨.

٢٨- لسان العرب، ابن منظور، دار لسان العرب، بيروت.

٢٩- محي الدين ابن عربي، عبدالعزيز سيد الاهل، ط ١، بيروت ١٩٧٠.

٣٠- مدخل الى التصوف الاسلامى، د.ابو الوفا التفتازانى.

٣١- المدخل الى الفلسفة، صدام الزيادى.

٣٢- المصحف المفسر، محمد فريد وجدى، مؤسسة دار الشعب، القاهرة .

٣٣- المعجم الادبي، صبور عبدالنور، بيروت ١٩٧٩.

٣٤- المعجم التركي العربي، عبدالطيف بندر أوغلو، ط١، بغداد ١٩٨٢.

٣٥- معجم مصطلحات الصوفية، ط١، د.عبدالمنعم الحنفى، بيروت ١٩٨٠.

٣٦- المعجم الفلسفي، ج ٢، د. جميل صليبا، دار الكتاب اللبناني ١٩٧٩.

٣٧- مقدمات في الشعر السومري، طراد الكبيسي، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧١.

٣٨- المنجد، منشورات دار المشرق، ط٢٧، بيروت ١٩٨٦.

٣٩- النجم الزاهر، نكتل يونس كشمولة، ط٢، الموصل ١٩٨٨.

## كورديەكان

١- ئەدەبى بەراوردكارى، د.عزيز گەردى، چاپخانەى كۆڕى زانيارى كورد، لە بەغدا١٩٧٨.

٢- ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، کامەران موکری، چ ١، هەولێر ١٩٨٤.

٣- بنەماڵەی زانیاران، مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، چاپخانەی شەفیق، بەغدا ١٩٨٤.

٤- پەندی پێشینان، شێخ محەمەدی خاڵ، چ ٢، بەغدا ١٩٧١.

٥- پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا ، کەریم شارەزا، چ ١، بەغدا ١٩٧٦.

٦- پەندی کوردی، عومەر شێخەڵلاّ، دار الحرية للطباعة، بغدا ١٩٨٠.

٧- تاریك و روون، هێمن، بەغدا ١٩٧٥.

٨- تەصەوف چیە؟ ئەمین شێخ علا ئەدین نەقشبەندی، بەغدا ١٩٨٥.

٩- تێکستی ئەدەبی کوردی، د.محەمەد نووری عارف، سلێمانی ١٩٨١ .

١٠- دیوانی ئەدەب، چ٢، گیوموکریانی، چاپخانەی هەولێر -١٩٦٦.

١١- دیوانی بێخود، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغدا ١٩٧٧.

١٢- دیوانی پیرەمێرد، محەمەد رەسوڵ هاوار، چاپخانەی عانی، بەغدا ١٩٧٠.

١٣- دیوانی جزیری، سادق بەهائەدین، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٧.

١٤- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردان حەمید میران و کەریم شارەزا، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٦.

١٥- دیوانی حەمدی، چاپی نامەخانەی گەلاوێژ، سلێمانی ١٩٥٧.

١٦- دیوانی سالم، چ٢، گیوی موکریانی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٢.

١٧- دیوانی شێخ رەزا، نۆفسێت، بەغدا ١٩٤٦.

١٨- دیوانی کوردی، چ ٢، گیوموکریانی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٢.

١٩- دیوانی کەمالی، دەزگای رۆشنبیری و بلاّوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٨٦.

٢٠- دیوانی گۆران، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا ١٩٨٠.

٢١- دیوانی مەلا وەسمان، د.ئەمین موتابچی، چاپخانەی ئاداب — نەجەف ١٩٧٣.

٢٢- دیوانی مەحوی، چ٢، مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، چاپخانەی نۆفسێتی حیسام، بەغدا ١٩٨٤.

٢٣- دیوانی نالی، مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

٢٤- ژیان و بەسەرهات و هۆنراوەی وەلی دێوانە، عوسمانی هەورامی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، چ ١، بەغدا ١٩٧٦.

٢٥- سەروا، عەزیز گەردی، ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٩.

٢٦- فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ١٩٧٦.

٢٧- فەرهەنگی کشتوکاڵ، مەعروف قەرەداغی، چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا ١٩٧٣.

٢٨- لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، د.مارف خەزنەدار، بەغدا ١٩٨٤.

٢٩- مەم و زین، چ ١، شرۆڤەکرن و ڤەکۆلینا: ئەمینێ ئوسمان، مطبعة الجاحظ - بغداد ١٩٩٠.

٣٠- مەولودنامەی کوردی، موخلیس، چاپخانەی هەولێر ١٩٨٦.

٣١- هەولێر، تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر، بەغدا ١٩٨٥.

## گۆڤارو رۆژنامە کوردیەکان

١- جەلال سنجاوی، مامۆستا مەلا خەلیل موخلیس وەڵامی چوار پرسیار ئەداتەوە، هاوکاری، ژمارە: ٢٣٢، ١٩٧٤.

٢- جەلال مەولوود ئەحمەد، شاعیری دەشتی قەراج مەلا خەلیل موخلیس، بەیان، ژمارە: ١١٢، ١٩٨٥.

٣- خالید جوتیار، مامۆستا خەلیل موخلیس کێیە؟ رۆشنبیری نوێ، ژ: ١٤، ١٩٧٤.

٤- سۆران مەحوی، واقی یان موخلیس، بەیان، ژمارە: ١٢٢، ١٩٨٦.

٥- عەبدول قادر دەباغی، دەمێکە، پاشکۆی عێراق، ژمارە: ٢٢، ٥٠ /١٩٨٨.

٦- عەلی فەتاح دزەیی، سێ گوڵ لەباغی لاوانەوە، کاروان، ژمارە: ٣٨، ١٩٨٥.

٧- گۆڤاری هەتاو، ژمارە: ٧١، ١٩٥٦.

٨- گیوموکریانی، هەتاو، ژمارە: ٤٦، ١٩٥٥.

٩- مەلا ئەنوەری مایی، موخلیس، هەتاو، ژمارە: ٤١، ١٩٥٥.

## گۆڤارە عەرەبیەکان


مجلة عالم الفكر، المجلد/ ١١، العدد/ ٢، سنة ١٩٨٠


## سەرچاوە فارسیەکان


١- تاريخ ادبيات ايران، د.رضا زاده شفق، تهران ١٩٤١.

٢- تاريخ تصوف در اسلام، د.قاسم غنبى، انتشارات زوار، ضاث طلشن، تهران ١٣٦٩هـ.

٣- ديوان حافظ، تيمور برهان ليمودهى، انتشارات كاويان.

٤- ديوان حافظ، على بهائى شر فعلى، بمطبع محمدى بمبي .

٥- رباعيات خيام، ازروى نسخة: محمد على فروغى

٦- فرهنط اصطلاحات عرفاني ابن عربي، ض٢، د.طل بابا سعيدى، تهران ١٣٨٤.

٧- فرهنط اصطلاحات و تعبيرات عرفانى، د.سيد جعفر سجادى، ضاث ضهارم، ضاث افست طلشن، تهران ١٣٧٨

٨- فرهنط فارسى عميد، حسن عميد، انتشارات امير كبير، تهران ١٣٦٢ هـ

٩- قواعد الفارسية، د. محمد تقى الزهتابي و د. حسين على محفوظ مطبعة الادابه النجف ١٩٧٣.

١٠- كليات سعدى، محمد على فروغى، انتشارات نشر طلوع.

١١- طلستان سعدى، محمد على فروغى، ضاث مهارت.